# تەوژمی فیکری سیاسی وەهابی

## خوێندنەوەیەکی شرۆڤەوانییە

نووسینی : احمد الكاتب
بەکوردی کردنی : زێیار عەزیزخان

2013 سۆران

# تەوژمی فیکری سیاسی وەهابی

## خوێندنەوەیەکی شرۆڤەکارییە

نوسینی: أحمد الكاتب

بەکوردی کردنی: زێبار عزیزخان

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٤٢٦٤)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێ دراوە

## پێشکەشە

بە برای زۆر خۆشەویست شەهید موحسین کە بەهۆی ستەمی ڕژێمی بەعس لە زیندانــدا ژیانی بەسەر برد، لەکاتێکدا خەونی دەبینی بە هەڵاتنی بەرەبەیانی ئازادیی، پێشکەشە بە برا شەهیدە خۆشەویستەکان فاضل و عەلی و عادل و مەحمود و..... ....

پێشکەشە بە گشت شەهید و تێکۆشەرو ئازادیخوازەکانی عێراق ئەوانەی کاریان کرد و کاریش دەکەن لە پێناو بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی ڕاستەقینەی دادپەروەر لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا.

نووسەر

## بەناوی خودای بەخشندەی دلۆڤان

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگار بە ئەندازەیەك وشە لە ئاستیدا لاوازو پێنووس لە بەردەمیدا لاڵ بێت، درودو سڵاویش برژێ بەسەر پێغەمبەر محمد ~ و خانەوادەو هاوەڵانی بێ ژمارە تا دوارۆژ. پاشان:

خوێنەری بەڕێز

بەلەبەرچاو گرتنی تایبەتمەندی و خاسیەتە زانستیەكانی لێكۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی ئەم بەرهەمە بەو تایبەتمەندییە زانستیانە، ئەوا بۆمان دەردەكەوێت كە ئەم بەرهەمە كتێبێكە شایەنی بایەخە، توێژینەوەیەكە دانەرەكەی خاوەن زانست و توانستێكی باڵایە و دەستێكی ڕەوان و بەهێزی هەیە لە نووسیندا.

شایەنی باسە كە ئەم كتێبە (فیكری سیاسی وەهابی) دانراوی (أحمد الكاتب) یەكەم بەرهەم نییە كە وەرگێڕ هەڵساوە بە بەكوردی كردنی، بەڵكو ئەمە دووەم بەرهەمە لەسەر وەهابی و فیكرەی وەهابیەت كە وەرگێڕ هەڵدەستێت بە وەرگێڕانی. بەرهەمی یەكەمم بەكوردی كردووە بریتیە لە كتێبی (بانگخوازەو پێغەمبەر نییە) دانراوی: (حەسەنی كوڕی فەرحانی مالكی) كە بەڕاستی كتێبێكی زۆر بەپێزە و دانەر تیایدا هەڵساوە بە سەلماندنی ئەوەی كە (تەكفیر) لە خودی كتێبەكانی شێخ موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب دا هەیە.

ئەم كتێبەی بەردەستیش لەگەڵ كتێبەكەی (حەسەنی كوڕی فەرحانی مالكی) بەیەكەوە زنجیرە توێژینەوەیەكی باشن بۆ ئەوەی خوێنەر ئاشنا بكەن

به زۆرێك له فیكرەو دیدو تێڕوانینەكانی وەهابیەكان و وەهابیەت.

جێگای ئاماژە پێدانه كه بەنده له بەكوردی كردنی ئەم كتێبەدا بەرپرس نییه له هیچ یەكێك له بیرو بۆچوونەكانی (دانەر) تەنها ئەوە نەبێت كه خۆم له پەراوێزدا ئاماژەم پێداوه[1].

سوپاسی هەموو ئەو كەسانەش دەكەم كه یارمەتیان داوم ئەگەر بەیەك پیتیش بێت، به تایبەت سوپاسی ئەم بەڕێزانه دەكەم: (م. ملا ڕەقیب ڕەسول ڕوستایی، د. ملا مادح بەرزێوەیی، م. انعام محمد تاهیر، م. زانای برازام، م. مهاجیر محمد تاهیر).

ئەگەر دوای هەڵەچنین و پێداچوونەوەو بڵاوكردنەوەی ئەم كتێبه بۆمان دەركەوت كه هەندێ هەڵه له بەكوردی كردنی دا هەیه، ئەوا دەبێت ئەوە بیهێنینەوە یادمان كه خوای گەورە ڕەتی كردۆتەوە هیچ كتێبێك پارێزراو بێت جگەله قورئانی پیرۆز. سوپاسی هەر كەسێكیش دەكەم كه به سەرنجه بەنرخەكانی و ڕەخنه دروستەكانی ئاشنام بكات، چونكه كەسێك خێری تێدا نییه، كه ڕەخنه قبوڵ نەكات، كەسێكیش ڕاستڕەو نییه، كه بێ وردبوونەوەو ڕامان پەل و پۆی ڕەخنەكانی به ئاسمان و ڕێسماندا پەرت كات و دونیای پێ بتەنێت، وەك ئەوەی ڕاستی تەنها له هەمبانه و كەشكۆڵی كەلەی ئەودا بێت. خودا بمان پارێزێت له دەمارگیری و شلڕەوی و توندڕەوەی، به میهری خۆی بمانخاته سەر ڕێگەی ڕاست.

زێبار عزیزخان

سۆران

---

(١) له وەرگێڕانی ئایەته پیرۆزەكانی قورئانی پیرۆز پشتم بەستووه به (تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان) دانراوی:(بورهان موحەمەدئەمین). هەر ئایەتێكیش ژمارەی دیاری نەكرابێت ئەوا به پێی مەسحەفی پیرۆز ژمارەم بۆ داناوه. (وەرگێڕ).

# پێشەکی

بێ گومان جیهانی ئیسلامی کرانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینی بەڕووی دیموکراسی لە سەدەی بیستەم دا. پەرلەمان دامەزرا و پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکان[1] ئەنجامدرا، تەنها دەوڵەتی عەرەبی سعودیی نەبێت، کە بەردەوامە لە پاراستنی سیستەمی گشتی ڕەها، کە لەمیانەیدا شای ئەو وڵاتە هەموو دەسەڵەتەکانی قۆرخ کردووە چ دەسەڵاتی یاسادانان (تشریعي) چ دەسەڵاتی جێبەجێ کردن (تنفيذي)، هەموو هەوڵێك پوکایەوە، کە هەوڵی پێشکەوتنی دیموکراسی دابێت، دەکرێ بۆ ئەو هەوڵە پوکاوانە چەندین هۆکار هەبن، بەڵام گرنگترینیان فیکری سیاسی وەهابییە کە دیموکراسی ڕەتدەکاتەوە. سەرباری ئەوەی کە پەیوەندی بزوتنەوەی وەهابیی بەبەردەوامی چاك نەبووە لەگەڵ سیستەمی دەوڵەتی سعودیی چونکە هەندێ دڵەڕاوکێ و ململانێ هەبووە کە دەرهاویشتەی هەندێ دەستەی وەهابی ڕادیکاڵ[2] بوو کە جارو بار داوایان دەکرد بە بڕینی سەری سیستەمی سعودیی،

---

(١) ڕاستتر بڵێین وڵاتە موسڵمان نشینەکان، چونکە سیستەمی حوکمیان ئیسلامی نییە.

(٢) مانای چەمکی ڕادیکاڵ (Radical)، (بەهەموو ئەو بزوتنەوەو بەرنامانە دەوترێت کە دەیانەوێ واقیعێکی دیاریکراو لە ڕیشەوە بگۆڕن، جاران (لیبراڵیش) ئەو مانایەی هەڵدەگرت بەڵام ئێستا ئەو توانایەی نەماوە، تەنها بەرنامە شمولیەکان ئەو ئەرکەیان پێ ئەنجام دەدرێ، یەکەم جار (جیمس نۆکس ١٧٩٧) بەکاری هێنا لە بەریتانیا، داوای چاکسازی قوڵی کرد بەڵام نەگاتە ڕاددەی

جگەلەمەش وەهابیەت لەناو قەیرانێکی فیکری سیاسی سەرسوڕهێن دەژیا، کە دوو دڵ بوون لەنێوان تەکفیرو دەرچوون لە دژی دەسەڵات یان خۆبەدەستەوەدان و نۆکەری کردن و مل شۆڕ کردن، لەو نێوانەدا گیریان خواردووە. ئەمەش هانی هەندێ تەیاری بزوتنەوەی وەهابی دا کە دژی سیستەمی دەوڵەتی سعودییە بوون وەك: ڕێکخراوی (ئەلقاعیدە) کە پشت دەبەستن بە چەند ستراتیژێکی جێگرەوە (بدیل)ی کرداری چاکسازی ناوەخۆیی، ئەمەش بە تۆڵەسەندنەوە لە دوژمنە دەرەکییەکان و تاوانبار کردنیان بەوەی ئەوان بەرپرسن لە دواکەوتنی بارودۆخی سیاسی لەناوەوەی سعودییە. جا لەو کاتەی کە ڕێکخراوی (ئەلقاعیدە) ڕەخنەی گرت لە بوونی هێزی سەربازی ئەمەریکی لە ناو شاری مەدینەو مەککەی پیرۆزدا، ئا لەو کاتە ڕێکخراوی ناوبراو هەموو تووڕەیی خۆی ئاراستەی "ئەمریکای داگیر کەر" کرد و هەڵسا بە پشت گوێ خستنی داواکانی سیستەمی سعودیی کە داوای پاراستنی خۆی دەکرد لەلایەن ئەمەریکا. لەجیاتی ئەوەی دەوڵەتی سعودییە داوا بکات بە وەدەرنانی هێزە بیانییەکان یان کار بکات لە پێناو گۆڕینی سیستەمی سیاسی یان هۆکارێك بدۆزێتەوە بۆ بەشداربوون لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی و گوشارخستنە سەر حکومەت لە پێناو جێبەجێ کردنی سیاسەتی شەرعی گونجاو لەگەڵ دینی تاك و پاك و بەرژەوەندی نیشتمانی... لە جیاتی هەموو ئەوانە خۆی بە پەشۆکاوی و ناچار بینی کە مل کەچ بکات لە

---

سۆشیالستی، ....نیتر تەشەنەی کرد). بگەڕێوە بۆ: (فەرهەنگی جودی، مەسعود عبدالخالق، ٧٢٤، چ ١، ٢٠٠٨، نوسینگەی تەفسیر). (وەرگێڕ).

ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنی دەرەکیی داگیر کارو گواستنەوەی بەرەی جەنگ بۆ ناو چەقیماڵەکەی.

پێویست بوو لەسەر سەرپەرشتیاری ڕێکخراوی (ئەلقاعیدە) (ئوسامە بن لادن[1]) کە حوکمی (کوفر) بەسەر سیستەمی سعودییە بدات بە ئەندازەیەك کە وای کرد دەربچێت دژ بەو سیستەمە، چونکە هیچ ڕێگەیەکی ئەدۆزییەوە بۆ ئەوەی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی ئاشتی خوازی ئەتەوەیی بێنێتە کایە، چونکە سیستەمەکە هەموو دەرگاکانی داخست بەڕووی ئۆپۆزیسیۆن و دژەڕاکانی و گۆڕانکاری. بانگەوازی وەهابی ئەیتوانی هەڵبستێت بە دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراسی یان ئەنجومەنی ڕاوێژ تا لەمیانەیدا هەم بانگەوازی وەهابیەت و هەم ئەوانەی تریش بتوانن ڕاوبۆچوونی خۆی بە ڕاشکاوی دەربېڕێت و سیستەمی دەسەڵاتدار لە سعودییە ناچار بکرێت بە جێبەجێ کردنی حوکمە شەرعییەکان یان ملکەچ بێت بۆ ویستی خەڵکی و ڕای گشتی وڵات، چونکە سیستەمی دەوڵەت لە بنەچەدا بڕوای نەبوو بە دیموکراسی یان سیستەمەکە ڕێگەی دیموکراسی بە دوور دەزانی لە ژێر سایەو باڵی (فیکرەی سیاسی وەهابی) کە وڵاتی بەڕێوە دەبرد.

---

(١) ناوی (ئوسامەی کوڕی محمدی کوڕی عەوزی بن لادن)ە، لە بەرواری ١٠/٣/ ١٩٥٧ز لە شاری (ڕیاز _ سعودییە) لە دایکبووە، دامەزرێنەری ڕێکخراوی قاعیدەیە، بەرپرسی زۆربەی ئەو هێرشانەیە کە ڕێکخراوەکە پێی هەڵساوەو بەتایبەت هێرشەکەی یازدەی سێبتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ بۆ سەر تاوەری جیهانی بازرگانی لە شاری نیۆیۆرك، لە ساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠١١ دیارترین داواکراوی (ئێف بی ئای) ئەمریکی بوو. (ئوسامە) لە وڵاتی (پاکستان) لە بەرواری ٢٠١١/٥/٢ز لەلایەن هێزێکی چەکداری تایبەتی ئەمریکیەوە کوژرا. (وەرگێڕ).

ئا لێرەدا بە ڕوونی بەدەردەکەوێت کە قەیرانەکە سەرەتا قەیرانێکی فیکری سیاسییە لەناو سعودییە، بەشێوەیەك کە ئوسامە بن لادن و پشتیوانانی _ لەلایەك _ سیستەمی دەوڵەتی سعودییان "بە هەڵگەڕاوەو بێ باوەڕ دانا، چونکە پێچەوانەی گرنگترین بنەمایە لە بنەماکانی یەکتاناسی و ئەو سیستەمە گەورەترین هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان جێبەجێ دەکات کە پشتیوانی کردن و خۆشویستنی بێ باوەڕانە". لەلایەکی تر سیستەمی دەوڵەتی سعودییەو پشتیوانانی لە گەورە پیاوانی ئایین (ئوسامە بن لادن) و شوێنکەوتووانی بە "خەواریج و یاخی" وەسف کرد. لە نێوان ئەو دوو دەستەو ئاراستەیە زمانی گفتوگۆو هۆکارێك بۆ لێکگەیشتن نەبوو، ئەمەش لە ژێر سایەی نەبوونی ژیانی سیاسی سروشتی لە ناو وڵاتی سعودییەی عەرەبی و نەبوونی ئەنجومەنی ڕاوێژی هەڵبژێردراو یان نەبوونی حزبی سیاسی یاخود ڕۆژنامەی ئازاد، هەر ئەمەش بوونە پاڵنەر و تەنانەت پاڵ بەهەر کەسێکەوە دەنێت کە دژی سیستەم و یاخی و سەرکەش بێت و ڕژێم و کاربەدەستان بەتەواوی تەکفیر بکەن.

سەرباری بەهێزی ئەو لێك ترازانەی کە ئۆپۆزیسیۆنە ڕادیکاڵەکە[1] پێی هەڵسا، بەڵام نەیتوانی بەو ڕۆڵەی خۆی کە گێڕای سیستەمێکی سیاسی جێگرەوە پێشکەش بکات کە جێگرەوەی ئەو سیستەمە خۆسەپێنەرە ڕەهایە بێت کە هەیە، لە هەمان کاتدا لایەنە ئۆپۆزیسیۆنەکان بانگەشەیان نەکرد بۆ دیموکراسی یان بەژدار پێکردنی ئوممەت لە ژیانی سیاسی یان دروست کردنی چەند ڕێ و شوێنێکی دەستووری بۆ ئەوەی ڕای جیاواز تێدا دەر ببڕدرێت.

---

(١) پێشتر پێناسەی ئەم چەمکەمان کرد. (وەرگێڕ).

سەرەڕای ئەوەی سیستەمی سعودیی لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا پەیمانی زۆری دا بە هێنانە کایەی شێوازێ لە دیموکراسی و ئەنجومەنی ڕاوێژ، بەڵام ئەو پەیمانانە لە واقیعدا بەرهەست نەبوون یان نەکران بە دامەزراوەی دەستووری، ئەمەش تەنها بەهۆی خاوەن دەسەڵات نەبوو لەوەی حەزی لە حوکمی ڕەهایی خۆسەپێن بێت و بەس، بەڵکو بەهۆی نەبوونی فیکری ڕاوێژ و دژایەتی کردنی دیموکراسی لەلایەن فیکری وەهابی چونکە بە دینێکی بێ باوەڕی ڕۆژئاوا و بە کوفری پێچەوانەی دینی ئیسلامی دادەنێت و هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا دادەنێت و بە هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی یەکتاناسی هەژماری دەکات، سەرباری ترسان لە تێکڕایی دانیشتووان و گومان هەبوون لە دینیان و تاوانبار کردنیان بە هاوبەشدانان بۆ خوا و لادان لە ئیسلام و سەرکەش بوون و لاساری و تاوانکاری.

بە تێکۆشان لە پێناو چارەسەر کردنی ئەو قەیرانە بە پێویستم زانی کە لێکۆڵینەوەو شرۆڤەی (فیکری سیاسی وەهابی)، بەتایبەتی قوڵ بوونەوە لە تیۆری "یەکتاناسی" کە (شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) خستیەوە بەرباس و خواس، لەژێر ڕۆشنایی ئەو تیۆرە بزوتنەوە ناسراوەکەی دامەزراند، کە سیستەم و ڕژێمی سعودیی دەرهاویشتەیەتی لە سێ قۆناغی ڕابردوو، لە ماوەی سێ سەدەی ڕابردوو.

دیاردەی دیکتاتۆری و خۆسەپاندن بوونی هەیە لە گشت کات و شوێنێك دا، بەڵام لە ناو ئەزموونی سعودییەدا تایبەتمەندی دیاری هەن، زۆر بەتووندی پەیوەندی هەیە بە تەفسیرو لێکدانەوەی وەهابی بۆ ئایین، بەو پێیە ئێمە دەتوانین بڵێین دیاردەیەکی تایبەت لە ناو ئەزموونی وەهابیەت کە سنورە

دیاریکراوەکانی دیکتاتۆریەت تێپەڕ دەکات کە لەهەموو دونیا زانراوە، ئەو سیستەمە دیکتاتۆریەی سعودییەش خۆی دەبینێتەوە لە خۆسەپاندنی دەسەڵاتدار بەرەهایی و لێك دابڕاندنی تێکڕای چین و توێژو تاك حیزبەکانی نەتەوە، ئەمەش لەگەڵ ئەوە دەست پێ دەکات کە وەهابیەت کۆمەڵگاکە تەکفیر دەکات و دژایەتی دەکات و حەڵاڵ کردنی خوێن و ماڵ و سەروەتی خەڵك هەروەها پێنەدان و نکۆڵی کردن لە هەر مافێکی سەرەتایی مرۆڤ. ئەگەرچی سیستەمی نوێی سعودیی هەندێ لە زیاد ڕۆچوونی وەهابیەتی کۆنی سوك و کەم کرۆتەوە، زۆرێ لە توند ڕەوی وەهابیەتی فرێداوە، بەڵام سیستەمەکە هێشتا نەیتوانیوە خۆی بەتەواوی ڕزگار بکات لە زۆرێك لە پاشماوەی دەروونی و ترسێنەر کە گیانی توند ڕەوی وەهابیەت هەیەتی، کە تا ئێستاش لەگەڵی کارلێك دەکات و پێی کاریگەر دەبێت و پشتی دەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ زۆرێ لە تیۆرو دامەزراوەو قوتابخانەی وەهابی توند ڕەو.

سەرباری ئەوەی سیستەمی سعودی ناڵاندوویەتی و دەشناڵێنێ بە دەست تەفسیرو لێکدانەوە توندڕەوەکانی وەهابیەت دژ بە سیستەمەکەی، بەڵام دەترسێ کە بەتەواوی لێی جیا ببێتەوە، لە ترسی لە دەستدانی بنچینەی کۆمەڵگاو و دەمارگیری حیزبی کە سیستەمەکە لە باوەشی دەگرێت. سیستەمی دەوڵەتی سعودییە توانیویەتی خۆی بپارێزێ لە تورەیی بنچینەی وەهابیەت ئەمەش لە ڕێی پشتیوانی سەرکردە ئاینییە لاساییکەرەوەکان (بەتایبەتی لە ئال شەیخ) و خۆ دەرخستنی سیستەمەکە بە هەندێ لە دروشمەکانی ئیسلامی و جێبەجێ کردنی هەندێ یاسای شەرعی و قۆستنەوەی فیکری سیاسی وەهابی

که پێداگیری دەکات لەسەر پێویست و فەرز بوونی گوێڕایەڵی ئەمیرەکان و ملکەچ بوون بۆیان.

لە هەمان کاتدا کە سیستەمی دەوڵەتی سعودییە سوودی دەبینی لە (فیکری وەهابی) لە ماڵی کردنی (تدجین) وەهابیە ناڕازییەکان، بزوتنەوەی وەهابیەتی وەك دەنگێك بەکار دەهێنا لە دژی بزوتنەوە نەتەوەییەکان کە داوای دیمۆکراسی دەکەن، ئەمەش لە میانەی بە گوێ چرپاندنی ئەوەی کە وەهابیەت دەتوانێت دەست بگرێت بەسەر کۆمەڵگەدا و توانای بردنەوەی لە هەر کردارێکی هەڵبژاردندا، لە بەرامبەر دا دەست واڵا کردنی وەهابیەت کە بەتووندی دژ بە تەیارو دەستەو تاقمە عەلمانی و تیرە گەرو حیزبە جیا جیاکان بوەستێتەوە کە وەهابیەت بە بێ باوەڕو هەڵگەڕاوەی دەزانێت و هاندانی ئۆپۆزیسیۆنی دیموکراسی بەوەی کە قبوڵی سیستەمی سعودی و خۆسەپاندنەکەی بکەن لە ترسی ئەوەی کە زۆر گەورەیە.

ئەمە مانای وانیە کە وێنەکە زۆر زۆر تاریکە و هیوا نیە کە پێشکەوتنی دیموکراسی لە سعودییە بێتە کایە، چونکە ئەوەی کار ئاسان دەکات و مژدە دەدات بە بەیانییەکی باشتر بریتیە لە ڕوودانی پێشکەوتنێکی گرنگ، ئەگەر گەورەش نەبێت لە ناو خودی بزوتنەوەی وەهابی و لە دایك بوونی بزوتنەوەی ئیسلامی دیموکراسی نوێ کە چاو دەخشێنێت بە زۆرێك لە بنەماکانی وەهابیەت. ئەگەر هاتوو ئەو بزوتنەوانە وەك وەهابیەت بواری گەشەو بڵاوبوونەوەیان بۆ ڕەخسا ئەوا دەکرێ بەشدار ببێت لە گۆڕینی ڕووخساری سیستەمی سعودی یان بنیادنانی سیستەمێکی ئیسلامی دیموکراسی نوێ.

بۆ ئەوەی هەموو ئەو پێشکەوتن و ئاراستەو دەستەو تاقمانە بناسین، ئەوا پێویستە سوکتر هەڵسین بە لێکۆڵینەوە لە بزوتنەوەی وەهابی، هەر لە (تیۆری یەکتاناسییەوە) کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب پێشکەشی کردو کۆڵەگەکانی دەوڵەتی سعودییەی لەسەر دامەزراند کە شەرعیەت و هێزو بەردەوامی پێدا. شوێنەواری ئەو تیۆرە لە تەقینەوەی ململانێ خوێناوییە تووندەکەی ناو نەجد و دوورگەی عەرەبی، دامەزرانی دەوڵەتی سعودییەی یەکەم و لە ناوچوون و دامەزرانی دەوڵەتی سعودییەی دووەم و پێکهاتەکەی بۆ بەرهەڵستی کردنی دەسەڵاتی میسری (عوسمانی) و ئەو ململانێ ناوەخۆییانەی نێوان نەوەکانی بزوتنەوەی وەهابیەت ڕوویدا چ دەسەڵاتدار بێت چ ژێر دەست، تەکفیر کردنی خۆ بەخۆیی.

دواتر دەچین قسە لەسەر دامەزرانی سیستەمی سعودیەی نوێ دەکەین کە لە سەرەتایی سەدەی بیستەم لە دایك بوو لەسەر دەستی شا (عەبدولعەزیزی کوڕی سعود)، سروشت و ڕوخسارو پەیوەندی ئەو سیستەمە نوێیە بە بزوتنەوەی وەهابی (ئیخوان) کە سیستەمە نوێیەکە لە ساڵانی سەرەتا پشتی پێ بەست و دواتر لەناوی برد و هاتنە کایەی دامەزراوەی دینی وەهابی و هەڵوێستی لە بەرامبەر دیموکراسی و دیکتاتۆرییەت، دوای ئەمە دەست دەکەین بە لێکۆلینەوە لە گرنگترین دەستە نارازی و ئۆپۆزیسیۆنە وەهابیەکان چ ئەوانەی سەر بەدەسەڵاتن چ ئەوانەی لە دەرەوەن، لە کۆتاییدا لە ئاست بزوتنەوەی دیموکراسی ئیسلامی هەڵوەستە دەکەین تا گرنگترین دروشم و ڕوخسارەکانی بناسین و گریمانەکانی سەرکەوتنی و توانای لەسەر دروست کردنی جێگرەوەیەکی ئیسلامی لە جێی بزوتنەوەی وەهابی.

من به زیاد له پێویستی دەزانم كه ئاماژه بدەم بۆ پێویست بوونی جیاوازی كردن له نێوان قسه كردن لەسەر تیۆری وەهابیەت و وەهابیەت له واقیعدا، چونكه هەرچی ناوی (وەهابیەت)ی هەلگرتووه یان ڕۆژێ له ڕۆژان خۆشی ویستووه مەرج نیه باوەڕی هەبێت به هەموو گوفتارێك و پابەند بێت به هەموو هەڵوێست و ڕوخسارەكانی وەهابیەت، جا ئەگەر بزوتنەوەیەكی ڕۆشنبیری پێشكەوتوو و هەبێت له ناو بزوتنەوەی وەهابی، دەكرێ هەندێ كەس ببینین كه تەنها بەناو یان پێناسیان "وەهابیه"، بۆیه نابێت بكەوینه هەڵەوه له تەماشا كردنی ئەوانی تر بەوەی هەموویان یەك دەستەن و نەگۆڕاون و ناگۆڕێن.

قسه كردن لەسەر وەهابیەت نمونەیەكه بۆ ئەوەی قسه بكرێ لەسەر بزوتنەوه ئیسلامییه توند ڕەوەكان كه ئیسلام قۆرخ دەكەن بۆ خۆیان، موسڵمانانی تر دادەماڵن له موسڵمانێتی یان گومان دەخەنه سەر باوەڕیان، ڕەنگدانەوەی ئەو دیاردەیه به شێوەیەكی خۆبزێو بەسەر كاری سیاسی و ئاراسته كردنی بەرەو دیكتاتۆری و تاكرەوی خۆسەپاندن.

## وەهابیەکان کێن؟ و وەهابیەت چییە؟[1]

"وەهابیەکان" سەرجەم ئەو کەسانەن کە دەدرێنە پاڵ قوتابخانەی (شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) کە لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەهەم لە (نەجد) دایمەزراند، کە بزوتنەوەیەکی چاکسازی بوو، لە دژی هاوارکردن و تکاکردن بە ئەولیاو پیاوچاکان، چ زیندووەکان چ مردووەکان و سەردان کردنی گۆڕەکانیان و شەفاعەت خواستن لێیان، چونکە _ شیخ موحەمەد _ ئەو کردەوەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتانەی بە شیرك و هاوبەش دانان دادەنا بۆ خوای پایە بەرز، کە موسڵمان بەو شتانە دەچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و موسڵمانێتی، پاشان هاوپەیمانی پێکهێنا لەگەڵ ئەمیری نەجد کە (موحەمەدی کوڕی سعود) بوو و هاوشان لەگەڵی ئەو دەوڵەتەی دامەزراند کە ناسراوە بە (دەوڵەتی سعودیەی یەکەم ساڵی ١١٥٧ك).

لە کاتێکدا شوێنکەوتووە پێشینەکانی ئەو قوتابخانەیە نازناوی "الموحدون: یەکتاناسان" یان "موسڵمانان"یان لە خۆ دەنا بەرامبەر بە هاوبەشدانەران، لە بەرامبەردا دژەڕاکانیشیان نازناوی"خەواریج"یان بۆ بەکاردەهێنا. بەڵام شوێنکەوتووە هاوسەردەمەکانی ئەو قوتابخانەیە نازناوی "سەلەفیەت" یان "سەلەفیەکانیان" لەخۆیان ناوە و ئەم نازناوەیان پێ چاکترە. و بەهەمان شێوە بەکارهێنانی نازناوی " وەهابیەکان " بەربڵاوە لەلایەن هەر دوو لاوە؛ واتە چ شوێنکەوتووەکان چ دژەڕاکانی، وەك ناوێکی ناسێنەری لێهاتووە بۆ ئەو تەیارو

(١) باشتر وابوو نووسەر یەکەمجار چیەتی (ماهیة)ی هزرو ئایدۆلۆژییەکە بێنێت پاشان پەیڕەوانی (واتە: وەهابیەکان). (وەرگێڕ).

تاقمەی کە پێکهاتەیەکە مێژوو و تایبەتمەندی و کتێب و دانراو چەند شێخێکی هەن و لە زۆر شت جیاوازە لە دەستەو تەیاری گشتی سەلەفیەت، بۆیە هەندێ زانا کە لەسەر هەمان مەزهەبن، ئەم نازناوەیان بەکارهێناوە وەك:(موحەمەدی کوڕی عەبدولڵەتیف و شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمان) کە بە شانازییەوە دەڵێت: " بەڵێ ئێمە وەهابیەکی یەکتاناسین، یەکتاناسێك کە ئەوەی ڕقی لێمانە تاڵاوی پێ دەرخوارد دەدرێ[1]".

شێخ عەبدوڵڵا ئیبن باز موفتی پێشووی وڵاتی عەرەبی سعودیی:" ئەو نازناوە[2] بەناوبانگە بەکاردێت بۆ ئەو زانایانەی نەجد، کە تیۆری یەکتاناسی جێبەجێ دەکەن و پاڵدەدرێنە لای ئیمام (موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ چونکە ئیمامی ناوبراو بانگەوازی کردووە بۆ لای خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ و زیاد تێکۆشاوە لە ڕوونکردنەوەی یەکتاناسی و هاوبەش دانان بۆ خوا، ئەو شتانەی زۆر بە خەستی ڕوون کردۆتەوە بۆ خەڵکی، بەتایبەتی لە نیوەی دووەم لە سەدەی دوازدەهەم، بە تێپەڕ بوونی کات شوێنکەوتووانی هەمان بانگەواز دەکەن و لەسەر ئەو بانگەوازە لە نەجد دا پێگەیشتووە ناودەبرێت بە وەهابی..... نازناوی وەهابی نازناوێکی شکۆدارو بەڕێزو مەزنە و ئەوەی ئەو نازناوەی هەبێت ئەوا هەڵگری یەکتاناسییە، لەو کەسانەیە کە دڵساغ و دڵسۆزن بۆ خوا "[3].

---

(١) دەقەکە ئاوەهایە:(تسقي لمن غظنا المرا) من بەپێی تێڕوانینی خۆم وشەی (المرا)م بە (تاڵاو) لێکداوەتەوە، چونکە بەپێی دەقەکە دەبێت ناو بێت چونکە (ئەلف و لامی) تەعریفی پێوەیە. (وەرگێڕ).

(٢) واتە نازناوی (وەهابی). (وەرگێڕ).

(٣) http://www.ibnbaz.org.sa/last_resaul.asp?hID=719

سەرباری پابەندبوونی دەوڵەتی سعودی بە فیکرەی وەهابی و کردنی ئەو فیکرەیە بە بەرنامەی خوێندن لە قوتابخانەو زانکۆکان، ئەوا دەوڵەتی سعودییە ماوەیەکە هەوڵ دەدات کە نازناوی وەهابی لەسەر خۆی لابدات و خۆی لێ دابشۆرێ، چونکە بە کۆسپ و ڕێگری دەزانێت لە بەردەم بەدەستهێنانی ئارەزووەکەی کە بریتیە لە پێشڕەوایەتی کردنی جیهانی ئیسلامی، بەشێوەیەك کە پێداگیری دەکات لەسەر ئەوەی کە هەر لەسەر کەلەپووری گشتی سوننەیە، مەزهەبی (وەهابیەت) بەفەرمی ناکات بە مەذهەبی دەوڵەت. بەڕاشکاوی لەو لایەنەدا (عەبدولعەزیزی کوڕی سعود) لە ١٩٢٩/٥/١١ وتی: " ناومان لێدەنێن وەهابیەکان، مەزهەبمان ناودەنێن بە (وەهابی)، بەوەی کە وەهابیەت مەذهەبێکی تایبەتە. ئێمە مەزهەبێکی نوێ یان عەقیدەیەکی[١] نوێمان نەهێناوەو، (موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب)

---

(١) واتای وشەی (عەقیدە): " لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا، وەك فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی هێناویانە دەڵێن: (العقدُ و الرَبطُ و الابرامُ و الاحكامُ و التوثقُ و الشَدُ بقُوَةِ و التماسُكُ وهوَ نقيض الحلّ) واتە: هەموو ئەو ووشانە: گرێدان و پەیوەست و توووند و بەهێز و مەحکەم و توندوو تۆڵکردن و پێکەوە لکاندن، وشەی (عقیدە) و (عقد) ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، (عقد) واتە: گرێدان و پێکەوە لکاندن، کە پێچەوانەی (حل)ە واتە: هەڵوەشاندنەوەو لابردن. خوای پەروەردگار دەفەرموویْ:﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ ﴾ المائدة : ٨٩. واتە:(خوا (جل جلاله) بەوەی کە سوێندێکتان بەدەم دا دێت ناتانگرێ و سزاتان نادات بەڵکو بەوە سزاتان دەدات کە سوێندێکتان بەدڵ دا دێت و دڵتانی لەسەر دادەمەزرێنن و دەچەسپێنن). کەواتە (عەقیدە) بە حوکمێك دەگوترێ کە خاوەنەکەی دڵی لەسەر دامەزرابێ، عەقیدەی ئیسلامی (العقيدة الاسلامية) واتە دڵ دامەزراندنی ئینسانی موسڵمان لەسەر ئەو ڕاستی و حەقیقەتانەی کە خوای گەورە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ناردوونی". بۆ نوسینی ئەم پێناسەیە سوودم

عەقیدەیەکی نوێی نەهێناوە، عەقیدەی ئێمە بریتیە لە عەقیدەی (پێشینە چاکەکان) کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پەیامبەرەکەیدا هاتووە و ئەوەی کە پێشینە چاکەکان لەسەری دەڕۆن ".[1]

شا فەهد لە ساڵی ١٩٨٩ وتی:" وەهابیەت مەزهەب نییە بەڵکو کە بە وەهابیەت ناو دەبرێن هەندێك جار بۆ ستایشە، هەندێك جاریش بۆ سەرزەنشتە، لەکاتێکدا (شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) کە هەڵسا بە بانگەوازەکەی تەنها لە پێناو پاك کردنەوەی عەقیدەبووە لە بیدعەت و شتی گومراکەر ".[2]

هەروەها بەو شێوەیە (شێخ صالحی کوڕی عەبدولعەزیزی ئالیشەیخ) وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەوڵەتی سعودییە لە بەرواری ١٨/ ١١/ ٢٠٠١ دەڵێت:" ئەوەی ناوی دەنێن وەهابی وادەزانن کە ئێمە لەسەری دەڕۆیین بەڕاستی هەر ئەوەیە (واتە: وەهابیەتە[3]) بەرنامەو پەیڕەوی پێشینەکان و گەوهەرو کرۆکی دیین و پێویست ناکات کە ناوی لێ بنرێ وەهابی چونکە مەزهەبێکی نوێ نییە ". جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە " لێرەدا مەزهەبێك نییە بەناوی (وەهابیەت) " شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب کە دامەزرێنەری ئەو بزوتنەوەیەیە لە سەدەی هەژدەم " شتێکی نوێی نەهێناوە بەڵکو مەزهەبی پێشینەکانی زیندوو کردۆتەوەو پێداگیریش دەکات

---

بینیوە لە کتێبی:(ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا، مامۆستا عەلی باپیر، بەرگی یەکەم ٤٤، ٤٥). (وەرگێڕ).

(١) الحصين، أحمد، دعوة الامام.... سلفية لا وهابية ٣٧٨.

(٢) عبدالله، أنور، العلماء و العرش ٤٠٧.

(٣) (وەرگێڕ).

لەسەر ئەوەی دین پاك و دووربێت لە كەم و كورتی و بیدعەت ". شێخ صالحی ئالیشیخ داخی خۆی دەربڕی بەهۆی ئەوەی " ئەمڕۆ نازناوی وەهابیەت بۆ وڵاتی سعودییە بەكاردێت تا بوترێ دەوڵەتێكی توندڕەوە ". لە هەمان كاتدا وەزیری ناوبراو جەختی كردەوە لەسەر پێویست بوونی " بە شتە چەسپاوەكان و نەگۆڕاوەكانی وڵات لە سەروی هەمووشیانەوە، پابەندبوون بە بانگەوازی سەلەفیەت، كە هەل و فرسەت دەرەخسێنێت بۆ ڕۆیشتن بەرەو جیهان بەشێوەیەكی یەكسان و بەتێڕوانینێكی ئاسۆ فراوان ". ناوبراو پێداگیری كردووە لەسەر ئەوەی كە " پاراستنی وڵات بە پاراستنی بانگەوازەكە و ئەو تێگەیشتنە سەلەفیەتە دەبێت بۆ شەریعەت و عەقیدە ئیسلامی ".[1]

مامۆستا (عەبدولڕەحمانی كوڕی سولەیمانی ڕەیشد)، لە (الهدیة السنیة) دا دەڵێت: " بەكارهێنانی نازناوی (وەهابیەت) كە بۆ هەڵگرانی فیكرەی وەهابیەت بەكاردێت بەربڵاو نەبوو بە شێوەیەكی فراوان لە ناو ناوەندە سەلەفیەكان، بەڵكو زۆربەیان دەترسان لە بەكارهێنانی وەك نازناو بۆ فیكرەی سەلەفیەت، لەوانەیە زۆرێ خۆیان بپارێزن لە ناونانی هەڵگرانی فیكرەی ناوبراو بەو ناوە بەوەی كە وەسفێكی ناشرینە و مەبەست لە بەكارهێنانی شلەژان و تێكدانی فیكرەكانە و زیادكردنی كۆسپە بۆ كێشە نانەوە لە بەردەم بەردەوام بوونی كاروانی بانگەوازەكە، چاوپۆشین تا ئامانجەكان نەبینن. بەپێی تێپەڕبوونی كات ئەو نازناوە گۆڕا بەشێوەیەكی پلەبەندی بۆ تەنها نازناوێكی ڕووت هیچ موركێكی وا هەڵناگرێت كە هەستەكان پێی دابمركێنەوە یان هیچ مانایەكی سەرزەنشت ئامێز لە خۆی ناگرێت، بەڵكو بووەتە تەنها پێناسەیەكی

---

(١) لە گفوگۆیەكدا لەگەڵ ڕۆژنامەی " عكاظ " لە بەرواری ٢٠٠١/١١/١٨ .

ڕووت بۆ كەسانێكە فیكرە سەلەفی و ئەو فیكرەیەی كە شێخی ئیمام موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب ئاماژەی پێداوە، ئەو نازناوە لەناو نوسەرو مێژوو نوسانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی بڵاوەو قبوڵكراوە بەبێ جیاوازی. جا لێرەدا ڕێگر و پاساوێك نیە لە بەكارهێنانی ئەو وشەیە وەك پێناسەیەكی بڵاو یان وشەیەكە بەكاردێت لە چوارچێوە ڕاستەكەیدا وەك ئاماژەیەك بۆ ناوەرۆكی بیرێكی ویستراو و ئاماژە بۆكراو ".

بۆیە بەباشم زانی ئەو ناوە بەكاربێنم مەبەستم سەرزەنشت یان ستایش نەبووە بەڵكو تەنها مەبەستم ئەوەبووە كە وردبین بم لە پێناسەكەدا.

أحمد الكاتب

Ahmad@alkatib.co.uk

تیۆری وەهابی لێکدانەوەو تەفسیرێکی تایبەت بەخۆی بۆ واتای یەکتاناسی پێشکەش کرد، کە لە ووشەی (الله) یان (الاله) دەستی پێکرد و دواتر وەهابیەت تێڕامانێکی تایبەتی پێشکەش کرد بۆ واتای (موسڵمان) ئەوەی دەڵێت:(لا اله الا الله: هیچ پەرستراوێ نیە بەحەق جگەلە خوای گەورە)، بە پێچەوانەی ئەو عەقیدەیەی کە موسڵمانان هەیان بووە هەر لە سەرەتای ئەوەی یەکەم کە واتای (الاله) بریتیە لە بەدیهێنەری بوونەوەر بەپێی ئەو تێگەیشتنە وەردەگیرێت کە لەو ئایەتە دەخرێتەڕوو :﴿ قُلْ لَوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَابْتَغَوْا إِلَى ذِي الْعَرْشِ سَبِيلًا﴾ الإسراء : ٤٢. واتە: ("ئەی پێغەمبەر ~ بەو موشریکانە" بڵێ: ئەگەر خوای تریش هەبووایە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەروەکو ئەوان دەڵێن.. ئەو کاتە هەمووان هەوڵیاندەدا بۆ ئەوەی دەسەڵات لەخاوەنی عەرش و تەختی فەرمانڕەوایەتی بسەنن و لێی زەوت بکەن). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا... ﴾ الأنبياء: ٢٢. واتە: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا "لە ئاسمان و زەویدا" چەند خوایەکی تر هەبووایە غەیری "الله"، ئەوە کاوڵ و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا). شایەتی دان لەسەر یەکتاناسی واتە دانانی و ملکەچ بوون بەوەی کە خوای گەورە هاوشێوەو هاوێنەی نیە لە بەدیهێنان، تیۆری وەهابیەت دەڵێت مەبەست لە وشەی (الاله) بریتیە لە: پەرستراو (المعبود)، نەوەك بەدیهێنەر (خالق). واتە بەس نییە کە کەسێ دانبنێت بەوەی کە خوای گەورە بێ هاوەڵە لە بەدیهێنان دا و بەوە نابێتە یەکتاناس، بەڵکو تەنها لەسەری پێویستە کە

پەرستش بکات تەنیا بۆ خوای بێ هاوەڵ، هەر جۆرە پەرستشێك بکات بۆ غەیری خوای گەورە ئەوا دەبێتە موشریك و هاوبەشدانەر. دواتر تیۆری وەهابیەت دێت تا پێناسەیەك بۆ واتای پەرستش (العبادة) بکات، بە پێچەوانەی ئەو پێناسەیەی کە موسڵمانان زانیویانەو لەسەری ڕۆیشتوون کە ئەویش بریتیە لە ئەنجام دانی هەندێ ڕەفتاری تایبەت وەك نوێژ ...هتد. وەك لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە ﴿ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ طه: ١٤. واتە: (بەڕاستی هەر من (الله)م، من خوام، هیچ خوایەك نییە جگەلە من، کەواتە هەر من بپەرستە و نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیش منت لەیاد بێت). یان پەرستش بەمانای ملکەچی و گوێڕایەڵی دێت وەك لەو ئایەتەدا هاتووە:﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ. وَأَنِ اعْبُدُونِي﴾ یس: ٦٠، ٦١. واتە: (ئەی نەوەی ئادەم؛ مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن؛ چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە. بەڵکو تەنها من بپەرستن).

تیۆری وەهابیەت دەڵێت: پەرستش بریتیە لە ئەنجامدانی گشت ئەو شتانەی کە تایبەتن بە خوای گەورە وەك:(نزاو پاڕانەوە، نەزرو سوێند خواردن، هاوار و هانا بردن، ترسان و ئومێد و داوای شەفاعەت کردن)، جگەلەوانە ئەو شتانەی وەك پەرستش دەکرێن بۆ کەسانی تر جگەلە خوای گەورە، لەسەر ئەم پێناسە و دەسپێکە ئەوا تیۆری وەهابیەت نزاو پاڕانەوەی پیاوچاك و ئیمام و پێغەمبەران و نەزر بۆ کردنیان و شەفاعەت لێ خواستنیان... بەجۆرێ لە پەرستشی دادەنێت کە بەرزدەبێتەوە بۆ ئاستی

شیرکی گەورە بۆ خوای بەرز بڕیاردان بەشێوەیەك کە بکەرەکەی دەخاتە دەرەوەی خانەی ئوممەتی ئیسلام و دەیگێڕێتەوە بۆ خانەی نەفامی سەرەتا.

تێڕوانینی ئیسلامی پێشتر بۆ شیرك و هاوبەشدانان بەر لە دەرکەوتنی تیۆری وەهابیەت، بریتیە لەوەی کەسێ بڕوای وابێت کە خوای پاك و بەرز هاوبەشی هەیە نەك شیرك تەنها بریتی بێت لە گوێڕایەڵی غەیری خوای گەورە بۆ نمونە وەك شەیتان و تەنانەت ئەوەی بە شێوەی وشەی پەرستش هاتوون، بێگومان گوێڕایەڵی شەیتان گوناهو تاوانە ئەگەر واتای ئەوەش نەبێت کە غەیری خوای پاك و بەرز پەرسترابێ، دواتر خوای گەورە لە تێکڕایی گوناهەکان خۆش دەبێت تەنها هاوبەشدانان و شیرك نەبێت، هەروەك ئەو ئایەتانەی خوارەوە دەری دەبڕن:﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا﴾ النساء: ٤٨. واتە: (جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە). ﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ النساء: ١١٦. واتە: (جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی زۆر دوور). ﴿ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ﴾ المائدة: ٧٢. دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان بەهەشتی لەسەر حەڕامکردووە). ﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ ﴾ الحج: ٣١. واتە: (جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەر بێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات). بەدەر دەکەوێت کە بەڵگەیە لە سەر دوو چەمك بۆ شیرك و هاوەڵ بڕیاردان، ئەویش بریتین لە هاوەڵ دانانی بچوك و گەورە، وەك بوونی چەمکی جیا جیا و پلەی جیاواز بۆ ئیمان و ئیسلام و دووڕووی و پەرستش و هاوێنەکانی.

بەڵام شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بەهۆی لاسایی کردنەوەی (ئیبن تەیمیە) هەندێ هەڵسوکەوت و ڕەفتار کە موسڵمانان ڕاجیا بوون لەسەری بە شیرك و هاوڵ بڕیاردان بۆ خوایان دەزانێ، وەك:(پاڕانەوەی پێغەمبەران و پیاوچاکان و هاوارکردنیان و داوای یارمەتی کردن بەهۆیانەوە)، ئەو جۆرە شتانەیان بە شیرکی گەورەی دەرخەر لە ئوممەتی ئیسلام و ئایین دەزانی.[1]

---

(١) نازانین بە وردی تەمەنی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب چەند بوو کاتێك گەیشت بە تیۆری تایبەت لە (یەکتاناسی و مەرجەکانی ئیمان و باوەڕ) کە بەپێی ئەو تیۆرە سەردان کردنی گۆڕی ئەولیا و پیاوچاکان و داوای یارمەتی بەهۆیانەوە بە شیرك و هاوەڵدانانی گەورە داناوە، و لەژێر ڕۆشنایی ئەو تیۆرە تێکڕایی موسڵمانانی تەکفیر کرد، بەڵام ئێمە وا دەخەملێنین کە تەمەنی لە سنوری بیست و پێنج دابووە، لە کاتێکدا کە باوکی هێشتا لە ژیاندا بووە، چونکە ڕێگری کرد لەو جۆر فیکرانەی، باوکی کۆچی دوایی کرد ساڵی ١١٤٣ك (یان ١١٥٣ك) لە کاتێکدا تەمەنی شێخ موحەممەد لە دەوروبەری سی ساڵی دابوو. گفتوگۆ لەسەر فیکرەکانی نەشو نومای کرد کاتێك دەرسی دەخوێند لە بەسرە، لە دژی ئەو کەسانەی شیعە و سوننە بوون و سەردانی گۆڕی هاوەڵان و ئیمامەکانی ئەهلی بەیتیان دەکرد، شێخ موحەممەد بە خودی خۆی دوواوە لەوبارەوەو وتویەتی: " خەڵکانێك لە موشریك و هاوبەشدانەرانی بەسرە دەهاتنە لام و گومانیان بۆ دروست دەکردم، منیش پێم دەووتن، لەو کاتەی کە ئەوان لەلام دانیشتبوون: پەرستش تەنها بۆ خوای گەورەیە و هەر ئەو جۆرەش دروستە ". ئەمە بووە هۆی ڕق هەڵسانی خەڵکی بەسرە ج لە شێخ موحەممەد ج لە مامۆستاکەی کە ناوی مەجموعی بوو، تا مامۆستاکەی دەری کرد لە بەسرە. لە کاتێك کە شێخ موحەممەد لە بەسرە گەڕایەوە نەجد ئەوا باوکی لە عەیینە ڕۆیشتبوو بۆ حرمەیلاء، شێخیش لەگەڵ باوکی لەوێ مایەوە، هەوڵی بڵاوکردنەوەی فیکرەکانی دا لەوێ، بەڵام باوکی ڕێ گری کرد لەو کارەی، شێخ موحەممەد ئازدی خۆی بەدەست نەخست لە قسە کردن تا دوای کۆچی دوایی بابی نەبێت.

ئیبن تەیمیە دەڵێت: واتای وشەی (الله): بریتیە لە بەخوا کراو و بەخوازانراو ئەو زاتەی کە لە کارەکاندا تەنها پشتی پێ دەبەسترێ و ڕووی تێدەکرێت و جێگای مەبەستە[1]، بە هاواربۆکراو و هانا بۆبراو و ئەو کەسەی جێگای ئومێدە[2]. (الاله) بەو شتە پێناسە دەکرێ کە نهێنی تێدایە، دەڵێت: " پەرستراو لەلایەن عەرەب، بریتیە لەو خوایەی کە خەڵکی سادەی ئێمە ناوی دەبەن بە (سەید) و (شێخ) و (ئەوەی نهێنی تێدایە) و عەرەبە سەرەتاکان ئەو ناوە لە خوا دەنێن کە خەڵکی سادەی ئێمە ناوی دەنێت بە (نهێنیەکە) چونکە نهێنی لەلایەن خەڵکەکە واتە ئەو شتەی سوود و زیان دەگەیەنێت و شایەنی لێ پاڕانەوەو ئومێد پێ هەبوون و لێ ترسانە و شایەنی پشت پێبەستنە "[3].

بۆیە وشەی (یەکتاناسی) بەکارهێنا بۆ یەکتایی خوا لە پەرستندا (کە بریتیە لە بەیەکزانینی خوای گەورە، بەهۆی ئەنجامدانی کردەوەی بەندەکان، واتە ئەنجامدانی ئەم کردەوانە تەنها بۆ خوا، وەك: (نزاو پاڕانەوە، نەزرو قوربانی کردن، ئومێد و ترس هەبوون، پشت بەستن و ویستن و نەویستن و پەشیمان بوونەوە) وشەی ناوبراویان بۆ یەکتایی خوا لە پەروەدگارێتی دا (توحید الربوبیة) بەکار نەهێنا کە واتای بریتیەلە (ئیمان هەبوون بە بەدیهێنەری تاك و بێ هاوتا)، دەڵێت: بێ باوەڕانی سەردەمی پێغەمبەر ~، دانیان دەنا بە یەکتایی خوای گەورە لە پەروەردگارێتی دا کە بریتییە لەوەی هیچ زاتێك غەیری خوای گەورە نە بەدیهێنەرە و نە ڕۆزیدەر و نە ژیێنەر و

(١) بگەڕێوە: ابن تيمية: الرسالة التدمرية ٦٠.

(٢) حسين بن غنام: تأريخ نجد ٢٤٣_٢٤٤.

(٣) إبن غنام: تأريخ نجد ٢٨٧.

نه مرێنەرە و نە مشورگێڕو هەڵسوڕێنەری کارەکانە، بەڵام بێ باوەڕان بڕاوایان نەبوو بە یەکتایی خوای گەورە لە پەرستندا و هەر ئەم یەکتاناسییە کە ململانێی لەسەر دەکرێت لە کۆن و نوێ دا." [1]

هەروەها وتویەتی: " یەکتاناسی بریتیە لە بەیەکزانینی خوا لە پەرستش دا، کە هەر ئەوەش بریتیە لە دینی پەیامبەران ئەوانەی خوای گەورە بۆ لای بەندەکانی ڕەوانەی کردوون یەکەم پەیامبەر (رسول) نوحە سەلامی لێبێت خوای گەورە ڕەوانەی کرد بۆ لای گەلەکەی لەبەر زیاد ڕۆچوونیان لە پیاوچاکان دا کە بریتیی بوون لە (وەد) و (سواع) و (یەغوث) و (یەعوق) و (نەسر)... کۆتا پەیامبەر موحەممەدە ~ کە وێنەی ئەو پیاوچاکانەی شکاند، خوای گەورە پێغەمبەر موحەممەدی ڕەوانە کرد بۆ لای گەلێك کە پەرستش و حەج و سەدەقە و زیکرو یادی خوایان دەکرد، بەڵام ئەوان _ واتە بێ باوەڕانی قوڕەیش _ هەندێ لە بەدیهێنراوان دەکەن بە هۆکار لە بەینی خۆیان و خوای گەورە "[2] و " ئەو یەکتاناسیەی بڕوای پێناکەن بریتیە لە (یەکتاناسی لە پەرستش دا) "[3].

وتویەتی: " ئەو بێ باوەڕانەی کە پێغەمبەر ~ جەنگی لەگەڵ کردن سەدەقە و حەج و عومرەو پەرستشیان دەکرد و لەترسی خوای باڵا دەست و خاوەن شکۆ هەندێ شتی حەرامیان ئەنجام نەدەدا، بەڵام شایەتی

---

(١) محمد بن عبدالوهاب، الرسالة المفیدة.

(٢) محمد بن عبدالوهاب، کشف الشبهات، لا ٥، بەهەمان شێوە سەیری:(دەروازە، هۆکاری ئەوەی ئەوەی ئادەم بێ باوەڕی دەکات و دینی خۆی فەرامۆش دەکات زیاد ڕۆچوونە لە پیاوچاکان دا) لە کتێبی (التوحید).

(٣) محمد بن عبدالوهاب، کشف الشبهات ٩.

یەکتاپەرستیان نەدەدا بۆ خوا و بڕوایان وانەبوو کە تەنها خوا شایەنی پەرستنە، ئەمەش لەبەر ئەوەی موشریکەکان لە پیاوچاکان دەپاڕانەوە وەك:(فریشتە و عیسا و عوزەیر و جگەلەوانیش ئەولیاکانی تر)، جا بەو کارەیان بێ باوەڕبوون لەگەڵ ئەوەی دانیان دەنا بەوەی تەنها خوای گەورە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و مشورگێڕو هەڵسوڕێنەری کارەکانە، جا کە ئەوەت زانی و زانیت مانای (لا اله الا الله) چییە، زانیت هەر کەسێ چۆك دابدات لە بەردەم پێغەمبەرێك یان فریشتەیەك یان لەبەری پاڕایەوەو کروزایەوە ئەوا لە ئیسلام دەرچووە "[1].

پاشان وتویەتی: " باوەڕ بوون بەوەی تەنها خوای گەورە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەرەو هاوبەشی نییە، تەنها خوای گەورە ڕۆزی دەدات، تەنها خوای گەورە کارەکانی بەدەستەو هەڵیان دەسوڕێنێت و تێکڕایی ئاسمانەکان و زەوی بە حەوت چینەکانی زەوی و ئەوەی تێیاندایە هەموویان بەندەی خوای گەورەن و لە ژێر ویستی ئەودان... هەموو ئەوەی لەو چەند ڕستەیەدا هاتوون نابنە هۆی ئەوەی مرۆڤ ببێتە کەسێکی یەکتاناس و موسڵمان "[2]. ئەو چەند دێرەشی زیاد کرد بۆ قسەکانی پێشووی: " فڕێدانی شیرك و هاوبەش دانان تەنها بریتی نییە لە وتن و دەربڕینی (وشەی یەکتاناسی) بە زمان و زانینی ماناکەی و شێوازی دەربڕینی و دانپێ دانانی، تەنانەت فڕێدانی شیرك تەنها بەوەش

---

(١) محمد بن عبدالوهاب: پەیامێك لەبارەی (واتای: لا اله الا الله).

(٢) محمد بن عبدالوهاب: التوحید ٣٦.

ناکرێت کە تەنها لەخوای گەورە بپاڕێیەوە، بەڵکو فرێدانی شیرك بریتیە لە بێ باوەڕ بوون بەو شتانەی کە لە غەیری خوای گەورە دەپەرسترێن "[1].

شێخ ئەو شتانەی بە هاوبەش دانانی گەورە داناوە: هانا بردن و داوای یارمەتی کردن لە غەیری خوا، بەهەمان شێوە داوای شەفاعەت کردن لە ئەولیا و پیاوچاکان، وتویەتی: " هەر کەسێك داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر موحەمەد ~ بکات وەك ئەوە وایە داوای شەفاعەت لە بتەکان بکات و هیچ جیاوازیان نییە "[2].

شیخ موحەمەد لە کتێبەکەی (التوحید الذي هو حق الله علی العبید) ئەوەی باس کردووە کە هۆکاری بێ باوەڕ بوونی نەوەی ئادەم و فرێدانی دینەکەی بریتیە لە زیاد ڕۆچوون لە پیاوچاکان دا و (وەد) و (سواع) و (یەغوث) و (یەعوق) و (نەسر) ناوی چەند پیاوچاکێکن لە گەلی نوح، کاتێك ئەو پیاوچاکانە مردن شەیتان خستیە گوێ و دڵی گەلەکە کە بیان پەرستن وتویەتی: هەر کەسێ چۆك دابدات لە بەردەم پێغەمبەرێك یان فریشتەیەك

---

(١) محمد بن عبدالوهاب: التوحید الذي هو حق الله علی العبید، دەروازە: تەفسیری یەکتاناسی و شادەتی (لا اله الا الله).

(٢) ئیبن تەیمیە سەردانی گۆڕی ئەولیا و پێغەمبەرو پیاوچاکان و تەوەسول و یارمەتی لێخواستنیان بە جۆرێك لە شیرك و هاوبەشدانانی داناوە کە دژی یەکتاناسی و یەکتاپەسەرتی و بەندایەتی خوای گەورەیە، لەو بارەوە دەڵێت: ئەو " بیدعەتانە بنچینەی شیرك و گۆڕینی ئیسلامە. ئەوەی مەزارگە دروست دەکات لە سەر گۆڕ ئەوا موشریکە یان بە موشریکان دەچێت. دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ کە بە (المشاهد) ناودەنرێت و بەگەورە سەیری دەکرێت لە دینی موسڵمانان نەبووە، بەڵکو لە دینی موشریکان بووە". بگەڕێوە: کتب و رسائل ابن تیمیة في الفقه ١٦/٢٧ و کتاب اقتضاء الصراط المستقیم ٤٥٧ و ٣٣٤.

یان لەبەری پاڕایەوەو کروزایەوە ئەوا لە ئیسلام دەرچووەو ئەوە ئەو بێ باوەڕی و کوفرەیە کە پێغەمبەر ~ لەسەری جەنگی کرد لەگەڵ موشریکان و هاوبەش دانەران... کوفرو بێ باوەڕی خەڵکی سەردەمی خۆمان گەورەترە لە کوفرو بێ باوەڕی ئەوانەی پێغەمبەر ~ جەنگی لەگەڵ کردن[1].

وتویەتی: هەر کەسێك داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر موحەمەد ~ بکات وەك ئەوە وایە داوای شەفاعەت لە بتەکان بکات و هیچ جیاوازیان نییە "[2] و " ئەمەیە هاوەڵدانان و شیرکی گەورە ". هەر ئەوەیە کە بێ باوەڕان ئەنجامی دەدەن لەکاتی پەرستنی بتەکانیان[3]، بڕوایان وا نییە کە ئەو تەختە و بەردانە دەتوانن شت بەدیبێنن و ڕۆزیبدن و کاری ئەو کەسەی داواو نزا دەکات هەڵبسوڕێنێت؟[4].

وتویەتی: " وا گومان نەبەن کە بڕوا هەبوون بە پیاوچاکان وەك زینا و دزییە، بەڵکو بت پەرستییە، هەر کەسێك بڕوای وابوو ئەوا بێ باوەڕە و

---

(١) محمد بن عبدالوهاب: پەیامێك لەبارەی (واتای: لا اله الا الله).

(٢) ئیمامی مالیك لە کتێبەکەی (الموطأ)دا گێڕاویەتیەوە کە: پێغەمبەر ~ فەرموویەتی:(گۆڕی من مەکەن بە بتێك و بیپەرستن، خوای گەورە ڕقی زۆر لەو گەلەیە کە گۆڕی پێغەمبەرانیان دەکەن بە مزگەوت) موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب: لە کتێبی (التوحيد) (دەروازە: ئەو شتانەی هاتوون لەسەر ئەوەی کە زیاد ڕۆچوون لە گۆڕی پیاوچاکان دەبێتە بتێکی پەرستراو لە غەیری خوای گەورە). بەهەمان شێوە داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر ~ کردن بە شیرکی داناوە بە پشت بەستن بەو فەرموودەیەی بەرقانی گێڕاویەتیەوە:(قیامەت هەڵناسێت تا کەسانی زیندوو لە ئوممەتی من دەبنە موشریك و هابەشدانەر و تا کۆمەڵێك لە ئوممەتی من بت نەپەرستن....) کتێبی (التوحيد) دەروازە:( ئەو فەرمایشتانەی هاتوونە لەسەر ئەوەی هەندێ لە ئوممەتی موسڵمان بت پەرستن).

(٣) محمد بن عبدالوهاب، كشف الشبهات ٢٦.

(٤)محمد بن عبدالوهاب: كشف الشبهات ٣٦ _ ٣٧.

پێغەمبەری خوا ~ خۆی لێبەری کردووە... ئایینی بێ باوەڕان ئەوانەی کە بەهۆیەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه و سلم) بەبێ باوەڕو کافری دانان بریتی بوو لە (ئەو بڕوایەیان کە هەیانبوو لە هەمبەر پیاوچاکان) ئەوانەی کە دەیان وت: ئێمە بۆیە بڕوامان پێ هەیە تا لە خوای گەورەو نزیکمان بکەنەوەو شەفاعەت و تکامان بۆ بکەن[1].

هەروەها وتویەتی: " ئەوەی موشریك و هاوبەشدانەرانی" سەردەمی خۆمان ناوی دەنێن: " ئیعتیقاد " بریتییە لەو شیرك و هاوبەشدانانەی کە خوای گەورە باسی کردووەو ڕوونی کردۆتەوە لە قورئانی پیرۆز و پێغەمبەر ~ جەنگی لەسەر کرد لەگەڵ خەڵکی، هاوبەش دانانی هاوبەشدانەرانی پێشتر سوکترو سادەترە لە هاوبەشدانانی خەڵکی سەردەمی خۆمان ".

(١) إبن غنام، تأريخ نجد ٤٧٠ – ٤٧١ .

## تەكفیر كردنی تێكڕایی موسڵمانان

لەبەر ئەوەی سەردان كردنی گۆڕی پێغەمبەران و ئەولیا و پیاوچاكان بەشێوەیەكی بەرچاو بەربڵاو بوو لە تێكڕایی وڵاتە ئیسلامییەكان، بەوهۆیەوە شێخ موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب تێكڕایی موسڵمانانی بە بێ باوەڕ و هاوبەشدانەر و هەڵگەڕاوە داناوە وەك خەڵكی نەفامی سەرەتا بە گومڕاتری دادەنان لە خەڵكی نەفامی سەرتا، دەڵێت: " زۆربەی بەدیهێنراوان شەیتان یاری پێكردوون و شیرك و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورەی ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوان، ئەو یاری پێكردن و خەڵەتاندن و شیركەشی لە شێوەی خۆشویستن و بەگەورە زانینی پیاوچاكان دەرخستووە "[1] كە هاوبەشدانەرانی سەردەمی خۆمان لە بێ باوەڕانی سەردەمی پێغەمبەری خوا گومڕاترن.... لەلاتان ون نییە كە زەوی چۆن پڕ بووە لە هاوبەشدانانی گەورە: بت پەرستی "[2]، چونكە ئەوان " پەرستش دەكەن بە بەشداری پێكردنی پیاوچاكان لەو نزاو پەرستشەی بۆ خوای گەورە دەكرێت، مەبەستیان ئەوەیە شەفاعەتیان بۆ بكەن لەلایەن خوای گەورە، چونكە وا گومان دەبەن كە خوای گەورە ئەو كارەی پێ خۆشە و پیاوچاكان خوای گەورەیان خۆشدەوێت... ئەوە گەورەترین بابەتە كە پێغەمبەر ~ بەپێچەوانەی بۆچوون و بیركردنەوەی ئەوانە هەڵسوكەوتی كردووە، پێغەمبەر ~ دڵسۆزی و دڵساغی (الاخلاص)ی هێنا و ڕاشی گەیاند كە

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ٤٧٠ _ ٤٧١ .

(٢) إبن غنام: تأريخ نجد ٢٤٣.

ئەوە دینی خوایە کە لە ڕێی پەیامبەرانەوە بەگشتی ناردوویەتی، و بەبێ دڵسۆزی هیچ کارێك قبوڵ ناکرێت، پێغەمبەر ~ ڕاشی گەیاندووە کە هەر کەسێ ئەوە بکات کە خۆی دەیەوێت و بەهەوەسی خۆی هەڵسوکەوت دەکات ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام کردووەو ئاگری کردۆتە جێگاکەی.

ئەو مەسەلەیە خەڵکی پێی دەکرێتە دوو بەش باوەڕدارە و بێ باوەڕ، ئەوە ئەو بابەتەیە کە کێشەی لێ کەوتەوە، لە پێناو ئەو بابەتەشدا خوای گەورە تێکۆشان (جیهاد)ی پێویست کرد هەروەك خوای پاك و بەرز دەفەرمووێت:﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ﴾ الأنفال: ٣٩. واتە: ("ئەی ئیمانداران ئێوەش بجەنگن دژ بە کافرو خوانەناسان تا فیتنە و ئاشووب و ئازاردانی موسڵمان نەمێنێت و "ئەو خەڵکە سەربەست بن لە هەڵبژاردنی بەرنامە و ئاییندا"، تا ئایین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی بۆ خوا بێت).

شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەرەنجامێکی هەڵێنجا، لە ئەنجامی گرێدانی ڕەفتارەکانی هاوبەشدانەرو موشریکانی گەلانی پێشوو و ئەو ڕەفتارانەی موسڵمانانە هاوچەرخەکان دەیکەن وەك سەردان و نزا کردن لەلای گۆڕ و داوای شەفاعەت کردن و یارمەتی لێ خواستنیان، ئەو دەرنجامەش بریتی بوو لە هەڵگەڕانەوەی ئوممەتی ئیسلامی و دووبارە گەڕانەوە بۆ دۆخی سەردەمی نەفامی سەرەتا و دۆخی بت و پەیکەر پەرستی (واتە گۆڕپەرستی)[1].

وتویەتی: " ئەوانەی شوێن پێش خۆیان کەوتوون و ڕێگەی ئەوانیان گرتووە بست بە بست و باسك (باڵ) بە باسك و پەڕی باڵندە چۆن ڕیزبووەو

---

(١) محمد بن عبدالوهاب ١٢٨ مەسەلە لە مەسەلەکانی سەردەمی نەفامی.

**پاڵی بەیەکەوە داوە بەدوای یەکدا دێن، هاوبەشدانان زۆربەی دەروونەکانی داگیر کردووە لەبەر نەزانی و شاراوەیی زانست، چاکە بووەتە خراپە و خراپە بووەتە چاکە و سوننەت بووتە بیدعەت و بیدعەت بووەتە سوننەت، ئا لەناو ئەو جەنجاڵەدا منداڵ گەورە بوو و گەورە تیایدا پیر بوو و مەشخەڵەکان دامرکانەوەو کوژانەوە ئیسلام زیاتر نامۆ بوو، ڕێژەی زانایان ڕووی لە کەمی کرد و نەفامەکان دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت، هێز زیادی کرد و تاوان و خراپە دەرکەوتووەو هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە کە خەڵکی دەستیان داوەتێ"[1].**

**بەهەمان شێوە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب تێکڕای گوند نیشینانی سەردەمی خۆی بە بێ باوەڕو کافر داناوە، وتویەتی: کوفرو بێ باوەڕیان گەورەترە لە کوفری جولەکە، تەنانەت شێخ بە ناپەسندی زانیووە کە وەسفی موسڵمانان بدرێتە پاڵیان بەهۆی ئەوەی دەڵێن:(لا اله الا الله) لەگەڵ ئەوەی بەپێی قسەی شێخ موحەمەد ئەو موسڵمانانە هیچ لە ئیسلام نازانن.**

---

**(١) ئا لێرەوە وتوویەتی: " دروست نییە شوێنەکانی شیرك و تاغوت بمێنن پاش ئەوەی موسڵمانان توانایان هەیە لەسەر تێکدان و پوچڵکردنەوەی، چونکە دروشمی شیرك و بێ باوەڕین، کە گەورەترین خراپەیە، ناکرێ بە هیچ شێوەیەك کەسێ توانای هەبێت و دانی پێدا بنێت، بە هەمان شێوە حوکمی ئەو مەزارگانەی هەیە کە دروستکراون لەسەر گۆڕەکان و کراون بە پەیکەرێکی پەرستراو جگەلە خوای گەورە، ئەو بەردانەی کە تەبەڕوکیان پێوە دەکرێت و ماچ دەکرێن و نەزریان لەلا دەکرێت. گەر توانا و هێز هەبوو ئەوا دروست نییە هیچیان بمێنن لەسەر ڕووی زەوی چونکە زۆرێکیان دەگەنە ئاست (لات) و (عوزا) (مەنات)ی سێهەمیش، بەڵکو شیرکەکە گەورەترە... یەکێك لەو تاغوتانە بڕوای وانەبوو کە دەسەڵاتی هەیە شت بەدیبهێنێت و ڕۆزی بدات بەڵکو ئەو جۆرە ڕەفتارانەیان لەلا ئەنجام دا وئەو شتانەی برا هاوبەش دانەرەکانیان ئەمڕۆ لەلایەن تاغوتەکانیان دەکەن ". إبن غنام، تأريخ نجد ٢٨٤.**

شێخ موحەممەد وتویەتی: "ئای قسەی ئەو کابرایە گوندنیشنە چەند جوان و خۆش بوو کاتێك هاتە لامان و چەند زانیارییەکی لەبارەی ئیسلامەوە بیست، ئەوسا گوندنیشنەکە وتی: (گەواهی و شایەتی دەدەم ئێمە بێ باوەڕین _ واتە خۆی و تێکڕایی گوندنیشینەکان _ و شایەتی دەدەم کە ئەو گوێڕایەڵەی بە موسڵمانمان دەزانێت ئەویش بێ باوەڕە!)". " شتێکی زانراوە لەلایەن کەسانی تایبەت و گشتی ئەو بڕوایەی کە گوندنیشینان یان زۆربەی گوندنیشینان هەیانە.... ئەوا ئەگەر هەشت هۆکار هەبن دەستنوێژ بشکێنن، پێویستە بزانرێ کە لە گوندنیشینان دا زیاتر لە سەد هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلام هەیە"[1].

سەرباری ئەو تەکفیرەی شێخ موسڵمانانی پێ تەکفیر دەکرد، بەهۆی سەردان کردنی گۆڕی ئەولیاو پیاوچاکان و یارمەتی و هانا بۆ بردنیان و داوای شەفاعەت لێ خواستنیان، ئەو شتانەی بەشێوەیەکی گشتی سوننە و شیعە تیایدا بەشدارن، چەند هۆکارێکی تر هەن لەلایەن شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بۆ تەکفیر کردنی شیعە کە ناوی لێ نابوون " الرافضة "[2]. ئەو

---

(١) ابن غنام: تأريخ نجد ٢٦٤.

(٢) سەیری کتێبی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بکە بەناوی (رسالة في الرد على الرافضة)، د.ناصر بن سعد رەشید تەحقیقی کردووە، عەبدوڵڵای کوڕی موحسینی تورکی پێشەکی بۆ نوسیوە، کۆلیژی شەریعە لە زانکۆی ئیمام موحەممەد ئیبن سعود لە ریاز بڵاوی کردەوە لە ساڵی ١٤١٣ك، ١٩٩٢ . جێگای ئاماژە پێکردنە کە (الرافضة) دەستەو تاقمێکی بچوك بوو لە شیعە، دواتر شیعە پەرش و بڵاوبوون بۆ زیاتر لە حەفتا دەستەو تاقم کە هەر هەموویان (الرافضة) نەبوون هەروەك چۆن هەموویان ئیمامی نەبوون. بەڵام شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب جیاوازی نەکردووە لە نێوان دەستەو تاقمە شیعیەکان بەتایبەتی ئەو دەستەو تاقمە شیعیانەی کە زۆر لێك

هۆكارانەی كە شێخ شیعەی پێ تەكفیر دەكرد زۆر ڕاستەوخۆ پەیوەندی نەبوون بە تیۆری یەكتاناسیەوە، بە تێڕوانینی شێخ موحەمەد (شیعی) بوون ڕاستەوخۆ دەچێتە خانەی هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیمان، ئەو هۆكارانەی شێخ (شیعە)ی پێ تەكفیر دەكرد بریتین لە: بڕوا بوون بە پارێزراوی (عصمة) و بوونی دەق (نص) لەبارەی ئیمامەت و كورت كردنەوەی ئیمامەت لە ئالوبەیت و نكۆڵی كردن لە شەرعییەتی خەلافەتی خەلیفەكان و تانەو تەشەردان لە هاوەڵان و بڕوابوون بەهەڵگەڕانەوەیان و بانگەشە كردنی ئەوەی كە كەم و كورتی و كرچ و كاڵی لە قورئانی پیرۆزدا هەیە.[1]

---

جیاوازن كە هەندێكیان لەناوچوون و بەدوایی نەمان و هەندێكیش هاوچەرخن، بەهەمان جۆر شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب تێبینی ئەو پێشكەوتن و گەشە سەندنەی ناو ڕیزەكانی شیعەی نەكردووە كە هەوڵی داوە خۆی دابماڵێت لەو دەستەو تاقمانەی كە توند ڕەون و دیدو بۆچوونی ڕیزپەڕیان هەیە، لە بەر هۆكارە ناوبراوەكان شێخ موحەمەد ناوی لە شیعە ناوە (الرافضة).

(١) شێخ موحەمەد وتویەتی لە كتێبەكەیدا (الرد علی الرافضة) لە (باسی: وصیەت لەسەر خەلافەت) پاش نەقڵ كردنی فەرموودەیەك لە شێخ موفیدەوە دەربارەی دوودڵی پێغەمبەر لە ڕاگەیاندنی خەلافەت بۆ عەلی لە ترسی هاوەڵان: " هەر كەسێك لە شیعەكان بڕوای وابێت شتی وا ڕاستە ئەوا لەناوچووەو بەسزای خۆی دەگات... چونكە بڕوابوون بەشتێك پێچەوانەو دژ بە كتێبی پیرۆزی خوای گەورە كە قورئانە و فەرموودەی موتەواتر(*) كوفرە، لەو بانگەشەیدا درۆ هەڵدەبەستن بۆ خواو پێغەمبەرەكەی و هەر كەسێكیش ئەمە بە حەڵاڵ و ڕەوا بزانێت بێگومان كوفری كردووە ". لە (باسی: نكۆڵی لە خەلافەتی خەلیفەكان) وتویەتی: "نكۆڵی كردن لە شەرعیەتی خەلافەتی خەلیفەكان دەبێتە هۆی ئەوەی كە حوكمی لاسار و فەرمانشكێن بدرێت بەسەر ئەوانەی كە بەیعەتیان دا بە ئەبوبەكری صەدیق، ئەوەی بەیعەتیشی پێدابوو هاوەڵان بوون، بڕوا بوون بەوەی هاوەڵان لاسارو فەرمانشكێنن دژی ئەو فەرمایشتەی خوای پاك و بەرزە: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران: ١١٠. واتە: ("بەڕاستی" ئێوە چاكترین ئوممەتێكن كە (بۆ

سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە). هەر کەسێ بۆچوونێکی پێچەوانەی کتێبی پیرۆزی خوای گەورەی هەبوو ئەوا بێ باوەڕی و کوفری کردووە".

لە (باسی: تانەو تەشەر لە هاوەڵان دان) وتویەتی: " کەسێك تانەو تەشەرە لە کەسێك بدات کە خوای گەورە لێی ڕازبووە ئەوا جەنگی ڕاگەیاندووە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی. هەر کەسێ تانەو تەشەر بدات لە هاوەڵێك ئەوا پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورە جوڵاوەتەوە کە فەرمانی کردووە بە ڕێزگرتنیان، هەر کەسێك بیرو بۆچوونی خراپی لەبارەی هاوەڵان هەبێت ئەوا خوای گەورەی بەدرۆ خستۆتەوە لەوەی کە هەواڵی داوە هاوەڵان تەواو و کامڵن و ئەوەی خوای گەورە بەدرۆ بخاتەوە ئەوا بێ باوەڕە " لە (باسی: بانگەشەیان کە قورئانی پیرۆز کرچ و کاڵی تێدایە) وتویەتی: " هەر کەسێك قورئان بەتەواو و کامڵ و دوور لە کەم و کورتی نەزانێت و بڕوای بەشتی وا هەبێت کە شایەنی قورئانی پیرۆز نەبێت ئەوا بەڕاستی کوفرو بێ باوەڕی کردووە ".

هەروەها لە (باسی: پلەوپایەی ئیمامی عەلی) دا وتویەتی: " هەر کەسێ گومانی ئەوە ببات کە جگەلە پێغەمبەران کەسێك هەیە لە ئاست پێغەمبەران یان گەورەترو چاکتر بێت ئەوا کوفری کردووە ". لە (باسی: تانەو تەشەرەدانیان لە عائیشە)دا ووتویەتی: "تانەو تەشەرەدان لە عائیشە بێ باوەڕی و هەڵگەڕانەوەیە و حەد لێدەرکردنی تەنها بە جەڵدە بەس نیە چونکە تانەو تەشەرە دان لە عائیشە بریتیە لە بە درۆخستنەوەی حەقدە ئایەت لە قورئانی پیرۆزدا، پێویستە کەسی تانەدەر بکوژرێت بە حوکمی کەسی هەڵگەڕاوە، کەسێك قورئان بەدرۆ بخاتەوە بێ باوەڕە تەنها بە شمشێر هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت و لەگەردنی دەدرێت ".

* (التواتر)، لە زمانەوانیدا بریتیە لە: بەدوای یەکدا هاتن، دەڵێیت: (تواتر المطر) واتە: بارانەکە بەدوای یەکدا دەهاتە خوارەوە، موتەواتر: ناوی کارایە(اسم فاعل) کە لە تەواترەوە هاتووە، بریتیە لەو کەسەی کە بەدواداچوون دەکات.

فەرموودەی موتەواتر لە زاراوەی فەرموودەناسان دا: بریتیە لەوەی کە ژمارەیەکی زۆر کەس فەرمایشتێك دەگێڕنەوە بەجۆرێك کە بەهەموو شێوەیەك دوورە لە نەریت و عادەت ئەمانە لەسەر درۆ کۆببنەوەو هەر لەسەرەتای سەنەدەکە تا کۆتاییەکەیشی پشتی بەستبێت بەشتێکی بەرهەست (بەرهەست وەك: بیستن و هاوشێوەکانی). (بۆ ئەم پێناسەیە کەم و زۆر سوودم بینیوە لە: مباحث في علوم الحدیث: مناع القطان. وەرگێڕ)

به پشت بەستن بەو هۆكارە ناوبراوانە لەبارەی شیعەكان دەڵێت: " من كەسێك بەبێ باوەڕ نازانم كە لەلایەن خوای گەورە موسڵمان بێت و كەسێك بە موسڵمان نازانم كە بێ باوەڕ بێت، بەڵكو كەسێك بێ باوەڕ بێت لەلایەن خوای گەورە ئەوا بەبێ باوەڕی دەزانم، ئەو بۆچوونەی كە لەلایەن زانایانەوە بەڕێگەیەكی ڕاست چەسپاوە كە ئەهلی قیبلە تەكفیر ناكرێن، ئەو حوكمە بەوە دەبەسترێتەوە كە كەسێك دەچێتە ناو خانەی ئەهلی قیبلە: كە بیدعەتێك نەكات ببێتە هۆی تەكفیر كردنی، چونكە زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە هەر كەسێك بیدعەتێكی تەكفیری بكات ئەوا پێویستە تەكفیر بكرێت، گومان لەوەدا نیە كە بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەری خوا ~ كوفرە، نەزانی لەو شتانەدا بە پاساو ناشێت "[1].

شێخ موحەمەد شیعەكانی بە هاوبەشدانەر داناون، بە پشت بەستن بە فەرمایشتێك لە بارەی ئەوانەوە كە لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) گێڕدراوەتەوە كە لەو فەرمایشتەدا دەڵێت: " ئەی عەلی لە ناو ئوممەتی مندا كۆمەڵێك دەردەكەون بانگەشەی خۆشویستنی ئالوبەیت دەكەن، نیشانەیەكی ناشرینیان هەیە كە ناوی دەنێن (الرافضة)، لەگەڵیان بجەنگە ئەوانە هاوبەشدانەرن "[2].

(١) محمد بن عبدالوهاب، الرد على الرافضة، مطلب السب.

(٢) شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب تۆمەتەكانی لەسەر ئەو فەرموودەیە بنیاتناوە كە لەسەر ئەوەش شیعەی تەكفیر كرد، لەسەر قسەی هەندێ نووسەر و موتەكەلیمەكانی ئیمامی پێشوو وەك موفید و صدوق و كشی و حلی، هەندێ ڕیوایات كە بوونیان هەیە لە كتێبەكانی فەرموودەو كەلامی ئەواندا كە هەر هەمووشیان بە ڕاست و دروست نەزانیوە.

## بەپاساو دانەنانی نەزانین (الجهل) و مەرجەکانی لایەنگیری سیاسی

شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب هەشت مەرجی دانان بۆ ئیمان، خۆشویستن و دڵسۆزی (الولاء) خۆبەری کردن (البراء) لە ڕیزی ئەو مەرجانەبوون، بۆیە ڕازی نەبوو لەوەی خەڵکی تەنها بە تیۆری بڕوا بێنن بە فیکرەکەی، کە تەنها بریتی بێت لە خۆ دوورگرتن لە هاوارکردنە ئەولیا و پیاوچاکان یان سەردانکردنی گۆڕیان و شەفاعەت لێ خواستنیان، بەڵکو شێخ داوای لێکردن کە بڕوای خۆیان بسەلمێنن و بیکەن بە هەڵوێستێکی کرداری و بچنە ڕیزەکانی شێخەوە. شێخ هەموو ئەو کەسانەی دوودڵ بوون لەمەدا یان هاو هەڵوێستی موشریکانی هەبوو، ئەوا تۆمەتباری کردن بەوەی ئەوانیش بێ باوەڕن. شێخ لە پەیامەکەیدا بۆ شەریفی مەککە وتویەتی کە هەتا ئەو کەسانەش تەکفیر دەکات کە (یەکتاناسی) دەناسن و ئاشکراشی دەکەن و دانیش دەنێن کە بڕوابوون بە دارو بەرد و مرۆڤ هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا، بەڵام بەڕووی یەکتاناسیەوە ناهێن و ناچنە ناو چوارچێوەکەی و هاوبەشدانان فڕێنەدەن. شێخ ئەوەش تەکفیر دەکات کە کۆچ بۆلای شێخ ناکات بەڵکو پێی چاکترە کە لەگەڵ خەڵکی شارەکەی بمێنێتەوەو هاوشان لەگەڵیاندا جەنگ بکات. شێخ کافرو بێ باوەڕی پێناسە کردووە: " ئەو کەسەیە کە ئایینی پێغەمبەری ناسیوە کەچی دژی وەستاوە و خەڵکی قەدەغە دەکات لەوەی بچنە

ناویەوە و دوژمنایەتی ئەو کەسانە دەکات کە شوێن ئایینی پێغەمبەر دەکەون".[1]

بەم شێوەیە دوای ئەوەی (شێخ موحەممەد) گەیشت بە تیۆرە تایبەتی و نوێیەکەی لە بارەی (یەکتاناسی) لە پەیامێکی کراوەیدا کە بۆ ناوچەکانی دەورووبەری نارد:(ریاض و منفوحة و درعیة و حریملا)، لە کاتێکدا کە لە (عیینە) بوو ڕایگەیاند: " لە بارەی خۆمەوە پێتان ڕادەگەیەنم.... من لەو کاتدا مانای (لا اله لا الله) نەمدەزانی و دینی ئیسلامم نەدەناسی، بەر لەوەی خوای گەورە ئەو چاکە گەورەیەم لەگەڵ بکات، بەهەمان شێوە هیچ یەکێك لە شێخەکانم ئەمەی نەدەزانی. هەر کەسێك لە زانایانی (عارض) گومانی ئەوە ببات کە مانای (لا اله الا الله) و مانای ئیسلامی زانیوە بەرلەو کات یان گومان ببات کە یەکێك لە شێخەکانی ئەوەی زانیوە، بێگومان درۆی کردووە و ڕاستی لە خەڵکی شێواندووە و ستایشی خۆی کردووە بە شتێك کە تیایدا نییە "[2].

بەهەمان شێوە شێخ وتویەتی: "" الله... الله... بەندەکانی خوا!.. لەخۆتان بایی مەبن و هەڵمەخەڵەتێن بەو کەسەی مانای (لا اله الا الله) نازانێت و بەبێ ئەوەی هەست بکات لە شیرکەوە گلاوە، من زۆربەی ژیانی خۆمم بەسەر برد کەچی ئەو جۆرە شیرکانەی ئەمرۆ دەیزانم پێشتر نەمدەزانی، سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر ئەو زانیاریانەی بەئێمەی دا لە بارەی ئاینی خۆی" [3].

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ٢٩٩ و ٣٠٤، بێگومان شێخ مەبەستی لە ئایینی ئیسلام: تێڕوانینی وەهابیەتە بۆ یەکتاناسی.

(٢) إبن غنام: تأريخ نجد٣١٠، لە نامەیەکدا بۆ دادوەری درعیە شێخ عەبدوڵڵای کوڕی عیسا.

(٣) إبن غنام: تأريخ نجد ٣١٤.

ڕەخنەگرتن لە زانایانی سەردەمی خۆی وتویەتی: " خوای پاك و بەرز هەندێ لە نور و ڕوناکایی پێغەمبەرایەتی بۆ ئێمە دەرخست لەو سەردەمەدا و بەوهۆیەوە شتێکی لە ئیسلام فێری خەڵکی کرد، ئەوەشی ڕوون کردەوە کە کەسانێ بوونەتە دەمڕاستی خەڵکی کە لە نەزانترین کەسانی سەر ڕووی زەوین و لە دوورترین خەڵکی لە ناسینی ئەو پەیامەی موحەمەد ~... بانگەشەی ئەوە دەکەن کە شەرعزانن کەچی چەند قسەیەکی شەرعزانان نەبێ هیچی تر لە ئایین نازانن... بەڵام ئەو زانستەی کە خوای گەورە لە ڕێی موحەمەد ~ ناردوویەتی ئەوا هیچ هەواڵێکی لەبارەوە نازانن و شارەزانین لەهەمبەر سەرچاوەو شوێنەوارەکانی.... ئەوانەی گومانی ئەوە دەبەن کە زانان ئەوا زۆر بەسەختی نکۆڵیان لە ئێمە کرد کاتێك ئەو قسەیەی ئێمەیان بیست، تەنانەت گومانی ئەوەیان بردووە کە گوێبیستی ئەو قسانە نەبوونە پێشتر لە شێخەکانیان. کە ئەم بانگەوازە دەرکەوت تێکۆشان لە دژایەتی کردنی و هەوڵدان بۆ کپ کردنی بەوەی لە دەستیان هات چ بە هێزی بازوو یان بە زمان"[١].

پەیامێکی نووسی بۆ شێخی خەڵکی (رغبة) ئەحمەدی کوڕی یەحیا، تیایدا وتویەتی: "ئەم فیتنیەی کە ڕوویداوە لە بابەت لاوەکیەکان نییە بەڵکو لە شایەتماندایە (لا اله الا الله)"[٢]، " هەر کەسێ بە شەو و ڕۆژ خوای گەورە بپەرستێت، دواتر دوعا لە پێغەمبەرێك یان وەلیەك بکات لەلای گۆڕەکەی، ئەوا دوو خوای پەرستووە، و شایەتی نەداوە کە تەنها خوای گەورە شایەنی

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ٤١٣_٤٢٠.

(٢) إبن غنام: تأريخ نجد ٣٥٢.

پەرستنە، چونکە هەر خوای گەورەیە کە (بانگ و هاواری دەکرێتێ)... ئەم جۆرە شیرك و هاوبەش دانانە ئەمڕۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوای زەوی داگیر کردووە، تەنها ئەو کەسە نامۆیانە ڕزگاربوونە کە لە فەرموودەکەدا هاتوون (ئای کە ژمارەیان چەند کەمە) "[١].

پەیامێکی نارد بۆ دادوەری (ریاض) شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمان، تیایدا وتویەتی: ".. تا ئێستا، خۆت و باوکت، لە مانای شایەتمان (لا اله الا الله) نازانن... ئەوەت بۆ ڕوون دەکەینەوە، بەڵکو تەوبە دەکەی دەگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و دێیتەوە ناو بازنەی ئیسلام، ئەگەر خوا ڕێنماییت بکات... بەڵام تۆ پیاوێکی نەزان و هاوبەشدانەری و ڕق و کینەت هەیە دژ بە دینی خوای گەورە و ڕاستی دەشێوێنی لەو نەزانانەیت کە ڕقیان لە دینی ئیسلامە و دینی باب و باپیرانیان و شیرکیان خۆشدەوێت "[٢].

شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب هەڵسا بە تەکفیر کردنی هەندێ خەڵکی بە دەستنیشان کراوی، بەشێوەیەك ڕایگەیاند کە ڕێزدار و دونیا بەکەم زان و شێخە سۆفیە زیندووەکان بێ باوەڕن، ئەوانەی موسڵمانان نەزریان بۆ دەکردن و داوای نزاو دوعایان لێدەکردن بۆ چارەسەری نەخۆشەکان و لاچوونی تەنگ و چەڵەمە، وەك (ئال شەمسان و تاج و حەطاب و طالبی

(١) لە پەیامێکدا بۆ شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی ڕەبیعە، (مطوع أهل ثادق. ابن غنام: تاريخ نجد ٣٤٢).

(٢) إبن غنام: تأريخ نجد ٢٩٩ و ٣٠٤، بێگومان شێخ مەبەستی لە دینی ئیسلام: تێڕوانینی وەهابیەتە بۆ یەکتاناسی.

حەمضي و حوسەین و ئیدریس) لەلایەن شێخەوە ئەوانە وەك هاوبەش وان بۆ خوای گەورە لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی لە دیدی موسڵمانان[1].

شێخ هەموو ئەو کەسانەی گومانیان هەبووە لە بێ باوەڕی ناوبراوان بە بێ باوەڕو لاساری داناون، لەوبارەوە شێخ وتیەتی: " ئەگەر ئەوەت زانی ئەو تاغوتانەی کە خەڵکی (الخرج) و جگەلەوانیش بڕوایان پێی هەیە... هەموویان بێ باوەڕی هەڵگەڕاوەن لە ئیسلام، هەر کەسێك مشتومڕ لەجێگەی ئەوان بکات یان سەرزەنشتی ئەو کەسەی کرد کە تەکفیریان دەکات یان وا گومان ببات کە ئەو کردەوەی ئەوان (نەزر و شەفاعەت لێخواستن و داواکردنی دوعا...هتد[2]) ئەگەر پوچیش بێت ئەوا نابێتە هۆی بێ باوەڕ بوونیان. جا کەمترین حاڵەتی ئەو کەسەی لەسەریان دێتەگۆ، بریتیە لەوەی کە لاسارە و شایەتی لێ وەرناگیرێت و نوێژ لەدوای دروست نییە، تەنانەت دینی ئیسلام دروست نییە تەنها بەخۆ بەری کردن نەبێت لەو کەسانە و تەکفیر کردنیان "[3].

هەروەها شێخ وتویەتی: " بەڵام قسە کردن لەسەر تاغوتەکان وەك (ئیدریس) و (ئال شەمسان) درێژە دەکێشێت و کاتێکی زۆری پێویستە... کۆدەنگی هێناوە لەسەر ئەوەی هەر کەسێ بە ئەندازەی دە یەکی ئەو تاغوتە

---

(١) إبن غنام: تاريخ نجد ٤٧٤ _ ٤٧٥.

(٢) وەرگێڕ.

(٣) إبن غنام: تاريخ نجد، ٣١٠ و بەهەمان شێوە وتویەتی: " ئەو تاغوتانە کە خەڵکی (خرج)ن تەکفیرمان کردن بەهۆی ئەو کارانەی کە دەیکەن، وەك: باو باپیرانیان وەك هۆکار و ڕاسپێراو دادەنا و بانگی خەڵکیان کرد بۆ بێ باوەڕی و ڕقیان لە ئایینی پێغەمبەر ~ دەبێتەوە و گومان دەبەن کە دانیشتوانی (عارض) بێ باوەڕ بوون کاتێك وتویانە: تەنها خوا شایەنی پەرستنە ". سەرچاوەی ناوبراو ٣٠٤.

هەڵسوکەوت بکات ئەوا بێ باوەڕە و خوێن وماڵی حەڵاڵە، بەڕاشکاوانە شێخ دەری بڕیوە هەر کەسێ گومانی هەبێت لە بێ باوەڕی ئەوان ئەوا ئەویش بێ باوەڕە چ جای ئەوەی کە ستایشیان بکات و پێیا هەڵبدات؟... بێ باوەڕی ئەو کەسانە شتێکی گومان هەڵنەگری موتەواترە لەلایەن چینی تایبەت و چینی گشتی لە پیاو و ئافرەتان، تەنانەت ئەوان ئێستا دەپەرسترێن و بانگی خەڵکیش دەکەن بۆ ئەم کارە "[1] و شێخ هیچ شتێکی لە دوودڵی هەست پێنەکرد لە تەکفیر کردنی دادوەری (ریاز) سولەیمانی کوڕی سەحیم و هاووێنەکانی بە شتێکی بچوك ئەویش لەبەر ئەوەی دژەڕای شێخ بوو و تێڕوانینە تایبەتیەکەی شێخ موحەمەدی بۆ هاوبەشدانان و یەکتاناسی ڕەتکردەوە.

کاتێك هەندێ لە شوێنکەوتووانی شێخ دەستیان هەڵگرت لە مەسەلەی تەکفیر کردنی تێکڕای موسڵمانان یان تەکفیر کردنی کەسی دەستنیشان کراو، بابەتەکەیان خستە بەردەمی شێخ کە کاتێك بەڵگە لەسەر کەسەکان بەرپا دەبێت و پرسیاریان لێکرد لە بارەی ئەو وتەیەی شێخ ئیبن تەیمیە: (هەر کەسێ نکۆڵی کرد لەو شتەی پێغەمبەر هێناویەتی و دواتر بەڵگەی لەسەر بەرپا بوو ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە) شێخ وەڵامی دانەوە بەوەی: " ئەو وتەیەی شێخ ئیبن تەیمیە: (هەر کەسێ نکۆڵی کرد لەوە و بەو شێوەیە..) و ئێوە گومانتان هەیە لەوەی کە تاغوت و شوێنکەوتوانیان: ئایا بەڵگەیان لەسەر بەرپا بووە؟ یان نا؟ ئەمە بەڕاستی شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە، چۆن گومانتان لەوە دەبێت کە چەندین جار ڕوونم کردۆتەوە بۆ ئێوە؟! ئەوەی بەڵگەی لەسەر بەرپا نەبووە ئەو کەسەیە کە تازە موسڵمان بووە و لە لادێی

---

(١) ابن غنام، تاريخ نجد ٤١٣ _ ٤٢٠.

دوور پێگەیشتووە یان کوفرەکەی لە بابەتێکی شاراوەبێت... بەڵگەی خوای گەورە قورئانە، هەر کەسێك قورئانی پێگەیشت ئەوا بەڵگەی لەسەر بەرپا بووە، بەڵام بنچینەی کێشەکە ئەوەیە کە ئێوە جیاوازیتان نەکردووە لەنێوان بەرپا بوونی بەڵگە و تێگەیشتنی بەڵگە، زۆربەی بێ باوەڕان و دووڕووەکان لە بەڵگە تێنەگەیشتن کەچی بەڵگەشیان لەسەر بەرپابوو... ئەگەر ئەوەتان زانی ئەوا ئەوەی ئێوە تیایدا بەگومانن، کە بریتیە لە گومان هەبوون لە خەڵکانێك کە تاغوت پەرستن و دژایەتی "دینی ئیسلام" دەکەن چونکە وا دەزانن کە هەڵگەڕانەوەیە ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی لێی تێناگەن، هەموو ئەو شتانە زۆر دیارو ڕوونن "[1].

کاتێك هەندێ خەڵکی لەلایان گرانبوو کە قبوڵی پرۆسەی تەکفیری گشتی بکەن کە وەهابیەت پێی هەڵدەستێت، شێخ لەوباریەوە وتی: "پێم گەیشتووە ئێوە هەڵساون بەم کارە و دواتر وازتان لێهێناوە.... وای لەو کارە خراپە گەورانەی کە لە شارەکەتاندا ئەنجام دەدرێت کەچی پێچەوانەی بنەمای ئیسلامە بریتییە لە: (شایەتی دان کە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێت جگەلە خوای گەورە و موحەمەدیش نێردراوی خوایە)، لەو کارە خراپە گەورانە: بتپەرستی هەر لە مرۆڤ پەرستی تا بەردپەرستی، فڵانە نەزر بۆ ئەوە دەکات و فیسارەش قوربانی دەکات، یەکێکی تر داوای وەڵام دانەوەی نزا و دوعاکان دەکات و هاوار کردن بەتامەزۆرییەوە، یەکێکی تر کە ناچارە لە وشکانی و دەریایی لە فڵانە دەپاڕێتەوە و یەکێکی تر گومان دەبات کە ئەگەر پەنا بۆ فیسارە ببات ئەو لە دونیا و دواڕۆژدا سوودی پێ دەگەیەنێت.... جا

---

(١) ابن غنام: تاريخ نجد ٤١٣ _ ٤٢٠.

ئەگەر ئێوە گومان دەبەن کە ئەمە ئەو بتپەرستی و پەیکەر پەرستیە نییە کە لە قورئانی پیرۆزدا ناویبراوەو سەرزەنشتی کراوە ئەوا بەڕاستی شتێکی سەرسام کەرە". [1]

شێخ کاتێك کە لە (عەیینە) بوو لە پەیامێکی دا بۆ دادوەری (دڕعیە) شێخ عەبدوڵلای کوڕی عیسا و کوڕەکەی نووسیویەتی: " بۆم باسکراوە کە ئێوە نیگەران و بێزارن، لێت ناشارمەوە کە من زۆر نیگەران و بێزارم و ڕەخنەی گەورەترم گرتووە لە ئێوە کە گەورەترە لە نیگەرانی و بێزاری.... پێم وتراوە: ئێوە ڕەخنەم لێدەگرن بەوەی هەندێك توندم، کەچی شتەکە توندترە لەوەی باسمان کرد، لەبەر ئەوەی خەڵکی تا ئێستا دینی پێغەمبەریان نەناسیوە و شتێك بەناپەسەند دەزانن کە پێشتر هۆگری نەبووبن، ئەگەر لەبەر ئەوانە نەبوایە ئەوا کار بەشێوەیەکی تر دەبوو. بەڵام سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق تەنها ئەو نەبێت، ئەگەر خەڵکی ئەوەیان زانیبوایە ئەوا فەتوام دەردەکرد بە حەڵاڵ کردنی خوێنی ئیبن سەحیم (دادوەری ڕیاز) و هاووێنەکانی، فەرزبوونی کوشتنیان، هەروەك زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوونە و من یەك بەخۆم (واتە شێخ موحەممەد[2]) هیچ بەخەجاڵەت و نادروست نابینم. بەڵام ئەگەر خوای گەورە ویستی بوو کە ئەو کارو بانگەوازە تەواو ببێت ئەوا شتانێ ڕوون دەبنەوەو دەردەکەون کە بە خەیاڵیشتان دا نایەت ". [3]

---

(١) إبن غنام: تاريخ نجد، لە پەیامێکی شێخدا بۆ ئیبن عەبدوڵەتیف ٢٢٣.

(٢) وەرگێڕ.

(٣) ‘بن غنام: تاريخ نجد ٣٢٧.

بەهەمان شێوە موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب پەیامێکی توونـد و تیژی نارد بۆ یەکێك لە قوتابیەکانی لە (ئەحساء) کە ناوی شێخ ئەحمد عەبدولکەریم بوو، دوای ئەوەی کە پاشگەزبووەوە لە تەکفیر و ئالۆزی و کێشەی بۆ دروست ببوو ئایا تەکفیری ئەوانە بکات کە دژمڕای وەهابیەتن یان نا، شێخ موحەممەد لە پەیامەکەیدا وتویەتی: " لەخوای گەورە داواکارین کە ڕێنموویت بکات بۆ ئیسلام... هاوەڵانی خراپ سەریان لێ شێواندی، هەروەك ئەمە پیشەو کارو نەریتیانە، تۆ _ پەنا بەخوا _ پلە بەپلە دادەبەزی یەکەم جار بۆ ناو گومان و شاری هاوبەشدانان، دواتر پشتگیری کردنیان و نوێژ ئەنجامدان لە دوایان و خۆبەری کردنت لە "موسڵمانان" بریتیە لە ڕووخۆشی نواندنت بۆیان، دوای ئەمە (ابن غنام) و جگە لەویت لەکەدار کرد و پشتی ئەوانت لە زەوی دا و تەختت کردن و خۆت بەری کرد لە "میللەتی ئیبراهیم" و میللەتی ناوبراوت کرد بە شایەت بەسەر خۆتدا بەوەی شوێنی "هاوبەشدانەران" کەوتی بەبێ ئەوەی ناچارت بکەن بەڵکو لە ترسان و تەنگ هەڵ چینینەوە بوو.

بەبیری خۆت بێنەوە کە وتەیەکی شێخ (ئیبن تەیمیە)ت دەست کەوت کە کێشەکەی تۆی چارەکرد و لایبرد. دەربڕینەکەش ڕاشکاو و ڕوونە کە کەسانی وەك (ئیبن فەیروز) [1] و صاڵحی کوڕی عەبدوڵڵا و هاوێنەکانیانی تەکفیر

(١) ئیبن فەیروز بریتیە لە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا، شێخ لە شوێنێکی تر لەبارەی ئەوەوە وتویەتی: " کە نزیکترینیانە لە ئیسلامەوە، یەکێکە لە حەنبەلیەکان و بەتایبەتی شوێن قسەی شێخ ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم دەکەوێت و بەهی خۆی دەزانێت، سەرباری ئەمەش کتێبێکی داناوە و بۆ ئێمەی ناردوومو تیایدا دانی ناوە بەوەی کە ئەو هەڵسوکەوتانەی لەلای گۆڕی (یوسف) و هاووێنەکانی دەکرێت ئەمە خودی دینە " ابن غنام: تاریخ نجد ٣٣٧.

کردووه به کوفرێکی ئاشکرای دەرخەر لە بازنەی ئوممەت، سەرباری ئەوانەی تر "[1].

شێخ وتویەتی: " هەر کەسێك تەکفیری (هاوبەشدانەران) نەکات یان گومانی هەبێت لە بێ باوەڕ بوونیان یاخود مەزهەبیان بەڕاست دابنێت ئەوا کوفری کردووە... جیاوازی نییە لە نێوان ئەو هەڵوەشێنەرەوانە چ ئەوەی گاڵتە دەکات یان ئەوەی بەڕاستی ئەوە بکات یاخود بکەرەکە ترساو بێت یان ناچارکراو بێت "[2] یان " هەر کەسێ تەکفیری (هاوبەشدانەران) نەکات یان گومانی هەبوو لە بێ باوەڕیان یان مەذهەبیان بەڕاست دابنێت ئەوا ئەویش بێ باوەڕە "[3].

---

(١) ابن غنام: تاريخ نجد ٣٤٣ و ٣٤٥.

(٢) موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، پەیامی سێیەم لەسەر هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، مجموعة التوحيد، کەناسراوە بە: مجموعة التوحيد النجدية ١٧٨.

(٣) الدرر السنية، ٢/٣٦٠.

## نامۆیی ئیسلام و موسڵمانان

شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب پرۆسەی تەکفیری تێکڕایی موسڵمانان و تۆمەتبار کردنیان بەشیرك و هاوبەشدانان پاساو دارکرد بەوەی پشتی بەست بە چەند فەرموودەیەك کە ئاماژە دەدەن بە نامۆیی ئیسلام لە کۆتا سەردەمدا و لاڕێ بوونی هەتا هەتایی ئوممەتی ئیسلامی، شێخ لەوبارەوە وتویەتی: "ئەوەی ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر نامۆیی ئیسلام ئەو هەواڵەیە کە ڕایگەیاندووە دیاردەی هاوبەشدانان دەکەوێتە ناو ئوممەت (حتى تعبد فئام من أمتي الأوثام) واتە: هەتا کۆمەڵانێك لە ئوممەتەکەم پەیکەرەکان دەردەهێننەوە. (تدور رحى الاسلام لخمس و ثلاثين أو ست و ثلاثين أو سبع و ثلاثين، فان يهلكو فسبيل من هلك، و ان يقوم لهم دينهم يقم تسعين عاما) [١]

---

(١) شێخ پ. د. موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای مەسعەری لە کتێبەکەیدا بەناوی (الملكية الوراثية ٢٧)دا لەبارەی ئەم فەرمووده بەدواداچوونێکی فراوانی کردووەو دەڵێت:( ئەم فەرموودەیە کە ئیبن مەسعود گێڕاویەتیەوە لە موسنەدی ئەبی یەعلادا بەسەنەدێکی صەحیح هاتووە و شێخ حوسەین ئەسەد وتویەتی:"سەنەدەکەی صەحیحە". لە سونەنی ئەبوداود و موسنەدی ئیمامی ئەحمەد و موستەدرەکی حاکم دا بە چەندین ڕێگە (طرق) هاتووە و حاکم لەو بارەوە وتویەتی:" لەسەر مەرجەکانی موسلمە ". زەهەبی لە (التلخيص) دا وتویەتی: "بەچەند سەنەدێکی صەحیح هاتووە لە موسنەدی ئەبو داودی طەیالیسی و لە عیلەلی دارقیتنی ". لە "معجم الكبير" و موسنەدی بەزاریشدا هاتووە.

مەسعەری دەڵێت: ئەوە گێڕانەوەیەکی موتەواتیرە لە ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) کە هاتنی فەرموودەکە لەلایەن ئەوەوە هیچ گومانێکی تێدا نییە، ئیبن مەسعود فەرموودەکەی بەرز (رفع) کردۆتەوەو داویەتیە پاڵ پێغەمبەر ~ بەشایەتی سێ گێڕەرەوە. دروست نییە هیچ گومانی

واتە: ئوممەتی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی بەردەوام دەبێت لەگەڵ ئەوەی بە هێزو تواناداره و جەنگ دەكات لەگەڵ دوژمنە بێ باوەڕە جەنگاوەرەكان بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ (یان سی و شەش ساڵ یاخود سی و حەوت ساڵ)، دوای ئەمە شتێكی نەویستراو و خراپی زۆر گەورە ڕوودەدات، جا ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی مایەوە و دانەڕووخا و لەناونەچوو بەشێوەیەكی گشتی، ئەوا بەهێزو تواناوە دەمێنێتەوەو جەنگ دژ بە دوژمنە بێ باوەڕە جەنگاوەرەكان دەكات، بۆ ماوەی حەفتا ساڵ بەلایەنی كەمەوە پاش ڕوودانی شتە نەویستراو و خراپە گەورەكە[1].

دوای ئەوەی كاتێكی درێژ دوای ئەوان تێپەڕی، كتێبەكانیان كەوتە ناو دەستی خەڵكانێكی نەفام و نەزان دووبارە گەڕانەوە سەر ئەو شتانەی كە پێشتر (بیدعەتچیەكان) لەسەری بوون لە زۆری و بۆری هاوبەش دانان لەناو لادێ و شارەكان، گەیشتنە ئەو ئاستەی كە هیچ لەبارەی یەكتاناسیەوە نازنن تەنها ئەوەنەبێت كە ئەشعەرییەكان بانگەشەی بۆ دەكەن... تا وای لێهات زانست و زانیاری لە بیركرا و هاوبەش دانان و بیدعەت هەموو كون و كەلەبەرەكانی گرتەوە بەشێوەیەكی گشتی تا سەدەی دوانزەهەم، جا نەزانراوە

---

بمێنێ لە صەحیح بوونی فەرموودەكە لە پێغەمبەرەوە ~ و هەروەك دەزانین كە دوو ڕێگەی مەسروق و ئەبی ئەحوەص گومانیان لە ژمارەكەشدا نەهێشتووە (بەوەی سی و پێنجە)، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە گێڕەرەوەكان گومانیان لە ژمارەكەدا بۆ دروست بووە). بەپوخت كردنەوە هێناومانە. (وەرگێڕ).

(١) بۆ لێكدانەوەی ئەم فەرموودەیە سوودم بینیوە لە سەرچاوەی پێشوو، هەمان لێكدانەوەی شێخ مەسعەریم هێناوە بەبێ دەستكاری تەنها ئەوە نەبێت كە بەكوردیم كردووەو بەس. (وەرگێڕ).

کە زانایەك نکۆڵی کردبێت لە شیرك و بیدعەتێك و لەو شتانەی کە لە کۆتایی ئەم ئوممەتە پەیدابوونە "[1].

بەهەمان شێوە شێخ پشتی بە فەرموودەیەکی ئیبن مەسعود بەستووە کە تیایدا هاتووە:(هیچ ساڵێك نییە کە ئەوەی دوای ئەو دێت خراپترە لەو، هیچ ساڵێك لە ساڵێکی تر بە فەڕو بەرەکەتتر نابێت و هیچ ئەمیرێك لەوەی تر باشتر نابێت، بەڵام زانا و پیاو چاکەکانتان نەمان و چوون، دەواتر کۆمەڵێك دێن شتەکان بە ڕاو بۆچوونی خۆیان دەپێون بەو هۆیەشەوە ئیسلام دادەڕمێت و پارچە پارچە دەبێت).

شێخ لە پەیامێکی دا بۆ شێخ عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵەتیف وتویەتی: " پێغەمبەری خواو هاوەڵانی... خەڵکی لەسەر دین ئارام ناگرن تەنها یەك لەدوای یەك نەبن، ئیسلام نامۆ دەبێت هەروەك چۆن بەنامۆیی هات... ئینجا مادام ئیسلام وەك سەرەتای هاتنی بەنامۆیی دێتەوە، ئەوا دەبێت ئەو کەسە چەند نەزان بێت کە بەڵگە بۆ ڕاستی تێڕوانینەکەی خۆی دێنێتەوە بە زۆری و بۆری شوێنکەواتووان و زاڵبوونیان "[2]، "با چیرۆکی سەلمانی فارسیتان لەلا گرنگ بێت، کە تیایدا هاتووە: خەڵکی لەسەر ئایینی پێغەمبەران نەبوون تەنها یەك لەدوای یەك نەبێت، تەنانەت کۆتا کەسیان لە سەرەمەرگدا وتویەتی: نازانم یەك کەس هەبێت لەسەر ڕووی زەوی لە سەر هەمان ڕێ و شوێنی ئێمە بێت، بەڵام هەر چەند سەردەمی پێغەمبەر ماوەکەی لە ئێستادا زۆرتر درێژبۆتەوە. لەگەڵ ئەوەدا فەرمایشتی خوای گەورە بیرە

---

(١) الدرر السنية ٢١٩/٢ _ ٢٢٠.

(٢) ابن غنام، تأريخ نجد ٢١٣.

خۆم دێنمەوە: ﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِنْ قَبْلِكُمْ أُولُو بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّنْ أَنْجَيْنَا مِنْهُمْ ﴾ واتە: (جا ئەوە بۆ لەناو خەڵکی زەمانی پێش ئێوەدا کەسانی ژیرو دیندار نەبوو، کە بەرگریان لە خراپەو تاوان بکردایە لە زەویدا، مەگەر کەمێك نەبێت لەوانەی کە ڕزگارمان کردن لێیان..)"[1].

شێخ لە پەیامێکی دا بۆ خەڵکی (حریملا) وتویەتی: " لە صەحیحەیندا[2] هاتووە: هەر لە هەزار کەسەوە نەوەدو نۆیان دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، لە هەر هەزار کەسەوە یەکێکیان دەچێتە بەهەشتەوە... ئیسلام بە نامۆیی هاتووە و بەنامۆییش دەگەڕێتەوە هەروەك سەرەتای هاتنی "[3].

شێخ ئەو فەرموودەیەشی خستە سەر وتەکانی کە باس لەوە دەکات ئوممەت پەرتەوازە دەبێت بۆ زیاتر لە حەفتا دەستە و کۆمەڵە کە هەموویان دەچنە دۆزەخەوە تەنها یەك دەستە و کۆمەڵە نەبێت، ئەم کارەی شێخ بۆ ئەوەیە کە ناوی جەماعەت بسڕێتەوە لەسەر ئوممەت و حەق لە کۆمەڵەکەی

(١) إبن غنام، تأريخ نجد ٢١٩.

(٢) واتە: صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم. (وەرگێڕ).

(٣) إبن غنام: تاريخ نجد، کوڕەزای شێخ موحەمەد، عەبدوڵەتیفی کوڕی عەبدوڕەحمان لە پەیامێکی دا جەخت لەسەر هەمان مانا دەکاتەوە کە بۆ موحەممەدی کوڕی سولەیمانی بەغدادی ناردوویەتی: هەروەك تیایدا دەڵێت: " هیچ یەکێك لە هاوبەشدانان لەو جۆرەی هاوبەشدانان ڕزگاری نەبووە تەنها کەسانێکی تایبەت و تاك و توکێکی نامۆ نەبن لە تێکڕای وڵاتاندا، ئەمەش ڕاستێتی ئەو هەواڵە دەسەلمێنێت کە پێغەمبەری ڕاستگۆ هەواڵی لەبارە داوە لەو فەرمایشتەی دا: (ئیسلام هات بە نامۆیی و دەگەڕێتەوە بە نامۆیی هەروەك چۆن سەرەتا هات) هەندێ چاکەکار وتویانە: ئیسلام لەو سەردەمەی خۆماندا زۆر نامۆترە لەو کاتەی کە سەرەتای هاتنی بوو " الدرر السنية ٤٩٢ – ٤٩٣، دەڵێت: " ئەو هاوبەشدانان و شیرکە ئەوەندە گەورەیە کە هاوبەشدانانی سەردەمی نەفامی عەرەب پێی ناگات " هەمان سەرچاو ٤٩٦.

خۆیدا کورت بکاتەوەو تەکفیری تێکڕای موسڵمانان ئاسانتر بکات[1].

شێخ بە مانایەکی تر جەماعەتی پێناسە کرد بەوەی: (خەڵکانێك لەسەر حەقن ئەگەرچی کەمیش بن)، جەختیش دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کەسانی نامۆ لە هەموو سەردەمێکدا کەمینەن، بۆیە شێخ بەیەکێك لە هاوەڵەکانی وت کە دوودڵ بوو: " بەڵکو تۆ لەو کۆسپ و چاڵانە ڕزگارت دەبێت کە زۆربەی خەڵکی تیایدا لەناوچوون ئەویش بریتییە لە لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی زۆرینە، هەڵاتنە لە کەمینە .... ئەگەر خەڵکی هەمووی لەسەر ناحەق و شتی پڕو پوچ و باتیڵ بوون تەنها یەکێکیان نەبێت ئەوا بەڕاستی زۆرینەکە ڕیزپەڕە و لاسارە نەوەك تاکە کەسەکە. خەڵکی لە سەردەمی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەموویان ڕیزپەڕبوون تەنها چەند کەسێکی کەم نەبن کە ئەوان بریتی بوون لە جەماعەت، دادوەرو موفتیەکان و خەلیفە و شوێنکەوتووانیان لەو کاتەدا هەموویان ڕیزپەڕبوون، ئیمامی ئەحمەد تەنها خۆی بریتیبوو لە جەماعەت "[2].

ئالێرەوە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە هەموو کتێب و نامەکانی دا وشەی "هاوبەشدانەران"ی بۆ تێکڕایی موسڵمانان بەکارهێنا، تەنانەت داواشی لە موسڵمانان کرد کە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ (یەکتاناسی). شێخ ناوی لە شوێنکەوتووەکانیشی نا "یەکتاناسان" و "موسڵمانان"[3].

---

(١) إبن غنام: تاريخ نجد ٢١٨.

(٢) كشك، محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٩٩.

(٣) محمد بن عبدالوهاب: تطهير الاعتقاد ٣٥.

## کاردانەوەی ئیسلامی

زۆرێك لە زانایانی نەجد تیۆرەکەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابیان ڕەتکردەوە لە تەکفیر کردنی ئەوانەی سەردانی گۆڕەکان دەکەن و دانانی ئەم جۆرە سەرەدانانە بە هاوبەشدانان، سەرباری ئەوەی هەندێ لەو زانایانە شوێنکەوتوو و لایەنگیری مەزهەبی حەنبەلی و سەلەفی و قوتابخانەی ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم بوون[1].

هەندێ لەو زانایانە وەك شێخ عەبدوڵا مویس و ئیبن ئیسماعیل و ئیبن عەبید حوکمی هەڵگەڕانەوەو دەرچوون لە ئیسلامیان دا بەسەر شێخ

---

(١) لە تووندترین ئەوانەی ئەمەیان ڕەت کردەوە بریتی بوون لەمانە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەری مویسی تەمیمی (-١١٧٥ك)، دادوەری شاری (حرمة)موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی فەیروز (١١٤٦ك – ١٢١٦ك) لە ئەحساء، سولەیمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەحیم (-١١٨١ك) لە ڕیاض، عەبدوڵای کوڕی عیسا و کوڕەکەی عەبدولوەهاب لە دڕعیە، کوڕی ئیسماعیل لە (ثرمدا)، ئەحمەدی کوڕی عەلی قەبانی بەصڕی و عەبدوڕەحمانی کوڕی ڕەبیعە لە (ثادق) و ئەحمەدی کوڕی یەحیا لە (رغبة) و موحەممەدی کوڕی سولەیمان لە (وثیثیة) و موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی عەفالق (-١١٦٤ك) و عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵەتیفی شافیعی ماموٚستای شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە ئەحساء. سەیفی کوڕی ئەحمەدی عوتەیقی (-١١٨٩ك) لە (حرمة) لە (سدیر) و عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەحیم لە (المجمعة) و (سەدیر) و عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەدوان (- ١١٧٩) لە (اثیثة) کە دەکەوێتە وەشم، و موڕیدی کوڕی ئەحمەدی وەهیبی تەمیمی (- ١١٧١ك) لە حریملاء و صاڵحی کوڕی عەبدوڵڵای صائغ (- ١١٨٣ك) دادوەری (عنیزة) و عەبدوڵڵای کوڕی داودی زوبەیری (- ١٢٢٥ك) و موحەممەدی کوڕی سولەیمانی کوردی (١١٢٧ - ١١٩٤) لە مەدینەی منەوەرە.

موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب و شوێنکەوتووانی دا، تەنانەت هەڵسان بە ڕەوانە کردنی پەیام بۆ شوێنەکان بەمەبەستی هاندانی تێکڕای موسڵمانان لە وەهابیەت و دژایەتی کردن و خۆبەری کردن لە هەڵگرانی فیکرەی وەهابیەت[1]، زانایانی ناوبراو ئەو کارەی شێخ موحەمەدیان بە ناپەسەند و دژێو زانی بەوەی تەکفیری موسڵمانان دەکات و جەنگ لەدژیان ڕادەگەیەنێت[2].

شێخ سولەیمانی کوڕی سەحیم زانای (ڕیاض) پەیامێکی نووسی لە دژی شێخ موحەمەد بۆ خەڵکی بەصرەو ئەحساء، لەو پەیامەدا هاتووە: "... کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت: خەڵکی لە وەتەی شەش سەدەیە لەسەر هیچ نین و بێ بڕوان. ئەوەی ڕاستی ئەوەش دەسەلمێنێت ئەوەیە کە کتێبێکم بۆ نێردراوە تیایدا هاتووە:(ئیعتراف دەکەم کە بەر لەوەی من بێم ئێوە نەزان و سەرگەردان بوون. لە گەورەترین ئەو شتانە ئەوەیە کە: هەر کەسێك ڕازی نەبێت لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە دەیلێین و شایەتی نەدات کە ڕاستن ئەوا بەبێ باوەڕی دادەنێت، بەڵام ئەوەی هەمان بۆچوونی ئەوی هەبوو و قسەکانی بەڕاست زانی؛ ئەوا دەڵێت: (تۆ یەکتاناسی). ئەگەرچی کەسەکە تەواو لاسار و خراپیش بێت... لەو شتانەی تری (شێخ موحەمەدی کوڕ عەبدولوەهاب)[3] ئەوەیە کە ئەوانە تەکفیر دەکات کە لەلامان گەورەن لە ئالی

---

(١) إبن غنام: تاريخ نجد ٢٥٣.

(٢) إبن غنام: تاريخ نجد ٤٥١.

(٣) وەرگێڕ.

پێغەمبەر، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەزر وەردەگرن، جا هەر کەسێکیش بەبێ باوەڕیان دانەنێت ئەوا ئەویش بێ باوەڕە لەلای ئەو[1]"[2].

بەڵام موحەمەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەفالق تەکفیر کردنی تێکڕای ئوممەتی بەتاوان هەژمار کرد لەسەر شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب[3]، لەوبارەوە وتویەتی: " ئەو پیاوە(واتە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب[4]) تێکڕای ئوممەتی تەکفیر کرد، بەڵکو سوێند بەخوا پێغەمبەرانی بەدرۆ خستەوەو خۆیان و گەلەکانیان بە هاوبەشدانەر دانا، سوێندێکی زۆر خراپی خوارد کە جولەکە و هاوبەشدانەران حاڵیان باشترە لەو ئوممەتە. ئوممەتی بەتێکڕایی تەکفیر کرد و ئەو کەسەشی تەکفیر کرد کە ئوممەت بە بێ باوەڕو سەرکەش نەزانێت "[5] بەهەمان شێوە عەلەوی حەداد وتویەتی: " ئەگەر کەسێك ویستی بچێتە ناو دینەکەی ئەوەوە[6]، ئەوا پێی دەڵێت: شایەتی بدە لەسەر خۆت کە بێ باوەڕ بوویت و شایەتی بدە لەسەر باوك و دایکت کە بە بێ باوەڕی مردوون و شایەتی بدە لەسەر فڵان و فسیسار

---

(١) واتە: لەلای شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب. (وەرگێڕ).

(٢) إبن غنام: تاريخ نجد ٢٧٠ _ ٢٧١.

(٣) عبد العزيز عبد اللطيف: دعاوى المناوئين لدعوة الشيخ محمد بن عبد الوهاب ٨١ و ٨٢.

(٤) وەرگێڕ.

(٥) عبد العزيز عبد اللطيف: دعاوى المناوئين لدعوة الشيخ محمد بن عبد الوهاب ١٦٣، دار الوطن، الرياض ١٤١٢.

(٦) واتە: ناو بانگەوازی وەهابیەت. بۆیە عەلەوی حەداد وشەی دینی بەکارهێناوە، چونکە وەهابیەکان تەنها خۆیان بە شوێنکەوتووی پێغەمبەر دەزانن و هەر بانگەوازی وەهابیەت بە ئایین دەزانن و وەهابیەت بە دەستەی ڕزگاربوو دادەنێن (وەرگێڕ).

زانا كە بێ باوەڕن، بەم شێوەیە.... ئەگەر شایەتی دا ئەوا قبوڵی دەكات ئەگەرنا دەیكوژێت و لەگەردەنی دەدات "[1]، دەوترێت ئەو (شێخ موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب) [2] فەرمانی دەكرد بەوەی كە ئەو موسڵمانانەی تازە هاتوونەتە ناو وەهابیەتەوە سەریان بتاشن هەروەك پێغەمبەری خوا ~ فەرمانی بە هاوبەشدانەران دەكرد كە دەهاتنە ناو ئیسلام سەریان بتاشن، دەیوت: " مووی بێ باوەڕی لەسەر خۆت فڕێدە"[3].

هەر ئەمەشە ئەو كارەی زانایانی حەڕەمەین (مەككەی پیرۆز و مەدینەی منەوەرە) تەفسیر دەكات كاتێك لە سەرەتای میرنشینەكەی شەریف مەسعودی

---

(١) عبد العزيز عبد اللطيف: دعاوى المناوئين لدعوة الشيخ محمد بن عبد الوهاب ١٦٥. زینی دەحلان لە (الدرر السنية في الرد على الوهابية) وتویەتی: وەهابیەكان هیچ كەسێك بە یەكتاناس دانانێن تەنها ئەو كەسە نەبێت كە شوێن بۆچوونەكانیان دەكەوێت، بۆیە بەپێی تێگەیشتنی ئەوان خەڵكانی یەكتاناس كەمینەیەكی كەمن، بەڕاشكاویش دەریان دەبڕی كە ئوممەت لەوەتی شەش سەدەیە بێ باوەڕە، ئەگەر موسڵمانێك چووە ناو ئایین و بانگەوازی ئەوان بەڵام بەر لەو كات حەجی كردبوو، ئەوا پێی دەڵێن: حەجێكی تر بكە چونكە حەجەكەی یەكەم كە كردووە لە كاتێكدا بووە كە تۆ هاوبەشدانەر بوویت بەوشێوەی یەكەم حەجت لەسەر لاناچێت. بگەڕێوە بۆ: دعاوى المناوئين ٥٠ و ١٦٦.

(٢) وەرگێڕ.

(٣) الحصين، احمد: دعوة الامام... سلفية لا وهابية، ٢٨٨. كە ئەویش لە كتێبی (الحق المبين في الرد على الوهابية المبتدعين ٤٥) وەرگرتووە. وە ئەو ووتەیەی شێخ حەسەن غەننام پشتی ئەو قسەیە دەگرێت كاتێك دەدوێت بۆ نمونە لەبارەی عیسای كوڕی قاسم و ئەحمەدی كوڕی سومیلم، لەوبارەوە دەڵێت: "لەسەرەتای ئیسلام بوونیان لە شێخیان پرسی "، مەبەستی سەرەتای چوون بۆ ناو بزوتنەوەی وەهابیەت. ابن غنام، تاريخ نجد ٤١٠ و سليمان بن سحيم: منهاج الحق و التباع في مخالفه اهل الجهل و الابتداع ٧٥.

کوڕی سەعیدی کوڕی زەید (کە لە ساڵی ١١٦٥ك) هەڵسان بە تەکفیر کردنی وەهابیەکان، ئەمەش دوای گفتوگۆ کردن لە گەڵ نوێنەری وەهابیەکان[١].

دەکرێ بڵێین کە تەکفیری شێخ موحەممەد و شوێنکەوتووانی لەلایەن زانایانەوە لە کاردانەوەی تەکفیری وەهابیەت بوو بۆ تێکڕای موسڵمانان لە سەرەتادا، نەوەك بەپێچەوانە، ئەمەش لە میانەی ئەوەی زنایانی ئیسلام تەفسیر و لێکدانەوەی وەهابیەتیان ڕەتکردەوە بۆ مانای هاوبەشدانان و یەکتاناسی کە هاوبەشدانانی بچوك کە موسڵمان پێ لە دین ناچێتەدەر تێکەڵ بە هاوبەشدانانی گەورە کرد کە بریتیە لە بڕیاردانی هاوبەش بۆ خوا.

ئەگەر سەرنج بدەین لە میانەی گەواهی دانی شێخ سولەیمانی کوڕی عەبدولوەهاب، کە دادوەری (حریملاء) بوو، ڕەخنەی لە براکەی گرت و لەو بارەوە وتویەتی: " ئەگەر داوات لێکرد کە وتەکانی خۆی بۆ زانایان بخاتەڕوو ئەوا هەرگیز ئەمە ناکات بەڵکو پێویستە لەسەر خەڵکی وتە و تێگەیشتنەکەی قبوڵ بکەن، هەر کەسێك بەپێچەوانەی وتە و تێڕوانینەکەی هەڵسوکەوت بکات ئەوا بێ باوەڕە... بەڵکو تێکڕای ئوممەت بەیەك زمان هاوار دەکەن کەچی وەڵامی یەك وشەشیان نادرێتەوە بەڵکو هەموویان بێ باوەڕ و نەزانن "[٢].

شێخ سولەیمان بەڕاشکاوی بە وەهابیەکانی وتوە: " ئێوە خەڵکانێك تەکفیر دەکەن و بەبێ باوەڕیان دادەنێن و وڵاتیان بە وڵاتی جەنگ دەزانن کە شایەتی

---

(١) دحلان، أحمد بن زيني، فتنة الوهابية، ٧، زانایانی مەککەی پیرۆز جارێکی تر هەوڵیاندا کە ستایشی هاوبۆچوونەکانیان بکەن لە نەجد لە مێزگەردێکدا کە لەنێوانیاندا ئەنجامدرا لە سەردەمی شەریف غالب، بە وەی زانیانی مەککە وتیان موسڵمان لەدەرەوەی فیکرەی وەهابی هاوبەشدانەر و بێ باوەڕە. الياسيني، أيمن، الدين و الدولة في السعودية ٧١.

(٢) سليمان بن عبد الوهاب: فصل الخطاب في الرد على محمد بن عبد الوهاب ٤.

دەدەن هیچ خوایەك نییە بەحەق شایەنی پەرستن بێت جگەلە خوای گەورە و موحەممەدیش نێردراوای خوایە و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرن و حەجی ماڵی خوا دەکەن و بڕوایان هەیە بە خوای گەورە و کتێبەکانی و نێردراوانی و پابەندن بە تێکڕایی دروشمەکانی ئیسلام "[١].

شێخ سولەیمان وتویەتی: " ... ئێوە تەنها بە تێڕوانینی خۆتان هەڵسوکەوت دەکەن و خۆتان لە یەکدەنگی جیا کردەوە و تەکفیری ئوممەتی موحەممەدتان کرد ~ بەوەی ووتتان هەر کەسێك ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە بکات ئەوا بێ باوەڕە و هەرچی تەکفیری بکەرەکەی نەکات ئەوا خۆیشی بێ باوەڕە "[٢]، " تێکڕای ئەو وڵاتانە لەلای ئێوە وڵاتی جەنگن، دانیشتوانەکانیان بێ باوەڕن، گوایە بە وتەی ئێوە ئەوان بتیان پەرستووە، هەموویان لەلای ئێوە هاوبەشدانەرن بە هاوبەشدانانێکی دەرخەر لە ئوممەت جا ئێمەش هەر موڵکی خواین سەر ئەنجامیش تەنها هەر بۆ لای زاتی خوای گەورەیە گەڕانەوەمان "[٣] و بەهەمان شێوە وتویەتی: " ئەمڕۆ ئێوە تەکفیری کەسانێك دەکەن کە یەك تایبەتمەندی ئەوانەی تێدا نییە کە (هاوبەشدانەرن) بەڵکو ئەوانەی ئەمڕۆ ئێوە تەکفیریان دەکەن و خوێن و ماڵیان حەڵاڵ دەکەن، عەقیدەیان: بریتیە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەت و کۆمەڵەی ڕزگاربوو "[٤].

---

(١) هەمان سەرچاوە ٥.

(٢) هەمان سەرچاوە ٧.

(٣) هەمان سەرچاوە ٧.

(٤) هەمان سەرچاوە ١٥.

شێخ سولەیمان ئاگاداری کردوونەتەوەو لەوبارەوە وتویەتی: " ئەی بەندەکانی خوا وشیار ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕاستی و بەو ڕێگایەدا گوزەر بکەن کە پێشینە چاکەکان پێیدا ڕۆیشتوون و ڕاوستن لەو شوێنەی پێشینە چاکەکان تیایدا ڕاوەستاوون، با شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێت و تەکفیری موسڵمانانتان بۆ نەڕازێنێتەوە و با ئەوە پێوەری بێ باوەڕی و کوفری کەسێك نەبێت کە پێچەوانەی ئێوە هەڵسوکەوتی کرد و پێوەری موسڵمان بوونی کەسێك ئەوە نەبێت کە وەك ئێوە ڕەفتاری کرد "[1]. "ئەی بەندەکانی خوا... لەخوا بترسن ئەو زاتەی کە باڵا دەست و بەهێزە. بەڕاستی پیاو ئافرەتانی ئیماندارتان ئازار دا ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ الأحزاب: ٥٨. واتە: (ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بەبێ ئەوەی تاوانێکیان ئەنجام دابێت، ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و گوناهو تاوانایکی ئاشکرا دەگرنە ئەستۆ). سوێند بەخوا بەندەکانی خوا هیچ تاوانیان نییە لەلایەن خوای گەورە تەنها ئێوە بەوە تاوانباریان دەکەن چونکە شوێنی ئێوە نەکەوتوون لە تەکفیر کردنی ئەوانە دەقە ڕاستەکان گەواهی دەدەن لەسەر موسڵان بوونی و موسڵمانان کۆکن لەسەر موسڵمان بوونیان جا ئەگەر ئەوان (واتە موسڵمانان[2]) شوێنی ئێوە(واتە وەهابییەکان[3]) کەوتن ئەوا خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ~ لەخۆیان تورە دەکەن و ئەگەر بەپێچەوانەی تێڕوانینی ئێوە ڕەفتاریان کرد ئەوا حوکمی بێ

---

(١) هەمان سەرچاوە ٢٤.

(٢) وەرگێڕ.

(٣) وەرگێڕ.

باوەڕی و هەڵگەڕانەوەیان بەسەردا دەدەن "[1] ئێوە تەکفیری موسڵمانان دەکەن بە ئەنجام دانی بچوکترین شت لە شتە بچوکەکانی کوفر، بەڵکو تەکفیری خەڵکی دەکەن بەوەی کە ئێوە بەکوفری دەزانن، تەنانەت تەکفیری خەڵکی دەکەن کە ڕاشکاوانە موسڵمانن و ئیسلامەتی پەیڕەو دەکەن، لەلای ئێوە هەر کەسێ تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە ئێوە تەکفیرتان کردووە ئەمەش لەبەر ترسان لەخوای گەورە نەکات و لەبەر ئەوەی نیشانەکانی ئیسلام بە ڕوخساری کەسەوە دەبینێت ئەوا ئەو کەسەش بێ باوەڕە "[2].

کاتێك (ئەمیر عەبدولعەزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود) پەیامێکی ڕەوانەکرد بۆ (سولەیمان پاشای گەورە) والی عوسمانی لە بەغداد، لەگەڵ

---

(١) هەمان سەرچاوە ٣٧.

(٢) هەمان سەرچاوە ٢٩. شێخ سولەیمان لە کتێبەکەی دا ئەو ڕیوایەتانەی بە ئەندازەیەکی زۆر خستووەتەڕو کە لە پێغەمبەرەوە ~ هاتوون و ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە ئوممەتی ئیسلامی بەگشتی هیچ کاتێك هەڵبگەڕێتەوە یان بکەوێتە چاڵی هاوبەشدانان و بتپەرستیەوە بەتایبەتی لە دوورگەی عەرەبیدا، وەك ئەو فەرموودەیەی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە: " من لەوە ناترسم کە ئێوە لەدوای من هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەن بەڵکو لە وەدەترسم دونیا هەڵتان بخەڵەتێنێت بەوەی ململانێی لەسەر بکەن و یەکتر بکوژن لەسەری و بەم هۆیەش لەناوبچن هەروەك چۆن گەلەکانی پێش ئێوە لەناوچوون"، یان ئەو ڕیوایەتەی کە موسلیم گێڕاویەتیەوە: " شەیتان بێ هیوابووە لەوەی نوێژکەران بیپەرستن لە دوورگەی عەرەبیدا " یاخود ئەو فەرموودەیەی (حاکم) و (ئەبو یەعلا) (بەیهەقی) لە ئیبن مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە: " شەیتان بێ نومێد بووە کە جارێکی تر بت بپەرسترێت لە نیشتمانی عەرەبیدا بەڵام بەوە لێیان ڕازی بوو کە خراپ و تاوانی ناشرین و پەست ئەنجام بدەن ئەوانەش لەناوبەرن " یان ئەو فەرموودەیەی کە (ئیمامی ئەحمەد) و (حاکم) و (ئیبن ماجەی) لە شەدادی کوڕی ئەوسیان گێڕاوەتەوە کە دەڵێت لە پێغەمبەری خوام بیست ~ کە دەیووت: " بەڵێ... ئەوان خۆر و مانگ و پەیکەر ناپەرستن بەڵکو ڕیاکاری دەکەن لەکارەکانیاندا ".

دانەیەك لە كتێبی (التوحید)ی (شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب)، ئەمیر داوای لە والی ناوبراو كرد، كە زانایان كۆ بكاتەوە بۆ سەیر كردنی كتێبی شێخ موحەمەد و ئیمان بێنن بەوەی لە كتێبی ناوبراودا هاتووە. زانایانی بەغداد بە سەركردایەتی شێخ عەبدوڵڵا ئەفەندی گێڕەرەوە (الراوي) ئەو فیكرە و تێڕوانینانەی كە لەو كتێبەدا هاتبوون بە نەشیاو و ناپەسەندیان زانی[1].

مەرجەعی ئایینی شیعی نەجەفی شێخ جەعفەر (كاشف الغطا) بەرپەرچی تیۆری شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهابی دایەوە، بە كتێبێكی دانا بە ناونیشانی (منهج الرشاد لمن أراد سبيل الرشاد) لەو كتێبەی دا (تیۆری وەهابیەتی) هەڵوەشاندەوەو پوچی كردەوە كە تێكڕایی موسڵمانان تۆمەتبار دەكات بەوەی هاوبەشدانەر و بێ باوەڕن. مەرجەعی ناوبراو جیاوازی كردووە لە نێوان هاوبەشدانەران ئەوانەی پیاوچاكانیان دەپەرست و وایان دادەنا كە هاوبەشی خوای گەورەن، لەگەڵ موسڵمانان ئەوانەی خوا بەیەكزانن و تەوەسول بە ئەولیاكانی دەكەن و بڕوایان وایە كە ئەولیاكان پلەیەكی تایبەتیان هەیە لەلایەن خوای گەورە "[2].

(١) عبدالرحيم عبدالحمن، الدولة السعودية الأولى ١٧٨.

(٢) هەروەها وتویەتی: " بتپەرستان بێ باوەڕ بوون، چونكە ئەوان كارێكیان ئەنجام دەدا كە بریتی بوو لە پەرستنی شتێكی تر جگە لەخوای گەورە، لەبەر ئەوەی ئەو بێ باوەڕانە بە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەرەكانیان هەڵسوكەوتیان كرد كە فەرمانیان كردبوو دەست لەو كارانەیان هەڵبگرن، مەبەستیان بوو بە كارێك لە خوا نزیك ببنەوە كە خوای گەورە خۆی ڕێگری لێ كردووە، بەڵام ئەگەر مەبەستیان وابێت كە بتەكان توانای لە دەسەڵات خستن و پەكخستنی خوایان هەیە جا بتەكان بەهۆی هێزی خۆیان بەندەكانیان نزیك دەكەنەوە یاخود ئەو كارەیان گاڵتە كردن بە پێغەمبەران و بەدرۆ خستنەوەیان بووە، هەردوو حاڵەتەكە كوفرن و یەكێكیان لەوەی تر

---

گەورەترە، ئەوانەی وا گومانیان دەبر کە بەهۆی بتپەرستیەوە لەخوا نزیك دەبنەوە دەرەنجامی وتەکانیان ئەوەیە: " ئێمە دژی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی دەجولێینەوە و ئێمە ئەو شتە دەپەرستین کە پەرستنی لێمان حەرام و قەدەغە کراوە بۆ ئەوەی لەخوا نزیکمان بکەنەوە ".

مەرجەعی ناوبراو وتویەتی: " بەڵام ئەوە باسکرا کە ڕێگری دەکرێت لەوەی هاواری غەیری خوا بکرێت و لە غەیری خوا بپاڕێتەوە، من لەوبارەوە دەڵێم: ئەوەی نزا و هاوار دەکاتە غەیری خوای گەورە ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە هەموو کارەکانی بداتە پاڵی و واگومان ببات ئەو سود و زیانی بەدەستە، ئەوا ئەو قسە و تێڕوانینە هی بێ باوەڕانە، موسڵمانانیش بەشێوەیەکی گشتی لەو جۆرە تێڕوانین و بۆچوونانە دوورن و بەین لەو قسەیە و بێزەرەکەی، من گومان نابەم لە وڵاتی موسڵمانان یەکێك ئەو بۆچوونەی هەبێت تەنانەت تا ئەمڕۆش ". و وتویەتی: " مەبەست لە دوعا لایەنی زمانەوانیەکە نییە، چونکە ئەگەر لایەنی زمانەوانی مەبەست بوو ئەوا هەموو بەدیهێنراوان کافر و بێ باوەڕ دەبن، چونکە مەبەست مانای دوعا لە زمانەوانیدا بریتیە لە بەندایەتی کردن، هەروەك کەسێ لە بت یان پیاوچاکان بپاڕێتەوە و بڕواشی وابێت کە ئەو بت و پیاوچاکانە پەروەردگاری ئەون تەنها پەرستنی ئەوان بەبێ ئەوەی خوای گەورە بپەرستن بەسە یان هاوبەشدانەران ئەوانەی جگەلە خوای گەورە مەبەستیان ئەوەبوو کە بتەکان سوودیان پێ ببەخشێت و زیاتر لە خوای گەورە نزیکیان بکاتەوە... پاشان سەرزەنشت لەوەدا نییە کە ئەوان بڕوایان وابوو شەفاعەتیان بۆ دەکەن و نزیکتریان دەکەنەوە لەخوای گەورە بەڵکو سەرزەنشتەکە ئەوە دەگرێتەوە کە ئەوان ئەو کار و ڕەفتارەیان دەکرد بەمەبەستی پەرستش، مەبەستیش لە پەرستش چەند کردارێکی تایبەتە هەروەك ڕوونمان کردەوە. مەبەستەکان فرەو جیاوازن و کارەکانیش لەسەر نیەت دادەمەزرێن و بەپێی نیەت پاداشت دەدرێن هەر کەسێك و نیەتی خۆی. لەوانەیە وشەیەك لە ڕووکەشدا خزمەت بە ئیسلام بکات کەچی بەهۆی نیەت دەبێتە وشەیەکی کوفری و بە پێچەوانەش ڕاستە. ئەگەر تەوەرەکە تەنها لەسەر وێنەکان بخولێتەوە بەبێ لەبەر چاوگرتنی حەقیقەتەکان ئەوا کڕنووشی فریشتەکان بۆ ئادەم و کڕنووشی یەعقوب بۆ یوسف بریتیە لە پەرستنی شتێکی تر غەیری خوای تاك و پاك، لەم بارەوە هەواڵ و وتەی هاوەڵانمان خستۆتەڕوو کە لەردەرەنجامدا ئەوە بەدەستەوە دەدات کە ڕێگریان لەوکارانە نەکردووە (ئەگەر مەبەست لێی پەرستنی غەیری خوای گەورە نەبێت _ و _).

## هەوڵی لەخۆ دوورخستەوەی تۆمەتی تەکفیر

لەبەردەم ئەو هەڵمەتە ناڕەزایی و سەرکۆنە کردنە فراوانەی کە وەڵامی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهابی پێدرایەوە. لەهەمبەر تەکفیر کردنی تێکڕایی موسڵمانان، ئەوا شێخ موحەمەد هەوڵی دا کە تۆمەتی تەکفیر بەشێوەیەکی گشتی لەسە خۆی لاببات، گوایە ئەو تۆمەتانە چەند شتێکی هەڵبەرستراون لەدژی، لەمبارەوە بۆ هەندێ لە زانایانی نووسی:" پێم گەیشتووە کە پەیامەکەی (سولەیمانی کوڕی سەحیم) پێتان گەیشتووە و هەندێ بەناو زانا لەلای ئێوە قبوڵی کردووەو بەڕاستی زانیوە، سوێند بەخوا سولەیمان هەندێ شتی بەدەمی منی هەڵبەستووە کە من نەم گووتوە و زۆربەشیان هەر بەخەیاڵمدا نەهاتوون، لەو قسانە:.... من وتومە کە خەڵکی لەوەتەی شەش سەدەیە لەسەر هیچ نین و بێ بڕوان... من موسڵمانان تەکفیر دەکەم لەبەر ئەوەی تەوەسول بە پیاوچاکان دەکەن و تەکفیری بوسەیڕی دەکەم لەبەر ئەوەی ووتویەتی: (ئەی بەڕێزترینی بەدیهێنراوان....[1]) و من وتومە: ئەگەر تواناو دەسەڵاتم هەبوایە لەسەر ڕوخاندنی گومبەتی سەر گۆڕی

---

بەهەر حاڵ: ئەگەر مەبەست لە دوعا و هاوار کردن و شتەکانی تر حەقیقەتەکانیان بێت (واتە :ڕووی زمانەوانی _ و _) ئەوا دەرچوونە لە ڕێگەی ئیسلام و ئەگەر مەبەستیش وا نەبێت ئەوا شتێکی ئاساییە، ئەگەرنا پێویست دەبێت کە هیچ یەکێك لە جیهان لە بازنەی کوفر دەرنەچێت ". محمد الحسين الكاشف الغطاء: العبقات العنبرية في الطبقات الجعفرية، پاشکۆیی: منهج الرشاد لمن أراد السداد. تحقيق الدكتور جودت القزويني.

(١) مەبەستی بوسەیری شاعیر پێغەمبەری سەروەرە ﷺ. (وەرگێڕ).

پێغەمبەر ~ ئەوا دەم ڕووخاند.. من زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر بە حەڕام دەزانم و ئەو کەسە تەکفیر دەکەم کە سوێند بە غەیری خوای گەورە دەخوات.

وەڵامی من لەسەر ئەو مەسەلانە ئەوەیە کە بڵێم: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە بەڕاستی ئەمە بوختانێکی گەورەیە...

من دەڵێم: موسڵمانێتی هیچ کەسێك تەواو نابێت تا مانای (لا اله الا الله) نەزانێت و من دەزانم کێ مانای ڕستەی ناوبراو بۆم دەهێنێت، من تەکفیری ئەو کەسە دەکەم کە نەزر دەکات بۆ جگەلە خوای گەورە و نەزر وەرگرتن لەو پێناوە، بێگومان قوربانی کردن بۆ غەیری خوای گەورە کوفرو بێ باوەڕییە و ئاژەڵە سەربڕاوەکەش حەڕامە، ئەو مەسەلانە بێگومان ڕاستن و من بێژەی ئەو مەسەلانەم "[1]، " و ئەوەی هاوبەشدانەران باسیان کرد... کە من تەکفیری تێکڕای موسڵمانان دەکەم تەنها شوێنکەوتووانی من نەبن و من گومان دەبەم کە مارەبڕینی موسڵمانان نا دروستە، ئای چەند سەیرە ئەمە چۆن دەچێتە عەقڵی کەسی ژیرەوە؟ و ئایا کەسێکی موسڵمان ئەو قسانە دەکات؟ من خۆم پەنا ئەدەم بە خوای گەورە و خۆم بەپاك دەزانم لەو وتانە کە بەڕاستی ئەو وتانە تەنها لە کەسێکی عەقڵ تێکچوو و بێ هەستیەوە دەردەچن و دەووترێن، خوای گەورە ئەو کەسانە لەناوببات کە نیەت و مەبەستی ناپاکیان هەیە "[2].

بەو شێوەیە شێخ موحەمەد پەیامێکی نووسی بۆ شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای سوەیدی لە عێراق کە تیایدا "تۆمەتی" تەکفیری گشتی لەسەر خۆی لادەبات: " ... لەو شتانە باستان کردووە کە من هەموو موسڵمانان

---

(١) الدرر السنية ٣٤/١.

(٢) الدرر السنية ٨٨/١.

تەكفیر دەكەم تەنها شوێنكەوتووانی من نەبن و من گومان دەبەم كە مارەبڕینی موسڵمانان نا دروستە، ئای چەند سەیرە ئەمە چۆن دەچێتە عەقڵی كەسی ژیرەوە؟ و ئایا كەسێكی موسڵمان؟ یان بێ باوەڕ؟ یان عارف؟ یان شێت ئەو قسانە دەكات؟ ... بەڵام تەكفیر و ئێمە تا ئەمڕۆ هیچ یەكێكمان نەكوشتووە تەنها لەكاتی پاراستنی نەفس و شەڕەف و ڕێز نەبێت، تەنانەت دژمراكانمانن كە هەڵیان كوتاوەتە سەر ئێمە لە ناو وڵاتی خۆماندا و ڕێگەیەكی تریان نەهێشتەوە، بەڵام دەكرێ جەنگیان لەگەڵ بكەین وەك ڕووبەڕوو بوونەوەی هاوشێوە ﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا.. ﴾ الشورى: ٤٠. واتە: (جا تۆڵەی هەر تاوانێك بە ئەندازەی تاوانەكەیەو بێ زیادو كەم). جەنگ لەگەڵ ئەوەشدا دەكەین كە بە ئاشكرا تانەو تەشەر لە ئایینی پێغەمبەر دەدات پاش ئەوەی ناسیویەتی "[1].

هەروەها شێخ موحەمەد پەیامێكی نووسی بۆ شەریفی مەككە (سعود) كە تیایدا تۆمەتی تەكفیر بەگشتی لەسەر خۆی لادەبات، وتویەتی: " درۆ و بوختان وەك ئەو وتەیەی دژمراكانم: بەوەی گوایە ئێمەی وەهابی تەكفیر بەگشتی دەكەین و كۆچ كردن بۆ لای ئێمە بە پێویست دەزانین لەسەر كەسێك كە توانای دەرخستنی دینەكەی خۆی هەبێت، ئێمەی وەهابی تەكفیر و جەنگ لەكەڵ ئەوانە دەكەین كە تەكفیر و جەنگ ناكات و زۆر شتی تریش، جا تێكڕایی ئەو شتانە درۆ و بوختانن كە بەهۆیەوە خەڵكی لە ئایینی خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی دوور دەخەنەوە.

---

(١) ابن غنام: تأريخ نجد ٣٢٣.

ئەگەر ئێمە تەکفیری ئەو کەسە نەکەین کە بتی سەر گۆڕی (عەبدولقادر) و ئەو بتەی لەسەر گۆڕی (بەدەوی) و هاووێنەکانیان دەپەرستێت، لەبەر ئەوەی نەزانن و نەبوونی کەسێك ئاگاداریان بکاتەوە لەو کارانە، ئەوسا چۆن تەکفیری کەسێك بکەین کە هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت و ئەگەر کۆچ بۆ لای ئێمە و تەکفیر و جەنگ نەکات؟ (پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە بەڕاستی ئەمە بوختانێکی گەورە)یە ".[1]

شێخ موحەممەد لە ساڵی ١١٨٥ك پەیامێکی بۆ شەریفی مەککە (ئەحمەدی کوڕی سەعید)ی نارد بە نوێنەرەکەی شێخ عەبدولعەزیز حوسەین، لە پەیامەکە ڕێزو سوپاس و پێزانین و نزا و دوعایەکی زۆری تێدا هاتبوو بۆ شەریفی ناوبراو[2] و نوێنەری شێخ موحەممەد لە بەردەم زانایانی مەککە (یەحیای کوڕی صاڵحی حەنەفی و عەبدولوەهابی کوڕی حەسەنی تورکی و

---

(١) ابن غنام: تأريخ نجد ٤٠٧.

(٢) لە پەیامەکەدا هاتووە: "..... کاتێك کتێبەکە گەیشت بە خزمەتکارەکەتان (مەبەستی شێخ موحەممەد خۆیەتی _ و _) و وردبووە لەو وتە جوانانەی تیایدا هاتووە ئەوا ڕاستەوخۆ دەستی بەرز کردەوە بە نزاوە لەبەردەم دەرگانەی میهرەبانی خوای گەورە تا پشتیوانی کردنی شەریف، چونکە مەبەستی شەریف بریتیە لە سەرخستنی شەریعەتی موحەممەدی و ئەوەی شوێنی دەکەوێت و دژایەتی کردنی ئەوەی کە لەو شەریعەتە دەردەچێت، بێگومان ئانەوەیە ئەرك و کاری کاربەدەستان.. کە داوای زانستخوازانتان کرد لەلایەن ئێمە، ئەوا ئێمە جێبەجێمان کرد... شایەنترین کەس کە شیاوی ڕێزو سەرخستن بن ئەو خانەوادە و ئالوبەیتەیە کە خوای گەورە لەناویدا پێغەمبەری ڕەوانەکرد و پایەبەرز و ڕێزداری کردن لەسەر خەڵکی سەرزەوی، شیاوترین کەسانی ئالوبەیتیش ئەوانەن کە لە ڕەچەڵەکی پێغەمبەرن ~ و جگەلەو شتانە ئەوا شەریف خوا سەرکەوتوو و سەربڵندی بکات دەزانێت: کە من یەکێکم لە دەستەی خزمەتکارەکانت، ئێوەش هەر لە ژێر چاودێری باشی خوای گەورە و پاراستنی ئەودا بن " ابن غنام: تأريخ نجد ١٣٥.

عەبدولغەنی کوڕی هیلال) ئەو تۆمەتەی لابرد کە ئاراستەی وەهابیەکان کرابوو بەوەی خەڵك بەگشتی تەکفیر دەکەم.[1]

شێخ لە پەیامێکی تریدا تۆمەتی تەکفیری بەگشتی لەسەر خۆی لاداوە، لەوبارەوە وتویەتی: " سەبارەت بە تەکفیر ئەوا من ئەو کەسە تەکفیر دەکەم کە دینی پێغەمبەری ناسیووە (مەبەستی تێڕوانینی وەهابیەتە بۆ یەکتاناسی) پاشان دوای ئەوەی ناسیویەتی ئەوا تانە و تەشەری لێبدات و ڕێگری بکات لەوەی خەڵك بچێتە ناوی و دژایەتی شوێنکەوتووانی بکات، ئەمە بەڕاستی کوفرێکی زۆر گەورەترە لەوانی تر. سوپاس بۆ خوا زۆربەی خەڵکی ئاوا نین "[2].

سەرباری ئەوەی (شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) لەو پەیامانەی دا ئەوە لەسەر خۆی لادەدات کە پێی دەڵێت تۆمەتی تەکفیر بەشێوەیەکی گشتی، کەچی هەر لە جوغزی پەیامەکاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەسەر خۆی لادەدات، لە پەیامی دووەمیدا تۆمەتی ئەوەی لەسەر خۆی لاداوە کە تەکفیری ئەوانە بکات کە تەوەسول بە پیاوچاکان دەکات، کەچی ئەمە لەگەڵ بەناوبانگترین وتارەکانی تێکدەگیرێت کە تیایدا وتویەتی: " هەر کەسێ چۆك دابدات لە بەردەم پێغەمبەرێك یان فریشتەیەك یان لەبەری پاڕایەوەو کروزایەوە ئەوا لە ئیسلام دەرچووەو ئەوە ئەو بێ باوەڕی و کوفرەیە کە پێغەمبەر ~ جەنگی کرد لەگەڵ هاوبەش دانەران لەسەری "[3] و ئەو تۆمەتەشی لەسەر خۆی لابرد لەوەی پێداگیری کردووە لەسەر ڕووخاندنی

---

(١) إبن غنام، تأريخ نجد ١٣٦.

(٢) إبن غنام، تأريخ نجد ٧١ و ٨٣.

(٣) محمد بن عبدالوهاب، پەیامێك لەسەر مانای (لا اله الا الله).

گومبەتی سەر گۆڕی پێغەمبەر ~ کەچی دەڵێت: " دروست نییە شوێنەکانی شیرك و تاغوت بمێنن پاش ئەوەی موسڵمانان توانایان هەیە لەسەر تێکدانی و پوچڵکردنەوەی، چونکە دروشمی شیرك و بێ باوەڕین، کە گەورەترین خراپەیە، ناکرێ بە هیچ شێوەیەك کەسێ توانای هەبێت و دانی پێدا بنێت، بە هەمان شێوە حوکمی ئەو مەزارگانەی هەیە کە دروستکراون لەسەر گۆڕەکان و کراون بە پەیکەرێکی پەرستراو جگەلە خوای گەورە، ئەو بەردانەی کە تەبەڕوکیان پێوە دەکرێت و ماچ دەکرێن و نەزریان لەلا دەکرێت. گەر توانا و هێز هەبوو ئەوا دروست نیە هیچیان بمێنن لەسەر ڕووی زەوی چونکە زۆرێکیان دەگەنە ئاست (لات) و (عوزا) و (مەنات)ی سێهەمیش "[1] هیچ شتێك نییە کە وای لێبکات گومبەتی سەر گۆڕی پێغەمبەر جیا بکاتەوە لە گومبەتەکانی تر کە توانای بەسەردا هەبوو و بە واقیعیش ڕووخاندنی.

سەرەڕای ئەوەی شێخ موحەممەد لە چەندین پەیامی تردا ئەو تۆمەتەی لەسەر خۆی لاداوە کە ئەو تەکفیری موسڵمانانی کردبێت جگەلە شوێنکەوتووانی، تەنانەت ئەو کەسەی شێخ موحەممەد بەوە تۆمەتبار دەکات ئەوا شێخ خۆی بەخوای گەورە پەنا دەدات لەوشتانە و ئەو تاوانبار دەکات بەوەی عەقڵی تێکچووە، بانگەشەی ئەوەشی کردووە کە تەنها لەبەر بەرگری کردن لە نەفس جەنگی کردووە ئەمەش لەمیانەی بەکارهێنانی هەمان ئەو ڕێگەیەی کە بەرامبەرەکە بەکاریهێناوە[2]، بەڵام شێخ ئیعترافی کردووە بەوەی

---

(١) ابن غنام: تأريخ نجد ٢٨٤.

(٢) خاوەنی (الدرر السنية) دەڵێت: " شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە دەستپێکی تەکفیردا هیچ یەکێکی تەکفیر نەدەکرد، ئەگەر گوێی لە خەڵکی بووبایە کە لە زەیدی کوڕ خەتتاب دەپاڕانەوە، ئەوا دەیوت: خوای گەورە چاکترە لەوەی لێی بپاڕێنەوە نەوەك زەید، بە وتەی نەرم

جەنگ لەگەڵ ئەو کەسە دەکات کە بە ئاشکرا تانە و تەشەر بدات (لە ئایینی پێغەمبەر) واتە لە وەهابیەت، هەروەك چۆن لە پەیامەکەی دا بۆ شەریفی مەککە دانی بەوەداناوە کە جەنگ لەگەڵ ئەو کەسە دەکات  کە هەتا " یەکتاناسی ناسیبێت و ئاشکراشی کردبێت بۆ خەڵکی و ئیعترافیش بکات کە بڕوا بوون بە بەرد و دار و مرۆڤ کە دینی زۆربەی خەڵکیە بەڵام هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورە، سەرباری ئەوە بەڕووی یەکتاناسیەوە نەهات و هەوڵی فێربوونی نەدا و نەهاتە ناو بازنەی یەکتاناسی و (هاوبەشدانانی) فڕێ نەدا ".
شێخ وتویەتی: ئەو جۆرە کەسە بێ باوەڕە بەهۆی بێ باوەڕییەکەی جەنگی لەگەڵ دەکەین. چ جای تێکڕای خەڵکی تر کە بڕوایان بە بنەماکانی تیۆری وەهابیەت نییە.

شێخ لە جوغزی ئەو پەیامەدا جەختی لەوە کردەوە کە زۆربەی خەڵکی هاوبەشدانەرن... ئەو کەسانەی تۆمەتبار کرد کە سەردانی گۆڕی ئەولیاکان دەکەن بەوەی ئەولیا پەرستن.

تێکگیرانێکی ڕوون هەیە لە وتەکانی شێخ دا چونکە کاتێك گومبەتەکانی سەر گۆڕی ئەولیا و پیاوچاکان (وەك گۆڕی عەبدولقادر و ئەحمەدی بەدەوی) بە بت دادەنێت، ئەوانەی سەردانی ئەو گۆڕانەش دەکەن تۆمەتبار دەکات بەوەی گۆڕپەرستن، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ دەڵێت من تەکفیریان ناکەم لەبەر نەزانینیان، کەچی شێخ نەزانین بە پاساو پەرچ (مانع) دانانێت بۆ تەکفیر نەکردن، هەروەك لەوبارەوە دەڵێت: " مرۆڤی موسڵمان بە یەك وشە کە لە زمانی دەردەچێت بێ باوەڕ دەبێت لەوانەیە لە نەزانیەوە ئەو وشەیە دەربڕێت

---

لەگەڵیان بەنرمی هەڵسووکەوتی دەکرد، بەلەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی و دوور نەخستنەوەی خەڵکی ". الدرر السنية ٢/٢١١.

بەڵام نەزانین بەپاساو ناشێت، دەکرێ ئەو وشەیە بڵێت بەو مەبەستەی لە خوا نزیك ببێتەوە هەروەك هاوبەشدانەران ئەو گومانەیان دەبرد "[1].

ئەگەر هەڵوەستە بکەین لەسەر ئەو وتەیەی شێخ کە دەڵێت: " من ئەو کەسە تەکفیر دەکەم کە (دینی پێغەمبەری) ناسیوەو دواتر تانە و تەشەری لێدەدات و ڕێگری دەکات لەوەی خەڵکی شوێنی بکەون و دژایەتی شوێنکەوتووانی دەکات ئائەوە بەڕاستی کوفر و بێ باوەڕییە " دەبینین بەلایەنی کەمەوە شێخ تەکفیری ئەو کەسە دەکات کە دژەڕای ئەوە، ئەگەر ئەو هەڵوێستە لەگەڵ وتە و هەڵوێستەکانی تری کۆبکەینەوە، لە ژمارە نایەن کە ناوی (هاوبەشدانەران)ی بۆ تێکڕایی موسڵمانانی بەکارهێناوە، ئەوا دەگەین بەو دەرەنجامەی کە شێخ وردبین نەبووە لەوەی تۆمەتی تەکفیر بەگشتی لەسەر خۆی لاببات یاخود شێخ توقیە و خۆپاریزی[2] بەکاردەهێنا. لەسەرەتای بانگەوازەکەی دا وەك تەکتیك و هەڵخەڵەتاندنی دوژمنی بەهێزتر یان شێخ یاری و گەمەی بە قسە و وشەی دەکرد بەکەیفی خۆی، ئەگەرنا دیاردەی تەکفیر بەگشتی لە دیارو ڕوونترین ڕوخسارو تایبەتمەندیەکانی بزوتنەوەی وەهابیەتە[3].

---

(١) الحصين، أحمد: دعوة الامام ... سلفية لا وهابي ١٠٤.

(٢) توقیە: " چاوگ (مصدر)ە، واتە ترسان لە شتێك، ئەوا بەزمان پشتگیری دژەکەت بکەی و بەدڵ ڕقت لێبێتەوەو پشتیوانی نەکەی. ئەمە لەکاتێکدایە کە موسڵمان لاواز بێت و لە شارێك بێت کە تیایدا بەهێز نەبێت. سوودم بینیوە لە:(التفسير المنير: د. وهبة الزحيلي ٢١٤/٢، دار الفكر، دمشق). (وەرگێڕ).

(٣) ئەمە زۆر بە جوانی و ڕاشکاوانە دەرکەوت لە کتێبی یەکێك لە قوتابی و هاوەڵەکانی کە شێخ حوسەینی کوڕی غەننامە، هەروەك دەڵێت: "زۆربەی موسڵمانان _لەسەرەتای سەدەی دوازدەمی کۆچی _ ئالوودەی هاوبەشدانان بوون و هەڵگەڕانەوە سەر دۆخی نەفامی، ڕووناکایی ئیمان لە دەروونیاندا کوژایەوە، بەهۆی زاڵبوونی نەزانین و کەسانی ئارەزوو پەرست و سەرکەش

بەسەریاندا... قورئانی پیرۆزیان پشت گوێ خست... دەستیان کرد بە پەرستنی ئەولیا و پیاوچاکان، چ ئەوانەی مردوون چ ئەوانەی زیندوون هانا و هاواریان بۆ دەبەن لە کاتی تەنگانە و رووداودا، یارمەتیان لێوەردەگرن لە جێبەجێ کردنی پێویستیەکان و لابردنی ناخۆشییەکان... نەزریان بۆ دەکەن و بەوپەڕی ملکەچییەوە لێیان دەپاڕێنەوە زیاتر لە ئەندازەی خەڵکی سەردەمی نەفامی ئەو جۆرە کارانە دەکەن.. سەرگەردانی و سەر لێ شێواوی و گۆڕان لە دیندا لە کاتێکی کۆنەوە دروستبووە... ئەو سەرگەردانییە بڵاوبووەتەوە تا ئەندازەیەك کە وڵاتی موسڵمانانی تێکرا داگیر کردووە ". (ابن غنام، تأریخ نجد ١٣ و ١٤).

لەڕاستیدا کتێبی مێژووی ئیبن غەننام پڕیەتی لەو دەربڕینانەی کە بەڕوونی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرچی بچێتە ناو چوارچێوەی بزوتنەوەی وەهابی ئەوا بریتین لە "موسڵمانان" و ئەوەی لە دەرەوەی چوارچێوەی بزوتنەوەکەیە ئەوا " بێ باوەڕ و هەڵگەڕاوەو سەرگەردانن " تەنانەت وەسفی ئەو هەڵگەڕانەوەیەی لە نەجد ڕوویدا لە ساڵی ١١٧٨ دەکات، پاش ئەوەی سەرۆکی نەجران (الحسن بن هبة الله) هەڵسا بە هێرشێکی فراوان بۆ سەر نەجد، لەوبارەوە ئیبن غەننام دەڵێت: " زۆربەی خەڵکی نەجد هەڵگەڕانەوەو پێشبڕکێیان دەکرد بەرەو سەرگەردانی ". (هەمان سەرچاوە ١٢٦) وەسفی خەڵکی قوسەیم دەکات کاتێك ملکەچی ئەمیر عەبدولعەزیزی موحەممەدی کوڕی سعود بوون لە ساڵی ١١٧٩ك، هەروەك لەوبارەوە دەڵێت: " بە دەستە دەستە خەڵکی قوسەیم دەچوونە خزمەتی و دەهاتنە ناو ئیسلام و لەو بارودۆخەی کە بت پەرستی دەرچوون، جا عەبدولعەزیز پەیمانی لێوەرگرتن و مامۆستای بۆ دانان کە یەکتاناسی و یاسا و ئەحکامەکان پیشانی خەڵکەکە بدەن. لە ساڵی ١١٨٤ هێرشی کردە سەر (المحمرة) (الحائرة) جا هەر هەموو دانیشتووانەکە ملکەچی بوون، هاتنە ناو ئیسلامەوە و پەیمانیان دا بە عەبدولعەزیز و پابەند بوون بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری "(هەمان سەرچاوە ١٣٤). لەبارەی ڕووخانی شاری (ڕیاض)ەوە دەڵێت: " ئیبن سعود دەستی گرت بەسەر تێکرای (ڕیاز)دا بە ماڵ و سەروەت و دار خورماکان وەك دەستمایەی جەنگ کە خوای گەورە پێی بەخشی و ئەسپ و سوارەکان هێشتان وشك نەبوو بوونەوە ". (هەمان سەرچاوە ١٣٨) دانیشتووانە ترساوەکە ئەوانەی کە هەڵاتوون لەبەر هێزەکانی وەهابییەکان ئەوا هەڵاتووەکان بێ باوەڕن و وڵاتیان دەستمایەی جەنگە. ئیبن غەننام دەدوێت لەسەر خۆبەدەستەوەدانی زەیدی کوڕی زامل خاوەن دەسەڵاتی (الدلم) لەساڵی ١١٩٠ و چۆنیەتی چوونی زەید و دەم ڕاستەکانی گەلەکەی بۆ لای عەبدولعەزیز، لەوبارەوە ئیبن غەننام دەڵێت: " پەیمانیان دا لەسەر ئیسلام... بۆ ماوەیەك مانەوە لەسەر ئەو پەیمانەیان و لە ڕووکەشدا ئیسلامیان پیشان دەدا تا ئەو کاتەی خوای گەورە ویستی هاتە سەر ئەوەی کە هەڵبگەڕێنەوە ". هەروەك ئیبن غەننام دەدوێت لەهەمبەر خەڵکی (سەدیر) و (منیخ) و دەڵێت: "نیشانەکانی

هەڵگەڕانەوەیان لێ بەدەر کەوتن لە ساڵی ١١٩٠، بۆیە چەند کەسێکی لەوان وەك بارمەتە دەست بەسەر کرد تا هەڵنەگەڕێنەوە ". بەهەمان شێوە دەڵێت: " خەڵکی شاری (حرمة) و (سەدیر) بەیەکدەنگی هەڵگەڕاونەتەوە... دوای جەنگێکی درێژخایەن داوای ئەوەیان کرد بێنە ناو ئیسلامەوە و تۆبە و پەشیمانیان دەربڕی ". وە ئەو قسەیەش دەخاتە سەر وتەکانی ڕابردووی:" لە ساڵی ١١٩٣ خەڵکی (حرمة) و (الزلفي) هەڵگەڕانەوە،جا سعود بەپشتیوانی موسڵمانان هێرشی کردە سەریان و کوشتنی و گەمارۆی دان و دار خورماکانی بڕین، ئینجا کە موسڵمانان تەنگیان بە دانیشتووانەکە هەڵچنی و ئۆمێدی ڕزگار بوونیان لێ بڕین ئەوا دانیشتووانەکە داوای ئاشتەواییان کرد و هاتنە ناو ئیسلامەوە ". (هەمان سەرچاوە ١٣٩/١).

دەڵێت: " لە ساڵی ١١٩٦ گشت خەڵکی قوسەیم هەڵگەڕانەوەو پەیمانیان شکاند و یەکدەنگ بوون لەسەر کوشتنی ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵیان بوون، تەنها دانیشتووانی (بردة) و (الرس) و (التنومة) نەبن کە هەڵنەگەڕانەوە... دوای ئەوە زەوی لە کەسی هەڵگەڕاوەکان بچوك بووەو وێکهاتەوەو هیچ پەناگەیەکیان نەدۆزیەوە کە تیایدا بێنە ناو بازنەی ئیسلام. دانیشتووانی (الروضة)ش هەڵگەڕانەوە بەو هۆیە سعود گەمارۆی خستە سەریان و دار خورماکانی بڕین، بەوهۆیە داوای ئاشتیان کرد و پەیمانیان دا بە سعود لەسەر ئیسلام.

سعود لە ساڵی ١١٩٨ هێرشی کردە سەر (بردة) دەستی بەسەر هەموو ماڵ و سەروەت و سامانەکەی داگرت و نزیکەی پەنجا کەسی لێکوشتن، بۆیە خەڵکی قوسەیم ئیسلام بوونی خۆیان دەربڕی.

ئیبن سعود لە ساڵی ١١٩٩ بەرەوە (الدلم) چوو گەمارۆی خستە سەریان و جەنگی لەگەڵ کردن تا ملکەچ بوون و خۆیان بەدەستەوەدا، جا ئیبن سعود هەرچی لەماڵیدا هەبوو وەك گیانلەبەر و شتومەك و چەك و خواردن و خورمای برد وەك دەستمایەی جەنگ... کاتێك هەواڵی ئەم ڕووداوە بڵاوبووەوە ئەوا ترس بەرۆکی زۆرێك لە خەڵکی سەرگەردانی گرت بەوهۆیەش نوێنەری خۆیان نارد بۆ لای ئیبن سعود و داوای هاتنە ناو ئیسلام و ژێر دەسەڵاتی سعودیان دەکرد.

لە ساڵی ١٢٠٢ زۆرێك لە خەڵکی لادێی (الدواسر) هاتنە ناو ئیسلامەوە، هەندێکیان پاش شەش مانگ هەڵگەڕانەوە، بۆیە عەبدولعەزیز هێزی ئامادەکرد و ناردیە سەر هەڵگەڕاوەکان و جەنگی لەگەڵ کردن و سزای بەسەردا ڕشتن و ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن تا کەم و سوك و چروك بوون و دواتر داوای هاتنە ناو ئیسلامیان کرد. (هەمان سەرچاوە، ڕووداوەکانی ئەو چەند ساڵە).

لە ساڵی ١٢٠٦ و ١٢٠٧ سعود هێرشی کردە سەر (القطیف) و (الأحساء) و نزیکەی هەزارو پێنج سەد کەسی لێ کوشتن و تەفرو تونای کردن، قەسابخانەی ترسناکی دانا بۆ دانیشتووانەکە. " پاش ئەمە نوسراوێکی بۆ دانیشتووانەکە نارد تیایدا داوای ئیسلام بوونیان لێدەکات و ملکەچ و

گوێڕایەڵ بن و ئاگاداریشیان دەکاتەوە لەهەر لاساری و پشتێ تێ کردنێك، جا دەستپێشخەریان کرد بۆ گوێڕایەڵی کردن بەبێ ئەوەی دوودڵ بن، تەنانەت پەیامیان نارد بۆ سعود تیایدا داوایان لێکردبوو کە بێتە لایان بۆ ئەوەی پەیمان و بەیعەتی پێ بدەن... خەڵکی (الأحساء) چوونە لای ئیبن سعود و پەیمانیان پێدا لەسەر ئیسلام و گوێڕایەڵی... ئەوەندەی پێ نەچوو کە ئیبن سعود لە (الأحساء) دەرچوو دانیشتووانەکەی هەڵگەڕانەوە لە دین و پەیمانیان شکاند و موسڵمانانیان کوشتن (بانگخواز و مامۆستاکان) ". (هەمان سەرچاوە ١٨٢ _ ١٨٣).

ئا بەو شێوەیە ئیبن غەننام لەسەر گشت جەنگ و شوێنەکان دەدوێت بەوەی وەهابیەکان بە موسڵمانان ناو دەبات و دژەکانی وەهابیش بە بێ باوەڕ و سەرگەردان وەسف دەکات، ئەو لادێ و شارانەی کە ملکەچی ئالی سعود بوون بە دیندار و دین پەروەری دەزانێت و شۆڕش بەرپاکردن دژ بە ئالی سعود بە لەدین دەرچوون و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دادەنێت. دەڵێت: " کاتێك یەکتاناسی و بنەماکانی جێگر بوون لە تێکڕای شوێنەکانی (الأحساء)، ئەوا خەم و پەژارە دڵی کەسانی دژە دینی داگیر کرد. زۆر پەیامیان ناردن بۆ حوکمڕانان و ڕاوێژیان پێدەکردن دژ بە (موسڵمانانی یەکتاناس) و پەیامیان نارد بۆ سولەیمان پاشای والی عوسمانی لە بەغداد، لە پەیامەکەدا باسی ئەوەیان بۆ والی ناوبراو کردووە کە تەنها (ثويني بن عبدالله) شیاوی ئەوەیە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە(موسڵمانان) بجەنگێت، جا والیش عەلی (ثوینی) هێنایە خوارەوەو هانی دا کە دژ بە (خەڵکی دیندار) بجەنگێت ". (هەمان سەرچاوە ١٩٣).

هەروەها " زۆرێك لە عەرەبە دەشتەکیەکان هەڵگەڕانەوەو پشتی (عەلی ثويني _ و _) گرت، ئالی (ظفير) پێشوازیان لێکرد، پەیمانی ئیسلامیان شکاند و هەڵگەڕانەوە... ئەو ئاشوب و فیتنەیە ئابڕووی زۆرێك لە خەڵکی برد، ئەو خەڵکانەی کە نەیانتوانی ئارام بگرن لەسەر ناخۆشی، شەیتان دیاردەی هەڵگەڕانەوەی بۆ ئەوان ڕازاندەوە، بۆیە پەیمانیان شکاند ". (هەمان سەرچاوە ١٩٤ و ١٩٥ و ١٩٩).

## کۆچ کردن و کوشتارو دەرچوون

دوای ئەوەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب تێکڕای موسڵمانانی بە بێ باوەڕ و هاوبەشدانەر دانا، بەشێوەیەك کە هەڵگەڕاونەتەوە بۆ سەردەمی نەفامی سەرەتا، لەوکاتەدا پێویست بوو شێخ فەرمان بکات بە شوێنکەوتووانی تا بەشێوەیەکی دەروونی و جەستەیی خۆیان لە "کۆمەڵگای نەفامی" جیا بکەنەوە و کۆچ بکەن بۆ لای شێخ لە پێناو ئەوەی سەر لەنوێ دەست بکەن بە بنیاتنانی "کۆمەڵگایەکی ئیسلامی یەکتاناس" و بانگەواز بکەن بۆ "دینی ئیسلام و یەکتاناسی".

بۆیە شێخ موحەمدی کوڕی عەبدولوەهاب کاتێك لە (درعیە) جێگیر بوو ئەوا ئەو شوێنەی ڕاگەیاند وەك (وڵاتی کۆچ کردن و ئیسلام) و داوای لە پشتگیران و شوێنکەوتووانی کرد کە کۆچ بکەن بۆ دڕعیە[1] جا شوێنکەوتووانی دەستیان کرد بە کۆبوونەوە لەدەوری و کۆچ کردن بۆ لای لە هەموو شوێنێکەوە [2] و بەپێی وتەی (شێخ حوسەین غەننام) کۆچ کردن لەوەوە

(١) لەبەر ئەوەی پێغەمبەری مەزن ~ کۆچ کردنی نەهێشت لە دوای ڕزگار کردنی شاری مەککە، ئەوا شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب خۆی بەناچار بینی کە بەشێوەیەکی تر بۆ کۆچ کردن بڕوانێت هەروەك لەوبارەوە دەڵێت: "کۆچ کردن بریتیە لەوەی دەربچیٚ لە وڵاتی هاوبەش و شیرك بۆ وڵاتی ئیسلام، ئەم کارە هەروەك ماوەتەوە تا ڕۆژی دوایی، بەڵگەش لە پێویست بوونی کۆچ کردن ئەوەیە کە لەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا ~ هاتووە: کۆچ کردن کۆتایی نایەت هەتا تۆبە دەپچڕێت و نامێنێت و تۆبەش هەر دەمێنێت تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت". الدرر السنية ١٣٤/١.

(٢) ابن بشر: عنوان المجد ٤٢.

دەستی پێکرد بەهۆی بوونی ناکۆکی لەنێوان وەهابیەکان و موسڵمانانی تر، "شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب" بۆ ماوەی دوو ساڵ لە (درعیە)دا مایەوە بانگی خەڵکی دەکرد بە بەڵگە و ئامۆژگاری چاك و پەیامی دەنارد بۆ دانیشتووان و سەرکردە و بەناو زانای شارەکانی تر جا هەیانبوو شوێنی کەوت و هەشیانبوو بە گاڵتە و فشەی وەرگرت و سوکایەتی پێکرد، شێخ موحەمەد دەستپێشخەر نەبوو لەوەی یەکێك تەکفیر بکات یان دەستدرێژی بکاتە سەر، تا ئەو کاتەی کە تێکڕای دژەڕاکانی هێرشیان کردە سەری بە دوژمنایەتی کردنی و لە تێکڕای شارەکان تەکفیر و بێ باوەڕی شێخ و تاقمەکەی ئەویان ڕاگەیاند و خوێنی ئەوانیان حەڵاڵ کرد، دەستیان کرد بە وەدەرنان و چۆڵکردنی شارەکان لە شێخ و شوێنکەوتووانی و ڕاوەدوونانیان بە ئەشکەنجە و ئازار و چەوساندنەوە. شێخ ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمانی نەکرد بە خوێن ڕشتن و ئەنجامدانی کوشتار سەرباری زۆری خەڵکی سەرگەردان و ئارەزوو پەرست، تا دژەڕاکانی شێخ سەرەتا دەستیان کرد بە حوکمدان لەسەر ئەو و شوێنکەوتووانی بە کوشتن و تەکفیر، جا لەو کاتەدا شێخ فەرمانی کرد بە کۆمەڵەکەی بە ئەنجامدانی پرۆسەی جیهاد، شوێنکەوتوو و کۆمەڵکەشی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە فەرمانی ئەویان بەجێ گەیاند "[1].

وەك یەکە چ شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەست پێشخەر بووبێت لە تەکفیر کردنی تێکڕای موسڵمانان هەروەك ئەوەشمان بەدی کرد لە بەشی ڕابردوودا چ دژەڕاکانی دەست پێشخەر بووبن لە تەکفیر کردنی ئەو و شوێنکەوتووانی، وتنی ئەوەی کە کۆمەڵگای ئیسلامی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ

(١) ابن غنام، تأريخ نجد، ٨٨ و ٨٩.

نەفامی سەرەتا ئەوا بەوهۆیە خەڵکی دابەش دەبن بۆ دوو بەش و بەسەر دوو وڵاتدا، کە لە وڵاتێکدا دانیشتووانەکەی بە "یەکتاناس"ە نوێیەکان دەزانێت، کەچی بە دانیشتووانی وڵاتەکەی تریش دا بە "هاوبەشدانەران" دەزانێت. وڵاتی یەکەم بە (وڵاتی ئیسلام) دادەنێت، لەهەمان کاتدا وڵاتی دووەم بە "وڵاتی جەنگ" دەزانێت[1]، ئیبن غننام بەخۆی باسی ئەوە دەکات کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب یەکەم جار کە هاتە درعیە بەیعەتی دا بە (ئەمیر موحەممەدی کوڕی سعود) لەسەر جیهاد. ئەویش پەیمانی پشتگرتن و جیهادی پێدا[2].

لەسەر ئەمە شێخ موحەممەد ڕایگەیاند کە تێکڕای وڵاتان "هاوبەشدانەران" وڵاتی جەنگن، فەرمانی کرد بە شوێنکەوتووانی کە بچنە پاڵی و خۆشەویستی و لایەنگیری دەربڕن و خۆیان بەری بکەن لە دوژمنەکانی. شێخ دۆستایەتی و دوژمنایەتی (الولاء و البراء)ی بە یەکێك لە مەرجەکانی باوەڕی دانا و فەرامۆش کردنی ئەو مەرجەی بە هەڵوەشێنەرەوەیەکی لە (دە) هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمانی دانا. جەنگی

---

(١) تا لێرەوە شێخ وتویەتی: "ئەو مەسەلەیەی کە بریتیە لە هاوبەشدانان بەهۆی پەرستنی پیاوچاکان ئەوە ئەو مەسەلەیەیە کە خەڵکی بەهۆیەوە دابەش دەبن بۆ موسڵمان و بێ باوەڕ و هەر لێرەشەوە بوو کە دژایەتی هاتە کایە و لەو پێناوەش خوای گەورە جیهادی پێویست کرد هەروەك خوای پاك و بەرز دەفەرموویت: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ واتە: (ئێوەش بجەنگن دژیان تاوەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت)". محمد بن عبدالوهاب: رسالة ١٢٨ مسألة من مسائل الجهلية.

(٢) ابن غنام، تأريخ نجد ٨٧.

ڕاگەیاند لە دژی "بێ باوەڕان" بەتایبەتی لە دژی ئەوەی کە بۆی ڕوون بۆتەوە کە یەکتاناسی دینی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، دوای ئەوەش ڕقیان لێ بووەتەوە و خەڵکیان لێ دوور خستۆتەوە، تا دین و بەرنامە و گوێڕایەڵی هەر بۆ خوای گەورە بێت "[1].

شێخ خوێنی گشت ئەو موسڵمانانەی بەفیڕۆدا و، ماڵ و نەوەکانی ئەوانی بە حەڵاڵ دانا، کە ناوی ناون بە: "هاوبەشدانەران" و داوای لە موسڵمانان کرد کە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ سەر یەکتاناسی، شێخ وتی: " هەر کەسێ لەوان پاشگەز بووە ئەوا خوێن و نەوەکانی پارێزراون، هەر کەسێکیش پێداگیری کرد لەسەری، ئەوا خوای گەورە خوێن و نەوەکانی حەڵاڵ دەکات، وەك ئەوشتانەی هاوبەشدانەران کە بۆ پێغەمبەری خوا حەڵاڵ کران "[2]. ئەمەش لەبەر ئەوەی: " تەنها دەربڕینی وشەی یەکتاناسی و زانینی ماناکەی نابێتە هۆی پاراستنی خوێن و ماڵ و سەروەت و سامانی بێژەرەکە، دانانیش بە یەکتاناسی بەس نیە، تەنانەت ئەوەش بەس نییە کە تەنها لەخوای گەورە بپارێتەوە، بەڵکو ماڵ و خوێنی بەوە پارێزراو دەبێت کە بێ باوەڕی خۆی دەرببڕێت، بەرامبەر بەو شتانەی کە جگەلە خوای گەورە دەپەرسترێن، ئەگەر گومانیشی هەبوو لەبێ باوەڕیان یان دوودڵ بوو ئەوا خوێن و سەروەتی پارێزراو نابێت "[3].

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ٢٦٤.

(٢) محمد بن عبدالوهاب: تطهير الاعتقاد ٣٥.

(٣) محمد بن عبدالوهاب: كتاب التوحيد، دەروازە: تەفسيرى يەكتاناسى و شايەتمانى (لا اله الا الله).

سەربارى ئەوەى كە لەدەرنجامى پرۆسەى تەكفير و پابەندبوون بە بنەماى كۆچ كردن و كوشتار ويستى وەهابيەكان بەدەركەوت كە دەيانەويت دەربچن دژبە دەولەتى "بێ باوەڕ" و دژايەتى كردنى "كۆمەلگاى نەفامى"، بەلام وەهابيەكان زۆر پێداگيريان كرد لەسەر ئەوەى كە تۆمەتى (دەرچوون) لەسەر خۆيان لادەن و بەتوندترين شێوە خۆى لێ بەرى بكەن. ئەمەش لەترسى ئەوەبوو كە تا ئەو فەرموودانە لەسەر ئەوان نەچەسپێن كە لەسەر (خەواريج[1]) هاتوون، چونكە خەواريج نەفرەتيان لێكراوە لەسەر زمانى پێغەمبەر ~ لە كەلەپورى سوننيدا ويستراو نين و پەراوێز خستنيان بەپێويست دەزانرێ. سەربارى ئەوەى كە دەرچوونى وەهابيەت چەند مانايەكى ترى لێ دەخوازرانەوە وەك تەحەدا كردنى دەولەتى عوسمانى و هۆكارێكيش بوو بۆ ئەوەى دەولەتى ناوبراو وەهابيەكان سەركوت بكات. بۆيە وەهابيەكان جياوازيان دەكرد لەنێوان خۆيان و (خەواريج) بەوەى خەواريج موسلمانانيان

---

(١) خەواريج: ئەو دەستەو كۆمەلە بوون كە لە سەردەمى ئيمامى عەلى (خواى لێ ڕازى بێت) خەليفەى چوارەمى ڕاشيدين دەرچوون دژ بە خەليفەى ناوبراو، لەبەر ئەوەى پەناى بردبوو بۆ ئاشتەواى (صلح) كردن لەگەلْ موعاوييە والى ويلايەتى شام. ئەم دەستەيە ئيمامى عەلى و هاوەلانيان تەكفير كرد بەهۆى ئاشتەواييەكە و داوايان دەكرد كە خەليفە تەوبە بكات لەوكارەى خۆى. ئەم دەستەيە ژمارەيان زۆر بووە ديندارببوون بەلام زاناو دانا نەبوون بەلكو بەڕوالەتى و بەشێوەيەكى سادە بۆ دەق و حوكمەكان دەيانڕوانى. ئيمامى عەلى (خواى لێ ڕازى بێت) عەبدوللاى كوڕى عەبباس (خوا لێيان ڕازى بێت) ڕەوانەكرد بۆ وتوێژ لەگەلّيان و توانى ژمارەيەكى زۆريان لێ پەشيمان بكاتەوەو پاشماوەكەى ترى خەواريجيش كە دەستيان كرد بە ڕێگرى و كوشتنى موسلمانان ئەوسا ئيمامى عەلى (خواى لێ ڕازى بێت) جەنگى لەگەلْ كردن و تەفرو توناى كردن. هەندێ تاك و توك و پاشماوەى بچوك لە خەواريجەكان هەر مابوون و ئيمامى عەلى (خواى لێ ڕازى بێت) بەدەستى يەكێك لەو خەواريجانە كوژرا. (وەرگێڕ).

تەکفیر دەکرد لەسەر گوناهی گەورە، کەچی وەهابیەت لەسەر گوناهی گەورە تەکفیر کەس ناکات، بەڵکو کەسانێ تەکفیر دەکات بەهۆی ئەنجامدانی هاوبەشدانان و ئەمەش پێویستە تەکفیر بکرێ. وەك وەهابیەکان دەرچوونیان دژ بە دەوڵەتیان ڕاگەیاند بێت و ئیعترافیان پێ کردبێت یان نا، ئەوا تیۆرەکەیان لە جوغزی خۆیدا پاساوی گەورەی گڵدابووەوە بۆ دەرچوون دژ بەدەوڵەت و پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، بەتایبەتی لەکاتێکی گونجاودا و لەگەڵ فەراهەم بوونی توانا و هێز لەلایەن ئەوانەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە (مرجع)ی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، کە (ئیبن تەیمییە) ئەوا دەبینیت کە ئیبن تەیمیە پەنجەرە و دەلاقەیەکی گەورە دەکاتەوە بۆ شۆڕش کردن و درچوون و یاخی بوون لە ئیمام جا هەر ئیمامێك بێت، هەل و فرسەت دەدات بەهەر خاوەن توانا و هێزێك کە یاخی ببێت لە ئیمام، چونکە لە بنچینەدا ئیبن تەیمیە بڕوای بەئیمامەتی ئەو کەسە هەیە کە زاڵ بووە، بەبێ لە بەرچاوگرتنی هاتنەجێی مەرجە شەرعیەکانی ئیمامەت یان هەڵبژاردنی لەلایەن کەسانی پسپۆری دیاری کراو کە کار ڕاییدەکەن و هەڵدەوەشێننەوە (أهل الحل و العقد)، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو کەسە دەرچووە زاڵبووەکە پابەندبوو بە شەریعەتی ئیسلامەوە و پاساویشی ئەوەبووە لەسەر دەچوونەکەی بەوەی ئیمامی پێشەخۆی پابەندی شەریعەت نەبووە، چونکە ئیبن تەیمیە دەرچوون دژ بە ئیمام بە دەرچوونی حەقیقی و نەفرەت لێکراوی دانەناوە بەڵکو دەرچوون لە شەریعەت بە دەرچوونی حەقیقی دادەنێت، بۆیە هەموو هەوڵێکی داوە تا دەرچوون دژ بە (ئیمام) بگۆڕێت بە دەرچوون دژبە (شەریعەت) (واتە بەم جۆرە بۆ هەموو

کەسێك ڕەوا دەبێت کە دژ بە ئیمام دەربچێت، بەپاساوی ئەوەی کە ئەو دەرچوونەی شەرع سەرزەنشتی کردووە بریتیە لە دەرچوون لە شەریعەت)[1].

بە تێڕوانینی ئیبن تەیمیە ئیمام ناوەندێکی شەرعی نیە، بەڵکو شەریعەت پێوەرە بۆ شەرعیەتی هەر سیستەمێك. بۆیە لەمەدا ڕای جیاواز بوو لەگەڵ تێکڕای شەرعزانانی پێشووی سوننە ئەوانەی کە جۆرێ لە پیرۆزی و شەرعیەت دەدەنە پاڵ حوکمڕان و دەرچوون لە دژی بە حەڕام دەزانن. ئیبن تەیمیە جەنگ کردن لەگەڵ خەواریجەکانی ڕەت کردەوە (یان شۆڕش گێڕان کە شۆڕش دەکەن)، ئەمەش لەبەر ئەوەی خەواریج پشتیان بەستبوو بە تەئویل، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە هیچ فەرمایشتێکی ڕاست و صەحیح هەبێت کە فەرمان بکات بە جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەی دەردەچن دژ بە ئیمام، لەوبارەوە دەڵێت: تاکە فەرموودە کە دەیخەنەڕوو، فەرموودەی (کەوثەری کوڕی حەکیمی کوڕی نافیعە) کە فەرمایشتێکی هەڵبەستراو (موضوع)ە، بەڵام ئەو فەرموودانەی کە ڕاستن بەدەق پێداگیری دەکەن لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ دەرچووان ئەوا مەبەستی جەنگ کردنە لەگەڵ دەرچووان لە شەریعەت نەوەك دەرچووانی دژبە ئیمام، دەڵێت: " بەڵام هیچ دەقێك نیە لەهەمبەر جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەی لە گوێڕایەڵی ئیمامێکی دیاریکراو دەردەچن، ئەوانەی سەرەتا (مەبەستی ئیبن تەیمیە شەرعزانەکانە کە سێ هەڵەیان کردووە[2]) سێ شتی قەدەغەکراویان ئەنجامدا:

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) وەرگێڕ.

یەکەم: (بڕوا بوونیان) بە کوشتاری هەر کەسێ لە گوێڕایەڵی پاشایەکی دیاریکراو دەردەچێ، هەرچەندە ئەو کەسە کە دەرچووە لە شوێنکەوتنی شەریعەت و سوننەتیشدا وەك ئەو پاشایە وابێ یا نزیك بێت لەوەوە، لەبەر دروست بوونی پەرت بوون، پەرتبوونی ئوممەتیش خۆی لەخۆیدا ئاشوب و فیتنەیە.

دووەم: بە یەکسان کردنی ئەوانەی لە گوێڕایەڵی پادشایەکی دیاریکراو دەردەچن لەگەڵ ئەوانەی هەڵگەڕاونەتەوە لە هەندێ دروشم و یاساکانی ئیسلام.

سێیەم: بەیەکسان کردنی ئەوانە لەگەڵ خەواریجەکان ئەوانەی لە ئیسلام دەرچوون، بۆیە دەبینی دەستەیەك لەو شەرعزانانە بەپێی زۆرێك لە هەوەس و ئارەزووی پاشاو حوکمڕانان دەجوڵێنەوەو فەرمان دەدەن هاوشانیان جەنگ بکرێت دژ بە دوژمنانیان، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئەوان دادگەرن و ئەوانی تر یاخی بوون "[1].

بەم پێیە ئیبن تەیمیە ئیعتراف دەکات بەبوونی فرەیی لایەنی سیاسی لەسەردەمی پاشادا، بڕوای نییە بە پێویست بوونی هەبوونی یەك خەلافەت، ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەهلی سوننەیە کە بڕاوی هەیە بە بوونی خەلافەتێکی یەکگرتوو، ئیبن تەیمیە بەدروست دەزانێت کە دژبە پێشەوای دادپەروەر دەربچێت بەهۆی تەئویلێك یان گومانێك هەروەك (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دەرچوو دژبە ئیمامی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)، سەرباری ئەوەی کە ئیبن تەیمیە بە فەرزی دەزانێت لە دژی ئەو پێشەوایە دەربچن کە

---

(١) ابن تیمیه، مجموع الفتاوی ٢٥٤/٤.

شەریعەت جێبەجێ ناکات و تەنانەت جەنگ لەگەڵ ئەو جۆرە پێشەوایانە بەپێویست دەزانێت[1].

مادام (ئیبن تەیمیە) گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە دەرچوون دروستە و شۆڕش پێویستە و بەکارهێنانی هێز ڕەوایە دژبە ئەو کەسەی پابەندی شەریعەتی ئیسلام نابێت، ئەگەرچی تەکفیری تێکڕای ئوممەتیشی نەکردبێت، ئەوا شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب کە حوکمی هەڵگەڕاوەی بەسەر تێکڕای ئوممەت دا. ئەوا لەپێشترە لەوەی پابەند نەبێت بە دەوڵەت و ملکەچ نەبێت بۆ پێشەواو ئیمامی (ئوممەتی بێ باوەڕ) و هەڵسێت بەدەرچوون دژبە دەوڵەتی ئیسلامی و هیچ واتایەکی وا لە فەرمایشەکانی پێغەمبەردا بەدی نەکات کە گوێڕایەڵی پێویست بکات بۆ پێشەوا. بۆیە شێخ موحەممەد هیچ پابەندبوونێکی بەدەوڵەتی عوسمانیەوە نەبینی یان هەوڵبدات بۆ پابەندبوون بە جەماعەتەوە، چونکە جەماعەت لە تێڕوانینی شێخدا بریتیە لە (کۆمەڵەی یەکتاناسی) وەهاب و بەس، تەنها وەهابیەکانن: (لەسەر ڕێی ڕاست و موسڵمانن)، کە پێویستە لەسەر خەڵکانی نا وەهابی گوێڕایەڵی دەرببڕن و بچنە ناو کۆمەڵەی وەهابیەکانەوە.

لەو کاتەی کە پێویست بوو شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بەخۆی ڕابەرایەتی بزوتنەوەکە یان دەوڵەتی وەهابی یان (ئوممەتی ئیسلامی نوێ)

---

(١) شێخولئیسلام باوکی عەبباس ئەحمەدی ئیبنو تەیمیە وتویەتی: هەر کۆمەڵێك پابەندی شەریعەت نەبێت لەو شتانەی ڕوون و (متواتر)ن لە ئیسلام دا ئەوا پێویستە جەنگیان لەگەڵ بکرێت تا پابەندی شەرعی ئیسلام دەبن، ئەگەرچی کۆمەڵەکە شایەتمان بێنن و هەندێ لە شەریعەتیش جێبەجێ بکەن ". أبو بطين، عبد الله بن عبد الرحمن:(مجموع الرسائل و المسائل النجدية ١٦٩/٢).

بکات، کە بەدەستی خۆی بنیاتی دەنا، هەروەك چۆن هەر شۆڕشگێڕێکی تر هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی شوێنکەوتووانی و ئەنجامدانی شۆڕش بۆ بینا کردنی سیستەمێکی نوێی کە خۆی دەیەوێت، خۆشی وەك ڕابەری سیستەمی شۆڕشەکە ڕادەگەیەنێت... بەڵام شێخ لەبەر هەر هۆکارێك بێت ئەوا پێی چاکتر بوو کە هاوپەیمانی ببەستێت لەگەڵ چەند ئەمیرێکی ناوەخۆی (محلي) لە نەجد، پەیمان پێدان بەو ئەمیرانە بە مەرجی سەرخستن.

هاوپەیمانیەکە ڕوون بوو لە پەیوەندی شێخ موحەمەد لەگەڵ ئەمیری (عەیینە) عوسمانی کوڕی موعتەمەڕ، هەروەك پەیوەندی شێخ ڕوون بوو لە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئەمیری (دڕعییە) موحەمەدی کوڕی سعود دواتریش بەتەنیا بەیعەتی پێدا بەو هۆیەش بناغەی (دەوڵەتی سعودییەی وەهابی سەرەتا)ی دامەزراند.

هەروەك گێڕەرەوە مێژوویەکان ئەوە دەردەخەن: کە شێخ موحەمەد دوای ئەوەی لە (عەیینە) دەرکرا پەنای بۆ یەکێك لە پشتگیرانی برد لە (دڕعییە) کە ناوی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی سولەیم بوو، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەمیر (موحەمەدی کوڕی سعود) زانیاری هەبێت لەبارەی هاتنی شێخ و بەبێ ئەوەی ڕازی بێت بەهاتنی، بەڵام براکانی ئەمیر: (ثنیان و مشاري)، خێزانەکەی ئەمیر (موضی) و کوڕەکەی عەبدولعەزیز، ئەمیری ناوبراویان ڕازی کرد بەوەی بچێت بۆ لای شێخ لەماڵەکەی دا تا بەخێرهاتنی بکات و پشتگیری خۆی بۆ شێخ دەربخات و پێی بڵێت: " ئەی شێخ، ئەمە ئەو دینەی خواو پێغەمبەرەکەیەتی کە هیچ گومانێکی تێدا نییە، موژدە بدە بەوەی پشتیوانی خۆت و ئەوەی

فەرمانت پێکردووە دەکرێ، و جیهادیش دژ بەوانە ڕادەگەیەنین کە دژی یەکتاناسین "[1].

شێخ بە ئیبن سعودی وت: "منیش موژدەت پێدەدەم بە سەربەرزی و پایەداری و پشتگرتن، ئا ئەو وشەی یەکتاناسییە کە گشت نێردراوان بانگەوازیان بۆ کردووە، جا هەر کەسێك دەستی گرت و کاری کرد و پشتی ئەو وشەی گرت. ئەوا وڵات و بەندەکان دەخاتە ژێر ڕکێف و باڵی خۆی، تۆش دەبینیت کە (نەجد) و شوێنەکانی بە هاوبەشدانان و نەزانی و پەرتەوازەیی و ڕاجیایی و کوشتنی یەکتری ئالۆدە بوون، هیوام وایە کە تۆ ببیت بە پێشەواو ئیمامێك کە موسڵمانان کۆکبن لەسەرت و دواتر ئەو پێشەوایەتیە بۆ نەوەکانی تۆ بێت لەدوای تۆ ".

ئیبن سعود داوای لە شێخ کرد بەیعەتی پێبدات، شێخ لەسەر وتەکانی پێشووی بەیعەتی پێدا، پێی وت: خوێنم خوێنتانە ژیانم لەگەڵ ژیانتانە، و هەرگیز شێخ ئیبن سعود بەجێ نەهێڵێت و پشتی تێنەکات کاتی سەرکەوتن[2].

تا ڕادەیەکی زۆر دەق (نص)ەکە ڕوون و ئاشکرایە لە بەیعەتدانی شێخ بە ئەمیر و مانەوەی لە پۆستی ئەمیرایەتیەکەی "وەك پێشەوایەك کە موسڵمانان لەسەری کۆك بن"، شێخ بەیعەتی بەمەرجێك پێدا کە ئەمیر پشتی بگرێت و لە بەرامبەردا شێخ پەیمانی پێدا بە خستنە ژێردەستی نەجد یان دوورگەی

---

(١) ئیبن سعود دوو مەرجی دانان بۆ پشتیوانی کردنی شێخ کە بریتین لە: پاش سەرکەوتن شێخ نەچێتە دەرەوەی (درعیيە)، ڕێساکەی ئیبن سعودی قبوڵ بێت کە سەپاندوویەتی بەسەر بەروبوومەکان لە هەموو ساڵێکدا. بگەڕێوە بۆ: ابن غنام: تاريخ نجد، ص ٨٧، و: عنوان المجد، ابن بشر.

(٢) عثمان بن عبد الله بن بشر: عنوان المجد في تأريخ النجد ٤٢/١.

عەرەبی و چاکترین پشتگیری پێشکەش کرد بەئەمیر ئەویش بە پێدانی سیفەتی (شەرعیەتی دینییە) بە سیستەمی حکومەکەی.

شێخ رازی بوو بەوەی یارمەتی ئەمیر بدات و پشتیوانی بکات بەمەبەستی سەرخستنی بەبێ رەچاوکردنی رێگای گەیشتن بە دەسەڵات. چونکە شێخ لە بنچینەدا بڕوای هەبوو بە رەوای ئیمامەتی کەسی زاڵ بوو، هەروەك دەڵێت: " پێشەواکانی گشت مەزهەبەکان کۆکن لەسەر ئەوەی هەر کەسێك زاڵ بوو بەسەر شارێك لە شارەکان، ئەوا خۆی دەبێتە خاوەن دەسەڵات لە گشت لایەنێکدا. ئەگەر ئەمەش نەبووایە ئەوا دونیا بە ئارامی جێگیر نەدەبوو، چونکە خەڵکی کاتێکی زۆر بەر لە ئیمامی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) تا ئەمرۆ هیچ کاتێك کۆك نەبوونە لەسەر یەك ئیمام "[1].

سەرەڕای ئەوەی کە گێڕانەوەو ڕیوایەتەکەی (ئیبن غەننام) ڕوون و ئاشکرابوو لەهەمبەر بەیعەتدانی شێخ موحەممەد بە (ئەمیر ئیبن سعود)، بەڵام مێژوو نوسی پاشین (عوسمانی کوڕی بیشر) جۆرێك لە لێڵی و نادیاری دەخاتە سەر حەقیقەتی پەیماننامەکەی شێخ و ئەمیری ناوبراو ئەمەش کاتێك دەڵێت: " بێگومان هەڵوەشاندنەوەو بەستن و دەست گرتنەوەو بەخشین و پێشخستن و دواخستن بەدەستی شێخ بوو، هێزی سەربازی خۆی ئامادە نەدەکرد و بۆچوونێك لە (موحەممەدی کوڕی سعود) و عەبدولعەزیز دەرنەدەچوو مەگەر

---

(١) ئەمەی وتوە کاتێك هەندێ بەڵگەیان دژبە شێخ هێناوە، دوای ئەوەی شێخ دادوەری (عەیینە) بوو لەژێر سایەی میرنشینی (ئیبن معمر) و لەوکاتەدا شێخ هەڵسا بە ڕەجم (بەرد باران) کردنی ئافرەتێکی زینا کەر، ئەوانەی دژی شێخ بەڵگەیان هێناوە ڕەخنەیان لێگرت بەوەی کە شێخ ئەگەرچی دادوەریش بێت بەڵام دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی سزای تاوانەکەی لەلایەن ئیمام و خەلیفەی پێی ئەسپێردراوە.

به بۆچوون و ڕازی بوونی شێخ نەبووایە. کاتێك بەیارمەتی خوای گەورە شاری (ریاز)یان ڕزگار کرد و شوێنەکە فراوان بوو ڕێگاکان ئارام و هێمن بوون و گوند نیشین و شار نیشین ملکەچ بوون ئەوا لەوکاتەدا شێخ فەرمان و کاروباری موسڵمانان و ئەرکی خەزێنە (بەیتومال)ی دا دەست عەبدولعەزیز و شێخ خۆیشی لە کاروباری دونیایدا داماڵی و سەرگەرمی پەرستش و بڵاوکردنەوەی زانست بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولعەزیز هیچ کارێکی یەکلا نەدەکردەوە بەبێ ویست و ڕەزامەندی شێخ "[1]، هەر ئەمەشە کە نارۆشنیەك دەخاتەڕوو لەهەمبەر ئەوەی کە: کێ بەیعەتی دا بە ئەویتر؟ و کێ بووە ئیمامی گەورە؟ بە کرداری ئەمیری کوڕی سعود؟ یان ئیمامە نوێیەکە موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب؟.

بەڵام بەهەر حاڵ دەکرێ بووترێت: شێخ پێگەیەکی ئاراستەکەر (ڕێنمایی)کاری هەرە گەورەی دەست خست هاووێنەی پێگەی (وەلی فەقیه) کە ئیمامی خومەینی خۆی وەك خاوەنی ئەو پێگەیە ناساند لە کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەمەش وەك ڕێنمایکاری بەرزتر لە سەرۆکی کۆمار. بەڵام ئیمامی کرداری هەر ئەمیر موحەمەدی کوڕی سعود بوو. بە بەڵگەی ئەوەی کە (ئیبن بیشر) دەڵێت: شێخ دانی نا بەوەی کە ئەمیر ئیبن سعود "ئیمامە و پێویستە لەسەر موسڵمانان کۆك بن لەسەری ". ئەوەی جەخت لەسەر ڕاستی ئەمە دەکاتەوە هاتنی عوسمانی کوڕی مەعمەڕە ئەمیری (عەیینە) بۆ (دڕعیە) ئەمەش دوای پەیمان بەستنەکەی نێوان شێخ و ئەمیر ئیبن سعود، هاتنی ئیبن مەعمەڕ بۆ ئەوەبوو کە هەوڵی گێڕانەوەی شێخ موحەمەدی کوڕی

---

(١) عثمان بن عبد الله بن بشر، عنوان المجد في تأريخ النجد ٤٦/١.

عەبدولوەهاب بدات بۆ لادێکەی خۆی و میرنیشینەکەی لە پێناو ئەوەی کە شێخ بەیعەت بدات بە ئیبن مەعمەڕ و پشتیوانی بکات. ئەگەر (شێخ) خۆی وەك ئیمامێك ڕاگەیاندبووایە ئەوا ئیبن مەعمەڕ ملکەچی دەبوو و هەوڵی گێڕانەوەشی نەدەدا بۆ (عەیینە).

گێڕانەوەیەکی تریش هەیە کە خاوەنی کتێبی (لمع الشهاب) دەیخاتەڕوو، کە نووسەرێکی نەناسراوە بەڵام وەهابی نیە، خاوەنی کتێبی ناوبراو دەدوێت لەسەر گرێبەستێکی ڕاشکاو لەگەڵ ئەمیر موحەمەدی کوڕی سعود، لەسەر دابەش کردنی دەسەڵاتی دینی و سیاسی و ڕێکەوتن لەسەر میراتگرتنی ئەو دوو دەسەڵاتە لە ناو هەر دوو خانەوادەی شێخ و ئەمیر. شێخ بە ئیبن سعودی وتوە: " پەیمانم پێبدە کە جیهاد لە پێناو دیندا بکەیت و سەرۆکایەتی و ئیمامەت بۆ تۆ و نەوەکانی تۆ و شێخایەتی و خەلیفایەتی لەبواری دیندا بۆ من و خانەوادەم لەدوای من تا هەتایە، بەشێوەك کە کارێك ڕێك نەخرێت و ئاشتەواییەك نەکرێت جەنگێك بەرپا نەکرێت بەبێ ویست و ڕەزامەندی ئێمە، جا ئەگەر ئەمەت قبوڵ کرد ئەوا پێت ڕادەگەیەنم: خوای گەورە شتانێکت پێ دەبەخشێت کە گەورە پاشاکان و دەسەڵاتداران پێی نەگەیشتوون " ئەمیر ئیبن سعود وتی: (قبوڵمە و ڕازیم و پەیمانت پێدەدەم لەسەر ئەمە) [١].

خاوەنی (لمع الشهاب) ئەوەش زیاد دەکات، بەوەی کە دەسەڵاتی شێخ باڵی کێشابوو بەسەر ئالی سعود دا، لەو بارەوە دەڵێت: "ئیمامەتی هەر گەورە هی موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بووە، بەهەمان شێوە کاروباری دونیایش وەك جەنگ بەرپاکردن و ئاشتەوایی و دوژمنایەتی کردن و ئەوەی پەیوەستە بە

---

(١) لمع الشهاب ٣٠ _ ٣١ .

ئامرازەكانی جەنگەوە..... لە دەرەنجامدا هەموو كارەكان هەر بەدەستی موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب بوون، بەشێوەیەك كە هەرچی موحەمەدی كوڕی سعود یان منداڵەكانی ویستیان لەسەربایە ئەوا دەگەڕانەوە بۆ لای موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب، جا ئەگەر موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب ڕازی بووایە ئەوا ئەوانیش ڕازی دەبوون ئەگەر ئەو ڕەتی كردبایەوە ئەوا ئەوانیش ڕەتیان دەكردەوە ".

وا باو و نەریت بوو كە ڕۆژانە موحەمەدی كوڕی سعود و كوڕەكەی عەبدولعەزیز و كوڕەكانی تری دوو جار سەردانی شێخیان دەكرد بەیانیان جارێك و ئێواران جارێكی تر، بە ملكەچی و بێ دەنگییەوە دادەنیشتن و قسەیان نەدەكرد تا شێخ سەرەتا دەستی بە قسە كردن نەكردبایە، لەلایەن شێخ وانەی یەكتاناسیان دەخوێند[1].

ئەو گێڕانەوەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب خاوەنی پلەو پایە و پێگەیەكی زۆر بەرزبووە لە سایەی میرنشینی ئالی سعود، لەگەڵ ئەوەی كە دەكرێ وابێت (واتە ئەوەی خاوەنی"لمع الشهاب" باسی كردووە[2]) بەڵام ئەو گرێبەستەی كە باسكرا ئەوا لە لایەنی مێژووییەوە نەچەسپاوە، بەتایبەتی ئەگەر سەیر بكەین دەبینین كە شێخ لە شوێنی خۆی دەركرابوو و پەنابەر بووە لە (درعیە) دا ئەمەش ئەوە بۆ ئێمە دەردەخات كە شێخ ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساوە كە مەرج بنوسێت و مەرج دابنێت لەسەر ئەمیر موحەمەدی كوڕی سعود، تەنانەت شێخ هەوڵی

---

(١) لمع الشهاب ٣٥.

(٢) وەرگێڕ.

قۆستنەوەی هەل و فرسەتێکی دەدا بۆ ئەوەی ئەمیری ناوبراو ڕازی بکات، تا ڕێی پێبدات لەژێر دەسەڵاتی میرنشینەکەی دا جێگیر ببێت، دواتر شێخ پشتیوانی خۆی بۆ ئەمیری ناوبراو دەربخات. تەنانەت لە پێناوی ئەوەدا شێخ مەرجی (قوڕەیشی بوون)ی لە ناو مەرجەکانی خەلیفە بوون لابرد و فەرامۆشی کرد، کە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ئاماژەی پێدراوە، بەڵکو نەریتی ئەهلی سوننە و فەرموودەناسان کە قوڕەیشی بوون بەمەرج دادەنێن، بەتایبەتی حەنبەلیەکان زۆر بەتووندی پێیەوە پابەندن[1].

(١) د. حاكم المطيري دەڵێت لەبارەی مەرجی قوڕەشی بوون: " سەیری فەتحولباری (١٩/١٣) بکە (حافظ) گومانی لەسەر ئەوە هەیە کە قوڕەیشی بوون کۆڕای لەسەربێ، چونکە لە عومەڕ دەگێڕنەوە کە ویستوویەتی موعازی کوڕی جەبەل و سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە بکاتە جێنشین، (ابن كثير)یش ئەم ئیشکالە لە (البداية و النهاية)(٥٨/٩)دا دەخاتەڕوو کە چۆن دەبێت زانایانی عێراق و باشترینی تابیعین بەیعەت بدەن بە (ابن الأشعث) کە قوڕیشی نیە و لە (كنده) بووە؟ لەوانەش بەیعەتیان پێیدا (عامری الشعبی) و (سعيد بن جبير) و زۆرێك لە قوڕەیش و هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەم کێشەیە لە سەدەی یەکەمدا لە ئەسڵدا دیاروو بەرچاو نەبووە، لە سەردەمی عەبباسیشدا بەپێی ئەمری واقیع بانگەشەی کۆڕابوونی لەسەر کراوە، ئەگەرنا ئەو دەقانەی هاتوون زیاتر بە هەواڵ گێڕانەوە (اخبار) دەچن وەك لەوەی بڕیارو (احكام) بن پشتیوانانیش هەروا تێگەیشتوون. (ابن ابى شيبه) لە (منصف) دا لە عائیشە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(ئەگەر زەید زیندوو بوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیکردە جێنشین، زەیدی کوڕی حاریسەش قوڕەیشی بوو، ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا (٢٠/١) لە ڕێگەی ئەبو ڕافیعەوە لە عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:( ئەگەر بگەیشتمایە بە دوو پیاو و ئەم کارەشم بسپاردایە پێیان ئەوا دەم سپارد بە سالمی مەولای حوزەیفە و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح)، ئەحمەد شاکر فەرموویەتی ئیسنادەکەی سەحیحە، ئەحمەدیش (١٨/١) لەڕێگەی (شريح بن عبيد راشد بن سعد) و جگە لەم دووانەشەوە گێڕاویەتیەوە کە عومەر فەرموویەتی:(ئەگەر ئەجەلم هات ئەبو عوبەید وەفاتی کردبوو ئەوا، موعازی کوڕی جەبەل ئەکەمە جێنشین، (حافظ) لە (فتح)دا

دەکرێ بڵێین کە شێخ بەڕاستی سیستەمێکی دوولایەنی تێکەڵی بنیادنا کە ئەمیرایەتی و شێخایەتی دینی لەخۆ گرت، ئەوەشی بە تەواو و بەس زانی کە سیستەمی سعودی پشتیوانی و پەرە بە بنەماکانی وەهابیەت بدات و ڕێزی ڕۆڵی پیاوانی ئایین بپارێزێت، کە دواتر بەزۆری نەوەکانی شێخ دەبنە خاوەنی پێگەی پیاوانی ئایین، ئەمەش وەك هاوپەیمانیەتێکی کۆن و پێشینەیە.

---

(١٩/١٣) وتویەتی: پیاوەکانی جێی متمانەن، فەرموودەکە (مرسل)ە، بەڵام لە کۆمەڵێك زانایانی تابعینی شامەوە باسکراوە بەهۆی ڕێگەکانی تری هاتنیەوە بەهێز دەبێ " . بگەڕێوە بۆ:(ئازادی یان تۆفان، نوسینی: د.حاکم المطیری، و. فاتح محمد سەنگاوی ١٣٢، نوسینگەی تەفسیر، چ ١، ١٤٢٨ك _ ٢٠٠٧ز). (وەرگێڕ).

## له دایک بوونی ئاشتیانه

هەروەك تێبینی ئەوەمان کرد کە لە دایکبوونی دەوڵەتی یەکەمی وەهابی سەرباری توونڕەو نەبوو، بەڵکو لە دایك بوونێکی ڕۆشنبیری ئاشتیانە بوو، لە ڕاستیدا بارودۆخی جوگرافی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و دیمۆغرافی دەورووبەری نەجد، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەمەر دەستپێکی بزوتنەوەی وەهابی لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەهەمی کۆچی، کە وایکرد سروشتی بزوتنەوەکەی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بە ئاشتیانە لەدایك بێت، نەجد دەکەوتە قوڵای بیابانی عەرەبی و هەژاریش بوو لە پەراوێزو دامێنی دەوڵەتی عوسمانی دا دەژیا و دەوڵەتی عوسمانی زۆر گرنگی پێی نەدەدا، لەلایەنی سەربازییەوە دەستی بەسەردا نەگرتبوو بەڵکو ئەوەی بە بەس زانیبوو کە دەست بگرێت بەسەر هەرێمەکانی دەورووبەردا وەك:(حیجازو یەمەن و ئەحساء و عێراق و شام)، ئەم بایەخ پێنەدانەی دەوڵەتی عوسمانی وەك هەل و فرسەتێك بوو لە بەردەم نەجد ڕەخسا بوو تا چەندین میرنیشین دروست ببن لە گوند و شارو ناو هۆزەکانی بیابان. کاتێك موحەمەدی کوڕی عەبدلوەهاب دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی تێڕوانین و فیکرە چاکسازییەکانی لە (حریملا)، توانی هەندێ پشتیوان بۆ خۆی دروست بکات بەڵام تووشی تەنگ پێ هەڵچنین و هەوڵی پەنهان کوژی درا، کە ناچاربوو دەربچێت لە لادێکە و بچێتە یەکەم لادێی خۆی کە (عەیینە)یە و ئەمیرەکەی عوسمانی کوڕی مەعمەڕ خێرا بەرەو ڕووی هات و پشتیوانی کرد و یارمەتی دا، بۆ ماوەی

چەند ساڵێك شێخ لە ژێر پاراستنی ئەمیری ناوبراودا مایەوە (لە ١٤١٣ تا ١١٥٧)، لەو ماوەیەدا توانی شوێنکەوتوو و پشتیوانانی زیاتر بکات، بەشێوەیەك کە توانی هەندێ لەو فیکرانەی جێبەجێ بکات کە بانگەشی بۆ دەکرد وەك ڕووخاندنی هەندێ گۆڕ (گۆڕی زەیدی کوڕی خەتتاب) و بڕینی هەندێ درەخت کە هەندێ لە خەڵکی نەزان پەنایان بۆ دەبرد بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانیان. جێبەجێ کردنی حەدی ئافرەتی زیناکار، ئەمەش بە پاڵپشتییەکی ڕاستەوخۆی بەهێز لەلایەن ئەمیرەوە.

بەڵام فراوان بوونی دژەڕاکانی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە ناوەوەو دەرەوەی نەجد و بەتایبەتی لە ئەحساء (عوسمانی کوڕی مەعمەر)ی ناچار کرد کە پاڵپشتی خۆی بۆ شێخ ڕابگرێت و تەنانەت داواشی لێ کرد بە ئاشتیانە لە (عەیینە) دەربچێت، دوای ئەوەی شێخ ڕووی کردە لادێیەکی تر کە (درعیە) بوو هەندێ لە براکانی موحەمەدی کوڕی سعود کاریگەر بوو بوون بە فیکرەکانی شێخ و دڵیان بۆ دەچوو. شێخ خێرا سەرکەوتوو بوو لە ڕاکێشانی ئەمیر بۆ پاڵ خۆی و بنیادنانی دەوڵەتی یەکەمی وەهابی.

ئەگەر یەکێتی سیاسی فراوان و گشتگیر هەبووایە لە نەجد، ئەوا شێخ نەیدەتوانی لە میرنشینێکەوە بڕوات بۆ میرنشینێکی تر، بەڵکو لەوانەیە ناچاری پەنا بردنە بەر کاری نهێنی هەڵاتن لە بیابان و چیاکان بووایە، بەڵام بوونی فرەیی جیاوازی ململانێی لە نێوان میرنشینە جیا جیاکان لە نەجد ئەوا بووە هاندەر بۆ شێخ کە پشت ببەستێت بە سیاسەتی یارمەتی وەرگرتن و هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئەمیرەکان لە جێگەی دەرچوونیان و شۆڕش بەرپا کردن لە دژیان. ساڵانێکی کەم تێپەڕی نەکرد تا شێخ سەرکەوتوو بوو لە

هێنانە پاڵە خۆی چەند لادێیەکی دەورووبەری دڕعیە وەك (منفوحة) و (حریملا) و (ضرما) و (ثرمدا) و (عیینة) کە ئەمیرەکەی ئیبن مەعمەڕ گەڕایەوەو پەشیمان بووەوە لەوەی شێخی لە عەیینە دەرکرد و ڕایگەیاند کە چووەتە پاڵ قەوارەی وەهابی نوێ.

بەتەواوی قەوارەی یەکەم بە شێوەیەکی ئاشتیانە لە دایکبوو، چونکە خۆی دەبینیەوە لە گۆڕانی لایەنی ڕۆشنبیری هەندێ لە ئەمیرەکانی هەندێ لادێ و شوێنەکانی نەجد لە هەرێمی (العارض) و یەکخستنی شوێنەکان لەگەڵ یەکتری لە ژێر ڕابەرایەتی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب. لە دایکبوونی دەوڵەتی یەکەم دەرچوونی ئاشکرای بەخۆوە نەبینی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی، چونکە دەوڵەتی ناوبراو _ هەروەك وتمان _ بە دەسەڵاتی سەربازی دەستی نەگرتبوو بەسەر نەجد دا، بەڵکو نەجد ملکەچی دەسەڵاتی چەند ئەمیرێکی ناوەخۆیی بوو کە هەڵبژێردرابوون لەلایەن هۆزەکانیانەوە یان بە هێز خۆی بەسەردا سەپاندبوو. تەنانەت یەك والی عوسمانی و یەك قەڵای سەربازیشی نەبوو، بەڵکو ژێردەستی هێزی ئەمیرەکانی (حیجاز) و (ئەحساء) بوون کە بەڕۆڵی خۆیان پاشکۆیی دەوڵەتی عوسمانی بوون، بۆیە پێشەوای مزگەوتەکان تەنها لە وتارەکانی هەینیدا نزایان بۆ سوڵتانی عوسمانی دەکرد.

شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب کاتێك دەستی کرد بە بزوتنەوەکەی ئەوەی قەدەغە کرد کە پێشەواکانی مزگەوتەکان نزا و دوعا بکەن بۆ سوڵتانەکان بەبەڵگەی ئەوەی لە شتە داهێنراو بیدعەتەکانە[1] یان " سوڵتان

---

(١) إبن عثيمين، تأريخ المملكة العربية السعودية ٣٧.

لاسار (فاسق)ه بۆیه نابێت شکۆدار بکرێت "[1] لەگەڵ ئەوەشدا قەدەغەکردنی نزا و دوعا بۆ سوڵتان نیشانەیەکی وای پێك نەهێنا کە ئاماژ بێت بۆ دەرچوون و یاخی بوون، بەڵکو شێخ سووربوو لەسەر بەردەوام بوونی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ شەریفی مەککە و لەدوای ئەویش دەوڵەتی عوسمانی[2].

(١) ابن غنام، تأريخ نجد، ٢٧٢/١.

(٢) ابن غنام، تأريخ نجد ١٣٦.

### ا_زۆرداری و سیاسەتی سەرکوت کردن و خۆسەپاندن

سیستەمی سیاسی لەو سەردەمەدا بەشێوەیەکی گشتی و لادێ نیشین، بەشێوەیەکی تایبەتی جێگیر دەبوو لەسەر هێز و میراتگری نەوەك ڕاوێژ و هەڵبژاردن، دەینالاند بەدەست کەم و کورتیەکی گەورە کە بریتیە لە: لێ تێکچوون مافی جێنیشین لە ئەمیرایەتی کە کاتێك ئەمیر دەمرێت و کوڕێکی چوست و چالاکی زانای لە دوای خۆی بەجێنەهێشتووە یان کوڕێکی وای بەجێ نەهێشتووە کە ئیعتراف پێکراو بێت تا ئەو کارەکانی حوکم بگرێتە دەست، ئا لەو کاتەدا بەهۆی نەبوونی کوڕێکی شیاو بۆ ئەمیرایەتی ململانێی چەکداری لێ دەکەوێتەوە لەسەر جێنشینایەتی لە نێوان براکان و مام و کوڕە مامەکان، کە لە دەرئەنجامدا زنجیرەیەك جەنگی ناوەخۆیی ڕوودەدەن کە کۆتای نایێت تەنها بە کاول بوونی کۆمەلگا نەبێت و زیاتر چاندنی دوژمنایەتی و ڕق و کینە ئەم جەنگە کۆتایی دێت. کۆمەلگاکە چاوەڕوانی هەر چاکخوازێك بوو بەتایبەتی ئەگەر ئامانجی نوێکردنەوەی ئایین بێت، کە ئەو کێشە درێژخایەنە چارەسەر بکات، تا شتەکان دەگەڕێنەوە سەر باری سروشتی خۆیان و سیستەمێکی ئیسلامی کە لەسەر ڕاوێژ و ڕەزامەندی و هەڵبژاردن و ئالوگۆڕی دەسەڵات بنیادنرا بێت، بەڵام شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب کە هەوڵەکانی زیاتر کۆگیر (مرکز) کردبوو لە بابەتی چاکسازی کردن لە عەقیدەی ئیسلامی و دژایەتی کردنی هاوبەش دانان لە ناو ئوممەتدا، ئەوا شێخ زۆر گرنگی بەلایەنی کێشەی سیستەمی سیاسی نەدا، بەڵکو شێخ خۆیشی خزاندە ناو سیستەمی لادێ نیشینی میراتگری پشتاوپشت کە ئەو کات هەبوو، تەنانەت سیتەمی ناوبراوی شکاند بەوەی شەرعیەت و ڕەوایی ئایینی بەخشیە

سیستەمەکە و بەیعەتی دا بە ئەمیر موحەمەدی کوڕی سعود لە جێگای ئەوەی بەیعەتی بۆ کۆبکاتەوە.

بەهەر حاڵ ڕێکەوتنی شێخ و ئەمیری ناوبراو، هیچ وێنەیەکی ڕوونی نەخستە بەردەست لە هەمبەر پەیوەندی بزوتنەوەی وەهابیەت و ئالی سعود، تەنانەت ڕێکەوتنەکە هیچ گفتوگۆیەکی لە خۆ نەگرتبوو لەسەر ڕاوێژ یان بەژدار بوونی ئوممەت لە هەڵبژاردنی ئیمام و ئاماژەش نەدرابوو بە ڕۆڵی شێخ و نەوەکانی لە دیاریکردنی ئیمام لە داهاتوودا یاخود چۆنیەتی بەڕێوەبەردنی دەوڵەت و دەرکردنی بڕیاری گرنگ. هەروەك لە ڕێکەوتنەکەدا باسی ڕێگەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی نەکردبوو لە ناو میرنشینەکە لە نێوان کوڕ و براکان لە خانەوادەی سعود، بەڵکو شێخ گشت ئەو پرسە گرنگانەی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی کە سیستەمە پێشووەکە خووی پێوە گرتبوو لێ ڕاهاتبوو و بۆ بەڕێوەبەری ئەمیری بەجێ هێشت.

بەوشێوەیە ئەزموونی وەهابی سعودی یەکەم کە لەسەر دەستی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب و موحەمەدی کوڕی سعود لە ساڵی ١١٥٨ك بنیادنرا لەسەر گرێبەستی حوکمی تاکرەوی خۆسەپێنی ڕەها، تەنانەت دووریش بوو لە هەموو شێوەیەك لە شێوەکانی بەشدار پێ کردنی جەماوەری لە دەسەڵات جا جەماوەرەکە چ لە ناو بزوتنەوەی وەهابی بن چ ئەو جەماوەرەی کە لە دەرەوەی بزوتنەوەی ناوبراون بەڵام ملکەچی حوکمی ئەو دەوڵەتەن کە بەناوی وەهابیەتەوە دامەزراوە[1].

(١) عوسمانی کوڕی بیشر لە :(عنوان الجد في تأريخ نجد ٦٦/١) باسی کردووە: خەڵکی (عەیینە) هەڵگەڕانەوە دوای کوژرانی ئەمیرەکەی عوسمانی کوڕی مەعمەر، تا هیچ یەکێك لە ئالی مەعمەر نەبێتە ئەمیریان نەك ئازار بە خەڵکی بگەیەنێت، بەڵام شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەگەڵ خەڵکەکە هاوڕا نەبوو بەڵکو شێخ مشاری کوڕی مەعمەڕی کرد بە ئەمیری ئەوان.

سەرباری ئەوەی کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ماوەیەکی زۆر لە ژێر سایەی میرنشینی خانەوادەی سعود ژیانی بەسەر برد (نزیکەی چل ساڵ)، سەرکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لە دەست گرتن بەسەر نەجد دا، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ تێڕوانینێکی جێگیر و گشتگیری پێشکەش نەکرد لە هەمبەر سیستەمی سیاسی یان بەژداربوونی جەماوەری یان زانایان تیایدا، تەنها بەشدار بوونی خۆی و نەوەکانی نەبێت کە ناراستە و ڕێنمای ئەمیریان دەکرد بەشێوەیەکی تاکی و کەسی یان پێشکەش کردنی ڕاوێژێك کە ئەمیرەکان پێیەوە پابەند نەبوون (بێگومان ئەمەش دوای ئەوەی کە ئەگەر حاڵەتی تایبەتی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب جیا بکەینەوە کە دەستی گرتبوو بەسەر دەسەڵاتدا لە ژێر سایەی میرنشینی موحەممەدی کوڕی سعود و کوڕەکەی عەبدولعەزیز).

ئەگەرچی ئەمیرەکانی ئالی سعود هەندێ کات هەڵسابن بە دامەزراندنی چەند ئەنجومەنێکی ڕاوێژ کە ژمارەیەك لە سەرۆك هۆز و بەرپرسانی چەند هەرێمێك و چەند زانایەك لە خۆ بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا پرۆسەی ڕاوێژ یان ئەو ئەنجومەنانەی توانای پابەند کردنی ئەمیرەکانیان نەبوو کە بە شێوەیەکی تاکڕەوی و کەسی بڕیارەکانیان دەردەکرد.

لە ویژدانەوەیە، کە بڵێم هیچ کەسێ پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەو هەلومەرجە فیکرییە باوەی ئەوسای جیهان و ئەو بارودۆخەی کە بیابانەکانی نەجد پێیدا تێدەپەڕین هەڵسێت بە گۆڕینی بنەماکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی لادێ نشین کە زاڵ بوو بە سیستەمی ڕێزی پشتگوێ خراو لەوەتەی سەدەی یەکەمی کۆچی.

به لەبەرچاو گرتنی سیستەمی ڕاوێژی فەرامۆش کراو و نەبوونی ئامراز بۆ لێ پرسینەوەی ئەمیرە یاخی بووەکان یان ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانەکانی سەرکردایەتی باڵا دەجولێنەوە، ئەوا هیچ ڕێگەیەکی تر لەبەردەم سیستەمی وەهابی نوێدا نەبوو، تەنها هێز نەبێت کە تاکە ڕێگە بوو لە چارە کردنی ململانێیە ناوەخۆییەکان. هەروەك ئەمە ڕوویدا لەگەڵ ئەمیر عوسمانی کوڕی مەعمەڕ کە ببووە سەرۆکی باڵای هێزی سەربازی وەهابی لە ساڵی ١١٦١ك، کە هەوڵی دا ڕێگەی ئاشتەوایی و ئارامی بگرێتەبەر لە دژەکانی بانگەوازی وەهابیەت بەتایبەتی لەگەڵ ئەمیری (ریاز) دەهامی کوڕی دەواس، دەهام عوسمانی بانگ کرد بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵی و دواتر بانگێشتی شێخی کرد و زۆر جەختی کردەوە لەسەر ئامادەبوونی شێخ، بەڵام شێخ ئامادەبوون بەمەبەستی ئاشتەوایی ڕەتکردەوە[1]. بەڵکو لە جیاتی چاوپێکەوتن و گفتوگۆ شێخ بڕیاری دا کە (عوسمانی کوڕی مەعمەڕ) بەنهێنی بکوژێت، جا بۆ ئەم مەبەستە کەسێکی نارد بۆ مزگەوت تا دوای نوێژی هەینی بیکوژێت، لە ناوەڕاستی مانگی ڕەجەب ساڵی ١١٦٣ك. [2]

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد، ص ١٠٠.

(٢) شێخ حوسەینی کوڕی غەننام دەڵێت: " کاتێك هەست کرا بە زیادبوونی دوژمانیەتی و خراپەی عوسمانی کوڕی مەعمەڕ لە هەمبەر خەڵکی یەکتاناس، ڕق و کینەی بەدەر کەوت لە هەمبەر یەکتاناسان و پشتوانی و خۆشویستنی خۆیشی دەربڕی بۆ خەڵکی ئاشیا و ناحەق. ڕاستی ئەو وتانە کە لە بارەی ناوبراوەوە دەگران دەرکەوت بۆ شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، خەڵکی شارەکە هاتنە لای شێخ و سکاڵای ئەوەیان لەلا کرد کە دەترسێن لەوەی عوسمانی کوڕی مەعمەڕ ستەم لە موسڵمانان بکات ئا لەوکاتە شێخ بەوانەی وت کە خەڵکی عەیینە بوون و هاتبوونە لای شێخ: " دەمەوێت بەیعەتم پێبدەن لەسەر دینی خواو پێغەمبەرەکەی و دژایەتی ئەوەی ئەو دژایەتیان دەکات و پشتگیری ئەوەی ئەو خۆشی دەوێت و پشتگیر دەکات، ئەگەر ئەمیری

بابەتی تەکفیر کردن و ڕاگەیاندنی جەنگ لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە باوەڕیان نەبوو بە بنەماکانی وەهابیەت ڕاجیایی لەسەر بوو لە ناو وەهابیەت و بابەتێك بوو دیدو بۆچوونی جیاوازی لەسەر بوو لەلایەن هەندێکیان نەویستراو بوو لە ناو ڕیزەکانی قەوارەی وەهابی نوێ هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە، بەشێوەیەك شێخ سولەیمانی کوڕی عەبدولوەهاب (برای شێخ موحەمەد) کە دادوەری (حریملا) بوو کتێبێکی نووسی تیایدا بە توندی پرۆسەی تەکفیری گشتی موسڵمانان ڕەتدەکاتەوە.

ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی کتێبی ناوبراو و شێخ (موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب) دەسپێشخەری ناشتەوایی ڕەت کردەوە چونکە بووە هۆی دروستبوونی دوودڵی و بێزاری و بێ تاقەتی لە گشت شار و لادێ وەهابی نشینەکان، ئەمیری (ثرمدا) ئیبراهیمی کوڕی سولەیمان ترازا و جیابووەوە (ضرما)ش ئیبراهیمی کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدوڕەحمان ساڵی ١١٦٤ یاخی بوو، تەنانەت دانیشتووانی (حرملا) شوێنی کەوتن و سەربەستی و جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاند لە حوکمی ئالی سعود لە ساڵ ١١٦٥ و هەڵسان بەوەدەر نانی وەهابیەکان لە شارەکەیان و ئەمیرەکەشیان کوشت کەناوی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای موبارەکە[1] و بەهەمان شێوە دانیشتووانی (منفوحة) لە ساڵی پاشتر ئەمیرەکەیان موحەمەدی کوڕی صاڵحیان وەدەرنا و

---

نێوە عوسمان ".... جا کە نوێژی هەینی تەواو بوو لە سوژدەگای خۆیدا لەناو مزگەوتدا کوشتیان لە مانگی ڕەجەب ساڵی ١١٦٣ك، کاتێك هەواڵ گەیشتە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئەوا ڕاستەوخۆ شێخ بەرەو عەیینە بەڕێکەوت... مشاری کوڕی مەعمەڕی کردە ئەمیر ". إبن غنام: تأريخ نجد ١٠٢ و _ إبن بشر: عنوان المجد ١/٦٠ _ ٦١.

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ١٠٦.

یاخی بوون لە سەرکردایەتی وەهابیەت[1] و شێخ سولەیمان یەکێك لە پشتیوانانی کە ناوی (سولەیمانی کوڕی خویطر) بوو ناردی بۆ عەیینە، دانەیەکی لە کتێبەکەی پێدا و ڕایسپارد کە بیخوێنێتەوە لە ناو کۆڕ و کۆبوونەوەو ماڵەکان دا، جا ئەمە کاریگەری دروست کرد لەسەر دڵی هەندێ خەڵکی عەیینە، هەروەك هەندێ خەڵکی دڕعیەش کاریگەر بوون بە فیکر و بۆچوونەکانی شێخ سولەیمان، کە فیکرەی میانڕەو بوو و تەکفیری ڕەت دەکردەوە.

لە جێگای کردنەوەی دەرگای گفتووگۆ لە بارەی بابەتەکە، ئەوا شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب فەرمانی دەرکرد بە بەند کردنی (سولەیمانی کوڕی خویطر) بە تۆمەتی ئەوەی پەرەی بە کتێبی براکەی شێخ دەدا و بازاری گەرم دەکرد، بەو تۆمەتە شێخ موحەمەد فەرمانی لە سێدارە دانی بۆ دەرکرد، جا (سولەیمانی کوڕی خویطر) کوژرا[2] و کۆمەڵێك لە وەهابیەکان هەڵسان بە هێرش کردنە سەر ئەمیری (ضرما) ئیبراهیمی کوڕی موحەمەد کە یاخی بوو هەر لە دانیشگەی خۆیدا کوشتیان[3] بەڵام ناڕەزایی کپ نەبوو، تەنانەت زۆر نەمابوو ئاراستەکە بگۆڕێت ببێتە ڕاپەڕینێکی گشتی، بۆیە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب پەیامێکی ئاراستەی ئەمیری نوێی (ضرما)ی کرد کە ناوی (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا) بوو بەوەی بە ویستی خۆی هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ دژەڕاو ئەوانەی دەنگی ناڕەزایی دەردەبڕن و ڕاپەڕین ئەنجام دەدەن بەم هۆیەوە ئەمیری ناوبراو دەست پێشخەری کرد لە دەست بەسەر کردن و لە

---

(١) إبن غنام: تأريخ نجد ١٠٦.

(٢) إبن غنام: تأريخ نجد ١٠٨.

(٣) إبن غنام: تأريخ نجد ١٠٤.

سێدارەدانی ئەوانەی گومانیان لەسەر بوو بەڵام ئەم پرۆسەیە بە نەرمی ئەنجامدرا[1]. هێزەکانی وەهابیەت هەڵسان بە هێرش کردنە سەر ناوچەی (ثرمدا) و نزیکەی حەفتا کەسیان کوشت لە دانیشتوانە "هەڵگەڕاوەکە".[2] دوای ئەمە عەبدول عەزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود لە ساڵی ١١٦٨ هەڵسا بە هێرش کردنە سەر (حریملا) و لەناوبردنی بزوتنەوەی یاخی بووەکە کە چوار ساڵ خایاندی و ملکەچ کردنی شارەکە بە زەبری هێز، ئەمەش دوای ئەوەی سەد پیاو لە دانیشتووانی کوژرا. ئەمیر عەبدولعەزیز ماڵ و سامانی ئەوانەی دەست بەسەر کرد کە هەڵاتبوون بۆ خۆ حەشاردان لە دۆڵ و چیاکان[3]. دوای ئەمە ئەمیر عەبدولعەزیز هەڵسا بە هێرش کردنە سەر (منفوحة) و کوشتنی دانیشتوانەکەی و بردنی زۆرێك لە وشتر و ڕشە وڵاخ و (گوێدرێژ)ەکانیان.[4]

(١) إبن غنام، تأريخ نجد، ١٠٨.

(٢) إبن غنام، تأريخ نجد ١٠٢.

(٣) إبن غنام، تأريخ نجد، ١٠٩.

(٤) إبن غنام، تأريخ نجد ١١١.

## ڕەگ و ڕیشەی مێژووی تیۆری سەرکوت کردن و خۆسەپاندن

شتێکی زانراوە کە هەر لە سەدەی یەکەمەوە فیکری سیاسی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی دابەش دەبێت بۆ دوو قوتابخانەی سەرەکی کە بریتین لە قوتابخانەی سوننە کە بڕوای بە بنچینەی ڕاوێژ هەیە و قوتابخانەی شیعی (ئیمامی) کە بڕوای بە دەق (نص) دەستنیشان کردن (تعیین) هەیە، بەوەی کە قوتابخانەی سوننی بە شێوەیەکی گشتی بڕوای بە تیۆری ڕاوێژ هەیە لە کاروباری حوکمڕانی دا و دەڵێت کە پێغەمبەر ~ هیچ جێنیشینێکی دەستنیشان نەکردووە لە دوای خۆی بە دەق (نص) [1]، بە پێچەوانەی قوتابخانەی ئیمامی کە بڕوای وایە پێغەمبەر جێنشینی لە دوای خۆی دەستنیشان کردووە و خەلافەت و جێنشینایەتی کورت بووەتەوە تەنها لە ئالو بەیتدا. بەپێی ئەم پێشەکییە قوتابخانەی سوننی بڕوای بە ڕەوایی و شەرعیەتی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەڕ و عوسمان و عەلی هەیە کە لە ڕێگەی بەیعەت و هەڵبژاردن بەشێوەی جیاواز هاتوونەتە سەر کار.

---

(١) هەرچەندە دانەر هەندێ فیکرەی شیعی هەر ماوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبە ناوازەکەی خۆیدا (تطور الفكر السياسي الشيعي من الشورى الى ولاية فقيه) ئەوا بە هێزی بەڵگە و گەواهی دانی مێژوو تیۆری دوازدە ئیمامی شیعی پوچەڵ کردۆتەوەو تەنانەت دەڵێت من ئالێم فیقهی ئیمامی بەڵکو دەڵێم فیقهی جەعفەری. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ کتێبی ناوبراو. شایەنی باسە بەندەی لاواز (وەرگێڕ) هەڵساوە بە بەکوردی کردنی کتێبی ناوبراو، بەویستی خودا لە زوترین کات بە چاپ دەگەیەنرێت. (وەرگێڕ).

به لەبەرچاو نەگرتنی گۆڕانی خەلافەت لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسی بۆ سیستەمی میراتگری پشتاوپشت کە دامەزرابوو لەسەر هێز، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا زانا موتەکەلیمەکانی سوننی بەردەوام دوواون لەسەر بەیعەت و ڕاوێژ وەك بنەمایەکی شەرعی سیستەمی حوکمڕانی، هەروەك ئەشعەری ئەوەی کردووە لە (الابانة) و باقلانی لە (تمهید الاوائل) کە لەوبارەوە وتویەتی: " ئیمام بەوە دەبێتە ئیمام بە پەیمان و بەیعەت دانی ئەوانەی چاکترینی موسڵمانانن و ئەمیندارن لەم بوارەدا کە بریتین لە پسپۆڕانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (اهل الحل و العقد) [1]".

لەگەڵ ئەوەی کە بەیعەتی پسپۆڕانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (أهل الحل و العقد) و پیاوە چاکەکانی موسڵمانان بەبەردەوامی نوێنەرایەتی تێکڕایی موسڵمانانی نەدەکرد، بەڵام بە ئەندازەیەکی چاك وەڵامی ویستی ئەوانەی دەدایەوە کە مەشخەڵی تیۆری ڕاوێژیان بەدەست بوو و ئارەزوویان بوو حوکمی ئیسلامی جێگیر ببێت لەسەر بنەمای ڕەوایی و مەشرۆعیەتی دەستوری کە دامەزراوە لەسەر هەڵبژاردن و ڕاوێژ و ڕەزامەندی ئوممەت نەوەك لەسەر هێزو خۆسەپاندن و زاڵ بوون، بەڵام ئەو ویستەی زانایان کەمەك پاشەکشەی کرد لە سەدەی سێیەمی کۆچی لەگەڵ هاتنی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە وتەیەی بە ناوبانگی دەرکردووە کە دەڵێت: "هەر کەسێ بە زەبری هێز زاڵ بوو ئەوا دەبێتە خەلیفە و ناودەنرێت بە ئەمیری بڕواداران، دروست نییە بۆ

---

(١) پسپۆڕانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (اهل الحل و العقد): ئەوانەن کە کاروبارەکان بەبێ ڕەزامەندی ئەوانە نە دادەمەزرێن و نە هەڵدەوەشێنرێنەوە، تەنانەت بە شدارن لە دروست کردنی هەر بڕیارێکی گرنگ. (وەرگێڕ).

کەسێ بڕوای بەخوای گەورە و ڕۆژی دوای هەبێت خۆ بگرێتەوەو بەیعەتی پێنەدات و بە ئیمامی نەزانێت، جا کەسی زاڵبووەکە چاکەکار بێت یان خراپەکار، ئەوا ئەمیری بڕوادارانە ". دواتر (ئەبو یوسفی ماوردی) هات لە سەدەی پێنجەمی کۆچی و لە کتێبەکەی دا (الاحکام السلطانیة) ئەمیرایەتی کەسی زاڵبوو و بەزۆرەملێی خۆسەپێنی بە ڕەوا زانی و قبوڵی کرد، لەگەڵ ئەوەی کە ڕاسپاردن (العهد)یش بە ڕەواو شەرعی دانا لە ئیمامی پێشوو بۆ ئیمامی دوای خۆی و هەڵبژاردنی لەلایەن پسپۆرانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (أهل الحل و العقد).

بەڵام فیکری ئیسلامی گەڕایەوە دووبارە سەرلە نوێ بەرز بووەوە بۆ گیانی ڕاوێژ، لەگەڵ هاتنی (ئەبو یەعلا) فەقیهی حەنبەلی (٤٥٨ك) کە دروست بوونی بەیعەتی خەلافەتی ڕەت کردەوە مەگەر پاش بەیعەت پێدانی زۆربەی ئەندامانی (حل و العقد) نەبێت، ئیمامەتی کەسی ڕاسپێرراو (المعهود الیه)ی ڕەتکردەوە تەنها بە بەیعەت پێدانی خەڵکی ئەو کات نەبێت ئەویش بە مردنی ئیمامی پێشوو. ڕاڤەی وتەی ئیمامی ئەحمەدی کرد (هەر کەسێ بە شمشێر بەسەریاندا زاڵ بوو ئەوا دەبێتە خەلیفە) بەوەی کە زاڵ ببێت بەسەر هاوێنەکانی دا کە داوای خەلافەت دەکەن، جا ئەگەر بەسەریاندا زاڵ بوو و دواتر خەڵکی بەیعەتیان پێدا ئەوا دەبێتە خەلیفە، مەبەستی ئیمامی ئەحمەد لەو وتەیەدا ئەوەنیە کە بە خودی زاڵبوونەکە ببێتە خەلیفە.

دواتر وای لێهات کە فیکری سیاسیی ئیسلامی (سوننی) زیاتر بەرەو واقیعی بوون چوو و بووە ڕەنگدانەوەی سروشتی سیستەمە حوکمڕانەکان، ئەمەش دوای ئەوەی شەرعزانان ئیعترافیان کرد بە ڕەوایی و دروستی ڕێگەی

سێیەم کە بریتیە لە گرتنە دەستی دەسەڵات بە زەبری هێزو خۆسەپاندن و زاڵبوون و لەگەڵ پێ ڕازی بوونی پسپۆڕ و ئەندامانی (حل و العقد) و دانانان بە ڕەوای سپاردن (ولاية العهد)، هەروەك (جوەینی) لە کتێبەکەیدا (الغیاثي) ئیعترافی کردووە بەوەی کە دەکرێت ئیمامی ڕاستەقینە پەنهان و نادیار بێت و لەوکاتەشدا ئیعتراف دەکرێت بە ڕەوایی ئیمامەتی کەسی زاڵ بوو بە زەبری هێز کە گشت مەرجەکانی ئیمامەتی تێدا نەبێت، ناویشی لە زاڵبووی خۆسەپێنەری ناوە (والی) و مەرجیشی داناوە لەسەری کە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای زانایان و پرس و ڕاوێژیان پێ بکات. (ئیبن قودامە) (٦٣٠ك) لە (کافی: بەشی: دەرچووان و دەستدرێژی کاران) دەڵێت: " هەر کەسێك ئیمامەتی چەسپا ئەوا حەڕامە لە دژ دەرچوونی و جەنگ لەگەڵ کردنی جا ئیمامەتەکەی بە یەکدەنگی موسڵمانان چەسپابێت وەك ئیمامەتی ئەبوبەکر یان بەسپاردن (عهد)ی ئیمامی پێشەخۆی وەك پێ سپاردنی ئەبوبەکر بە عومەڕ یاخود بەهۆی زاڵبوونی بەسەر خەڵکیدا و ناونانی بە ئیمام وەك عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوان ". (یەحیای کوڕی شەڕەفی نەوەوی لە (المنهاج الطالبين) و (الروضة الطالبين)دا ئیعترافی کردووە: کە زاڵ بوون و خۆسەپاندن وەك ئامرازێکی شەرعین بۆ دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتدا، هەروەك بە ڕاشکاوانە دەڵێت: " ئیمامەت دادەمەزرێت بەسێ ڕێگا .... بەیعەت... دانانی جێنشین و پێ سپاردنی... ڕێگەی سێیەم بریتیە لە: زاڵ بوون و خۆسەپاندن، جا کە ئیمام مرد ئەوا کەسێك هاتە پێش بۆ گرتنە دەستی ئەو کارە کە هەموو مەرجەکانی تێدابن بەبێ ئەوەی بەیعەتی پێدرابێ یان ڕاسپێررا بێت، بەڵام کەسەکە خەڵکی تێکشکاند بە پلەوپایە و

سەربازەکانی ئەوا ئیمامەت و خەلیفایەتیەکەی دامەزراوەو دروستە تا کاروباری موسڵمانان ڕێك بخات، ئەگەر کەسەکە گشت مەرجەکانی تێدا نەبن بەوەی لاسار (فاسق) یان نەزان بێت ئەوا دوو بۆچوون هەن: ڕاسترینیان دامەزراوی و دروستی ئیمامەتیەکەیە بەهۆی ئەو شتانەی باسمان کردن ئەگەرچی کەسەکە بە کرداریش تاوانبار بێت ".

بەهەمان شێوە (بەننانی) (١١٩٤ك) هاوچەرخی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە (الحاشية البناني على شرح الزرقاني) دەڵێت: " بزانە کە ئیمامەت بەسێ جۆر دادەمەزرێت: بە بەیعەت و پەیمان پێدانی ئەندامانی (حل و العقد) یان ڕاسپێررابێت لە لایەن ئیمامی پێش خۆی یاخود بە زاڵبوونی بەسەر خەڵکی دا لەوکاتەشدا هاتنەجێی مەرج تیایدا بە مەرج دانانرێت، چونکە هەر کەسێك دەسەڵاتی زاڵبوو بەسەر خەڵکیدا ئەوا گوێڕایەڵی کردنی پێویستە ".

تەنانەت شەرعزانێکی وەك (ئیبن عابدین) ئیمامەتی بەستووەتەوە بە هێز، بەدروستی زانیوە کە ئیمامەت لە کەسێ بسەنرێتەوە کە بێهێزە و خەڵکی بەیعەتیان پێداوە، لەوبارەوە دەڵێت: " ئیمام دەبێتە ئیمام بە زاڵ بوون و خۆسەپاندن بەبێ بەیعەت پێدانی لەلایەن خەڵکیەوە یان بەبێ ئەوەی ڕاسپێررا بێت، ئەگەر خەڵکی بەیعەتیان پێدا بەڵام بەهۆی بێ هێزی خۆی حوکمی جێبەجێ نەبوو لە سەر خەڵکی ئەوا نابێتە ئیمام ".

## تیۆری سیاسی ئیبن تەیمیە

لە میانەی ئەو دواکەوتنەی فیکری سیاسی ئیسلامی و داننانی بە فەرمانی واقیع یان دانەپاڵی جۆرێ لە شەرعیەت، ملکەچ بوون بۆ تیۆری هێز و زاڵبوون و خۆسەپاندن، دوورکەوتنەوە لە تیۆری ڕاوێژ، لەوکاتەدا شێخ ئیبن تەیمیە هات، کە هەڵسا بە پێداچوونەوەیەکی گشتگیر بۆ فیکری ئیسلامی، تەنانەت چووە ناو چەند مشتومڕێکی توندەوە لەگەڵ تێکڕایی دەستە و قوتابخانە و کۆمەڵە جیا جیاکانی ئیسلامی، ڕەخنەی زۆرێك لە دیاردەی نەرێنی (سلبی) گرت لە کۆمەڵگای ئیسلامی، سەیری کێشەی سیاسی کرد لەلایەنی ڕێکەوتن و گونجانی حوکمڕانەکان لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی یان نەگونجانیان، تیۆری خوا بەیەکزانینی لە پەرستراوێتی دا خستەڕوو، واتە پەرستنی خوای گەورە کە هیچ هاوەڵێکی نییە، ئەو پەرستشە نایەتەجێ تەنها بە شوێنکەوتنی شەریعەتی ئیسلامی نەبێت. سەرباری ئەوەی تیۆری ئیبن تەیمیە بە تێرو تەسەلی دواوە لەسەر بابەتی دادپەروەری لە حوکمدا و مەرجەکانی حوکمڕان و سیفات و تایبەتمەندییەکانی و چۆنیەتی گەیشتنی بە دەسەڵات بە ڕێگە شەرعیەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شێخ ئیبن تەیمیە نەیکۆڵیوەتەوە لە ڕێگاکانی بەدەست هێنانی دەسەڵات و بەپێویستی نەزانیوە کە بکۆڵێتەوە لە بابەتی ڕاوێژ و بەمەرج دانانی ئەوەی کە حوکمڕان دەبێت لەڕێی ئەندامانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (الحل و العقد) بێتە سەر دەسەڵات یان ناوبراو بە پێویستی نەزانیوە کە حوکمڕان پێویستی بە ڕەزامەندی ئوممەت هەیە بۆ

ڕەوایی و مەشرۆعیەتی حوکمڕانێتیەکەی.

ئیبن تەیمیە تیۆرێکی واقیعی هاوشێوەی تیۆری مێژووناس ئیبن خەلدوونی پێشکەش کرد لەهەمبەر دەسەڵات، کە جیاوازی کرد لە نێوان ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە تێپەڕیوون بەسەر جیهانی ئیسلامی، لەسەر جێنیشینایەتی پێغەمبەر، کە تەنها سی ساڵ بەردەوام بوو، دواتر تێکەڵ بوو بە پاشایەتی یان هەر بووە سیستەمی پاشایەتی. ئیبن تەیمیە لە شیکردنەوە مێژووییەکەی بۆ بابەتی دەسەڵات پشتی بەست بە فەرموودەیەکی پێغەمبەری گەورە کە تیایدا فەرموویەتی:

" پێغەمبەرایەتی دەبێ ئەوەندەی خوا بیەوێ لەناوتاندا دەمێنێ.

پاشان دەبێتە جێنشینایەتیەك کە بەپێی بەرنامەی پێغەمبەرایەتیە، ئەمەش ئەوەندەی خوا دەیەوێت بەردەوام دەبێ، کاتێ بیەوێ هەڵی گرێ و نایهێڵێ.

پاشان دەبێتە پاشایەکی گازگر[1] (عضوض)، ئەمەش ئەوەندەی خوا بیەوێ بەردەوام دەبێت، پاشان کاتێ بیەوێ هەڵی دەگرێ و نایهێڵێ.

پاشان دەبێتە پاشایەکی زۆرداری خۆسەپێن، ئەمەش ئەوەندەی خوا بیەوێ بەردەوام دەبێ و پاشان کاتێ کە دەیەوێ هەڵی دەگرێ و لایدەبات.

پاشان دەبێتەوە جێنشینایەتیەك کە بەپێی ڕێ و شوێن و بەرنامەی پێغەمبەرایەتییە " پاشان بێدەنگ بوو.

---

(١) وشەی گازگرمان بۆ (عضوض) بەکار هێناوە، کە بەو کەسە دەگوترێت قەپ بکات بەشتێکدا و بەری نەدات، بە ددانەکانی تووند بیگرێت. ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە (وەرگێڕ).

ئیبن تەیمیە وتویەتی: " تێکەڵ بوونی خەلافەت بە پاشایەتی شتێکی دروستە لە شەریعەتی ئێمەدا، تەنانەت معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ئەو کارەی کرد، ئەمەش نابێتە هۆی تانە و تەشەردان لە خەلافەتی معاویە " و " گۆڕانی خەلافەت بۆ پاشایەتی یان لەبەر بێ تواناى بەندەکانە لەوەی جێنیشینایەتی پێغەمبەریان پێ نەکرێ یان کۆشش (اجتهاد)ێکی باوە یاخود چ لەڕووی زانستەوە چ بە کردەوە تواناشیان هەبێت و ئەگەر بێ توانا بوو ئەوا پاشاکە لەوکارەیدا بوردراوە.... ئەگەر زانست و کردارو توانا و هێزیشی هەبوو بەڵام وای بۆچوو کە خەلافەت شتێکی چاکە (مستحبة) نەوەك پێویست (واجب)ە و هەڵبژاردنی سیستەمی پاشایەتی دروستە لە شەریعەتی ئێمەدا هەروەك لە تێکڕایی شەریعەتەکانی تردا دروستە ئەوا لەوکاتەدا ئەگەر حوکمڕان وای دانا کە ئەو تێڕوانینەی گریمانێکی دروستە ئەوا پادشای دادپەروەر بەو تێڕوانینانەی تاوانبار نییە "(١).

کاتێك سیستەمی خەلافەت لەلایەن تێکڕای سوننە دوو جۆر بوو: یان شەرعی و دروست یاخود نا ناشەرعی و نادروست و پووچ و جۆری ناوەڕاستی و سێیەمی نەبوو، پێوەری ئیمامەتی شەرعی و دروستیش بریتیە لەلایەنی دامەزرانی و متمانە پێدانی، بەڵام ئیبن تەیمیە لە (السیاسة الشرعیة) دا باسی مەسەلەی دانانی ئیمامی نەکردووە، چونکە بە تێڕوانینی ناوبراو خەلافەتی ڕاشیدین کە سیساڵی سەرەتا دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری مەزن بەردەوام بوو بەسەرچووەو دووبار نابێتەوەو ناگەڕێتەوە، ئەو خەلافەتەش دامەزرابوو لەسەر دەقەکان (النصوص) نەوەك لەسەر بنەمای ڕاوێژ.

---

(١) إبن تیمیة، مجموعة الفتاوی ٣٥/٢٥.

زیاد لەوەی کە ئیبن تەیمیە بڕوای وابوو کە خەلافەتی ڕاشیدین دامەزرابوو لەسەر زاڵبوون و باڵادەست بوون و خۆسەپاندن، لەوبارەوە دەڵێ: بێگومان " ئیمام بریتیەلەو کەسەی کە لاسایی دەکرێتەوە، خاوەنی دەسەڵات و شمشێرە و گوێڕایەڵبوون بۆی بە خۆشی و ناخۆشی پێویستە.... ئەو دوو تایبەتمەندی و وەسفانە تەواو لە خەلیفەکانی ڕاشیدین هاتبوونەجێ "[1]، دەڵێت: " ئەو ئیمامەی کە گوێڕایەڵی کردنی پێویستە بریتیە لەوەی کە دەسەڵاتی هەیە، جا چ دادپەروەر بێت یان ستەمکار "[2].

ئیبن تەیمیە لەمیانەی ئەو شیکردنەوەیە گەیشت بەو دەرەنجامەی کە ئەو سیستەمە سیاسیانەی دامەزراون لەسەر زاڵبوون خۆسەپاندن و سەرکوت کردن بە دروست و ڕەوای بزانێت، دەڵێت: ئیمامەت " بە ڕازی بوونی خەڵکی پلەوپایەدار دادەمەزرێت، کەس نابێت بە ئیمام تا خاوەن پلەو پایەکان ڕازی نەبن ئەوانەی کە بە ڕازی بوونی ئەوان مەبەستی ئوممەت جێبەجێ دەبێت، مەبەستی ئوممەتیش لە ئیمامەت بە هێزو توانا دێتەجێ.... خودی ئیمامەت و دەسەڵات و حوکمڕانی بریتیە لە توانا و هێزی بەرجەستە، دواتر دەکرێ ئەو هێزە بەوجۆرە بەگەڕ بخرێت کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت وەك دەسەڵات و هێزی خەلیفەکانی ڕاشیدین، دەکرێ ئەو هێزو توانایە بەگەڕ بخرێت لە خراپە و تاواندا وەك حوکمڕانە ستەمکارەکان "[3].

---

(١) إبن تيمية: مجموعة الفتاوى ١/١٣٥.

(٢) إبن تيمية: مجموعة الفتاوى ١/١٤٩.

(٣) إبن تيمية: منهاج السنة النبوية ١/١٤١ _ ١٤٢.

ئیبن تەیمیە بڕوای وابوو کە ئیمامەت دادەمەزرێت لەسەر دوو بنەما کە بریتین لە:(هێز و ئەمینداری) بە پشت بەستن بە دەقەکانی قورئان کە تیایدا باسی هێز کراوە بەر لە ئەمینداری وەك ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار ﴿ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾ القصص، ٢٦. واتە: (بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بە کرێ بگریت، ئەم پیاوە بەهێزو ئەمین و دەست و دەروون پاکەیە). وتەی پادشای میسر کە بە یوسفی وت (سەلامی خوای لێبێت) :﴿ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ یوسف، ٥٤. واتە: (وتی: ئەمڕۆ ئیتر بەڕاستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو جێگەی متمانە و باوەڕی). وتەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: (تاونباری بەهێز، هێزەکەی بۆ موسڵمانانە، تاوانباریەکەیش بۆ خۆیەتی، بەڵام پیاوچاکی بێ هێز، چاکەکەی بۆ خۆیەتی و لاوازی و بێ هێزییەکەی بۆ موسڵمانانە). ئا لێرەوە ئیبن تەیمیە سیفاتەکانی ئیمامەتی کۆ کردەوە لە دوو سیفەتی سەرەکی کە بریتین لە هێزو ئەمینداری، لەمەڕ ئەم بابەتەدا ڕاجیایی هەیە لەناو شەرعزانانی سوننە ئەوانەی کە چەندین مەرج و تایبەتمەندی تر بە پێویست دەزانن لە کەسێك کە دەویەوێت پۆستی ئیمامەت بگرێتە دەست یان چەند ڕێگەیەکیان دیاری کردووە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، هێز لەلایەن ئیبن تەیمیە گرنگترین و پێویسترین مەرج بوو کە لە ئیمامدا هەبێ، سیفەتی ئەمینداریش پاشکۆیی سیفەتی هێزە، ئا لەو کاتەدا سیفەتی ئەمینداری تەواو کەری سیفەتی هێزە یان شێوەیەکی خەیاڵی و نمونەیی پێدەبەخشێت؛ بە شێوازێکی تر هێزو توانا بنەماو بنچینەی ئیمامەتی واقیعین، کەچی ئەمینداری شەرع پێویستی کردووە لە ئیمامەت دا.

دوای قبوڵ کردنی فەلسەفەی هێز و توانا ئەوە پێویستبوو کە بگەڕێتەوە لە زۆرێك لەو شتە نمونەیی و ئەو مەرجانەی کە زانا پێشووەکانی سوننی باسیان کردوون و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر جەختیان لەسەر کردۆتەوە، کە پەیوەستن بە سیفاتی حوکمڕانی ئیسلامی، وەك مەرج "قورەیشی بوون" کە لە هەندێ فەرموودەکانی پێغەمبەردا هاتووە وەك:( ئیمامەت لە قورەیشدایە) یان (ئەو کارە بۆ قوریشە تا ئەوکاتەی دین پیادەبکەن)، هەروەك ئەمە نەریتی ئەهلی سوننە و فەرموودەناسانە بەتایبەتی حەنبەلیەکان کە بەتووندی پێیەوە پابەندن، بەهەمان شێوە مەرجەکانی تەقواو پارێزگاری و دادگەری و زانستداری و لێهاتووی و ڕەزامەندی ئوممەت یان بەیعەت پێدانی ئەندامانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (الحل و العقد).

دەکرێ هۆکاری فەرامۆش کردنی بنەمای ڕاوێژ لە حوکمدا لەلایەن ئیبن تەیمیە بۆ ئەو تێڕوانینە نەرێنی (سلبی)ە بگەڕێتەوە کە لە میانەیدا دەیڕوانیە (ئوممەتی ئیسڵامی) پاش ئەوەی کە ناوبراو بڕوای وابوو کە ئوممەت لایداوەو دواکەوتووە و دەستە و تاقمەکانی سەرگەردان بوونە، ئیسلامیش نامۆ بووە، بە پشت بەستن بە هەندێ فەرمایش کە دەدوێن لەسەر (نامۆیی ئیسلام) و چاکترین و بەرێزتر بوونی سەدەی یەکەم دواتر سەدەی دووەم پاشان سەدەی سێیەم. ئیبن تەیمیە بۆچوونی وابوو کە ئوممەتی ئیسلامی هەموو لەسەر ڕێگەی ڕاست نین و گرنتی ڕزگاربوونیان نییە لە ئاگری دۆزەخ، بەڵکو بەشێك لە ئوممەت کە (أهل الحديث)ن ئەوا (دەستە و کۆمەڵەی ڕزگاربوو) پێکدێنن[1] و دەڵێت: " خوای گەورە ئەو ئوممەتە بەگشتی

---

(١)ابن تيمية: منهاج السنة النبوية ٢٣٥/٤.

لەسەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە، بەڵکو بەردەوام دەستەو کۆمەڵێك لە ناو ئوممەت هەن لەسەر ڕێگەی ڕاستن ئەوانەی دژیانن یان هەوڵی سەرشۆڕکردنیان دەدەن زیانیان پێ ناگەیەنن، بەردەوام خوای گەورە شتی وای لەو دینەدا دەچێنێت و بەگەڕیا دەخات لە گوێڕایەڵی خۆی "[1].

شتێکی زانراوە کە ئیبن تەیمیە زۆربەی دەستە و کۆمەڵەکانی لە بازنەی ئوممەت فڕێدا دەرەوە تەنانەت ئەشعەریەکان (سوننە)یشی[2] لە بازنەی ئەهلی حەق و ڕاست فڕێدادەرەوە، چەمکی ئوممەت لە لایەن ئیبن تیمیە ئەو مانایەی نەبوو کە موسڵمانانی تر وا لێی تێگەیشتبون کە ئەویش بریتیە لەو کۆمەڵە گشتگیرەی کە هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی خۆی دەگرێت کە ئیسلام بەدینی دادەنێت، جا بە تێکڕای دەستەو کۆمەڵەکان، هەروەك لە واقیعی مێژوودا گەشەی سەند، بەڵکو مانای (ئوممەت) لەلای ئیبن تەیمیە بریتی بوو لە: (کۆمەڵەی کەمینە: الجماعة الجزئية) کە بریتیە لە (فەرموودەناسان) یان (ئەهلی قورئان و فەرمووده) یاخود (ئەهلی سوننە و جەماعەت) هەروەك خۆی ناویان دەنێت[3].

لەبەر ئەوەی (أهل الحديث) یان (أهل الحق) بەردەوام زۆرینە پێکناهێنن، بەتایبەتی لە سەردەمی "نامۆ بوونی ئیسلام" ئەوا شتێکی مەحاڵە ئیبن تەیمیە پەنا بباتە بەر حوکم کردنی ڕاوێژ و زۆرینە یان بەمەرج دانانی

---

(١) إبن تيمية: منهاج السنة النبوية ٢٣٥/٤.

(٢) دانەر لێرەدا بۆ ئەشعەرییەکانی لەناو دوو کەوانە سوننەی بەکارهێناوە کە مەبەستی زۆربەی سوننەیە، چونکە جێگای خۆیەتی کە بڵێین زۆربەری هەرەزۆری ئەهلی سوننە ئەشعەریین لە بروباوەڕو عەقیدەدا. (وەرگێڕ).

(٣) حسن كو نا كاتا، النظرية السياسية عند ابن تيمية ١٣٢.

ئەوەی کە ئیمام پێویستە ڕەزامەندی ئوممەت بەدەست بێنێت، شتێکی سروشتیە کە ئیبن تەیمیە پەنا بباتە بەر تیۆری سەرکوت کردن و خۆسەپاندن، تەنانەت جۆرێك لە شەرعیەت دراوە بەو دەوڵەتانەی کە ئەمری واقیع بوونە، بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەو لایەنی کە دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرتووە.

لێرەوە شتێکی پێش بینی کراوبوو کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب ڕاوێژ لە فەرهەنگی سیاسی خۆی بسڕێتەوە، تەنانەت بیریش لەوە نەکاتەوە لە ڕێگەدان بە جەماوەری فراوان کە بەژداربن لە حوکم دا یاخود ڕەزامەندی ئوممەت یان ڕەزامەندی ئەندامانی هەڵوەشاندنەوەو گرێدان (الحل و العقد) بەمەرج دابنێت لە دانانی ئیمامدا و پشت ببەستێت بە هێزو توندو تیژی لە فراوان کردنی ڕووبەری دەوڵەتی سعودیی وەهابی یەکەم. وە شێخ موحەمەد پێویستی بەوە نەبوو کە فیکرەی سەلەفی بەدەست بێنێت کە ڕێگە دەدات بە بەکارهێنانی هێزو داگیر کردنی دەسەڵات یان (پلەوپایە و هێز) بە بنەما دابنێت لە حوکمدا. چونکە شێخ موحەمەد خۆی دەبینیەوە کە تێکەڵ بووە بە پرۆسەیەکی ڕۆشنبیری ڕیشەیی کە گەورەترە لە تەنها بنیادنانی سیستەمێکی سیاسی، تەماشای پێگەی خۆی دەکرد وەك پێگەی پێغەمبەری داتە بەرچاو لەبەرامبەر خەڵکی سەردەمی نەفامیدا، بەشێوەیەك کە هیچ مانایەك نەبوو بۆ ئەوەی کە ڕێگەیان پێبدرێت تا مومارەسەی مافی ڕاوێژ بکەن یان ڕێگەیان پێبدرێت تا بەژداربن لە بنیادنانی دەوڵەتی ئیسلامی یاخود بەژداربوون لە هەڵبژاردنی ئیمام یان بەژداری کردن لە دروست کردنی بڕیارەکانی سەربازی و سیاسی.

شێخ موحەمەد هیچ شتێکی وای لەبەردەست نەبوو تا زیادی بکات بۆ فیکری سیاسی کە لە ئیبن تەیمیەوە بەجێ ماوە، تەنانەت گومانیشی لێ نەبوو یان جێگرەوەیەك بخاتەڕوو، شێخ موحەمەد هەڵسا بە بنیادنانی بزوتنەوەکەی کە ڕەنگی عەقیدەیی تیایدا زاڵتر بوو لە ڕەنگی سیاسی.

**بانگەشە کردن بۆ گوێڕایەڵ بوون بۆ ئیمام و بۆ ئیمام و حەڕام بوونی لەدژ دەرچوون و یاخی بوون**

زیاد لەوەی کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بڕوای هەبوو بە شەرعیەتی ئیمامی زاڵبوو خۆسەپێن و ڕەتکردنەوەی ڕاوێژ، ئەوا خەڵکی بانگ دەکرد بۆ گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ ئیمام و حەڕام کردنی لەدژ دەرچوونی لە ژێر سایەی دەوڵەتی وەهابی، بەبێ لەبەرچاوگرتنی سروشتی سیاسەت و ڕەفتارەکانی، هەروەك دەڵێت: " بڕوام بە واجب و پێویست بوونی گوێڕایەڵی و فەرمانبەریە بۆ ئیمامی موسڵمانان، جا ئیمام خراپ یان چاك بێت مادام فەرمان ناکەن بەخراپە و تاوان "[1] و " تەواو بوونی کۆمەڵ کۆبوونەوە: گوێڕایەڵی فەرمانبەرییە بۆ ئەوەی دەبێتە فەرماندەمان ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی بێت "[2].

شێخ موحەممەد دەڵێت: " هەر کەسێ کاروباری خەلافەتی گرتە دەست بەهۆی زاڵبوونی بە شمشێر و موسڵمانان کۆك بوون لەسەری و ڕازی بوون پێی، پێویست و واجبە گوێڕیەڵی کردن و لە دژ دەرچوونی حەڕامە "[3] ئەمە لەمیانەی شوێنکەوتنی ئاراستەی گشتی سوننەیە کە هەڵوێستەکەیان پاڵپشتی

(١) عبد الرحمن بن محمد بن قاسم: الدرر السنية في الأجوبة النجدية ٣٠/١ و ٣٣.

(٢)عبد الرحمن بن محمد بن قاسم: الدرر السنية في الأجوبة النجدية ١٧٣/١.

(٣) عبد الرحمن بن محمد بن قاسم: الدرر السنية في الأجوبة النجدية ٣٠/١ و ٣٣.

کراوه به چەندین ڕیوایەت لە هەمبەر بابەتەکە[1].

---

(١) وەك: " ئەوەی دەبینێت کە والی تاوان دەکات ئەوا با پێی ناخۆش بێت بەڵام با هەرگیز لە گوێڕایەڵی دەرنەچێت "، " هەر کەسێ شتێکی ناپەسەندی بینی لە ئەمیر و پێی ناخۆش بوو ئەوا با ئارام بگرێت چونکە هەر کەسێ لە دژی ئیمام یەك بست بچێتەدەر ئەوا بە نەفامی مردووە " لە ئەبی سەلام گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا: ئێمە مرۆڤین، خوای گەورە خێرو چاکەی بۆ ناردین، ئێمەش لەناوی داین، ئەی لەدوای ئەو چاکە و خێرە ئاشوب و خراپەیەکی تر هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، وتم: چۆن؟ فەرمووی لەدوای من چەندین ئەمیر دێن بە ڕێ و شوێن و بەرنامەی من کار ناکەن جا کەسانێکیان لێ هەڵدەکەون دڵیان دڵی شەیتانە و بە لاشەش مرۆڤن؟ وتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا چی بکەم ئەگەر گەیشتم بەو بارودۆخە؟ فەرمووی: گوێڕایەڵ و فەرمانبەری ئەمیر دەبیت ئەگەر لە پشتیشت بدات " و " لەدوای من چەند ئەمیرێك دەسبەکار دەبن لەسەرتان جا ئەوەی چاکەکارە چاکەتان لەگەڵ دەکات و ئەوەی خراپەکارە خراپەتان لەگەڵ دەکات، گوێڕایەڵ و فەرمانبەربن بۆیان لەوەی کە لەگەڵ حەق و ڕاستی دەگونجێ، جا ئەگەر چاکەیان کرد ئەوە بۆ ئێوەیە و بۆ ئەوانیشە و ئەگەر خراپەیان کرد ئەوا بۆ ئێوە بە چاکە و بۆ ئەوانیش بە سزا ئەژمار دەکرێت " یان ئەوەی لە سەلەمەی کوڕی یەزیدی جەعفەری گێڕدراوەتەوە کە ناوبراو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ~ کردووە، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر چەند ئەمیرێك هاتنە سەر کار داوای مافی خۆیان لەئێمە دەکرد و مافی ئێمەشیان نەدەدا پێمان، ئا لەوکاتەدا تۆ چ فەرمانێکمان پێ دەکەیت؟ پێغەمبەر ڕووی لێوەرگێڕا، دووبارە پرسیاری لێ کرد و پێغەمبەریش ڕووی لێ وەرگێڕا، پاشان لە جاری دووەم یان سێیەم پرسیاری لێکرد، پێغەمبەر ئەوی ڕاکێشا و وتی: " گوێڕایەڵ بن و فەرمانبەربن ئەوان تاوانی خۆیان هەڵدەگرن و ئێوەش تاوانی خۆتان هەڵدەگرن ".

بەپێی ئەمە شێخ حەسەنی کوڕی شێخ حوسەینی، کوڕەزای شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب وتی: "... ملکەچ بوون بۆ ئەوەی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ کاری ئێوەی داوەتە دەست، هیچ کاتێك دەست لەگوێڕایەڵی کردنیان مەکشێننەوەو لەدژیان دەرمەچوون بە شمشێر تا خوای گەورە دەرگاو دەروویەك دەکاتەوە، لەدژی دەسەڵات دەرمەچوو و گوێڕایەڵ و فەرمانبەربن و بەیعەتەکەی ئیمام مەشکێنن، چونکە هەرچی ئەوە بکات ئەوا بیدعەتچیە و بەپێچەوانەی کۆدەنگی جوڵاوەتەوەو جەماعەت پەرتەوازە دەکات، جا ئەگەر حوکمڕان فەرمانی پێکردی بە

سەربای بوونی ڕای ئیبن تەیمیە کە ڕێگە دەدات بە دەرچوون لە دژی هەر حوکمڕانێ، بە مەرجەی پابەند بوون بە شەریعەتی ئیسلامیەوە، ئەوا ئیبن تەیمیە ئەو کارەی بەشتێکی خراپ دانانێت بەو مەرجەی دەرچوون نەبێت دژبە شەریعەت[1]، بەڵام فیکری سیاسی وەهابی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی

---

ئەنجامدانی کارێك کە سەرپێچی خوای گەورەی تێدایە، ئەوا هەرگیز بۆت نییە گوێڕایەڵی بیت، بەڵام بۆ تۆش نیە لەدژی دەربچیت و مافی ئەوی لێ زەوت بکەیت "_ عبد الرحمن بن محمد بن القاسم: الدرر السنية في الأجوبة النجدية ١/٣٤٨.

(١) ئیبن تەیمیە ڕاپەڕین دژبە حوکمڕانە خۆسەپێنەکان ڕەتکردۆتەوە وەك شێوەیەکی سەرتایی دەڵێت: " ئەوەی ناوبانگی هەیە لەلایەن ئەهلی سوننە ئەوەیە کە دەرچوون و جەنگ کردن بەشمشێر لەگەڵ ئیمامەکان بەدروستی نازانن، ئەگەر ستەمیش بکەن، هەروەك چەندین فەرموودەی ڕاست و دروست لە پێغەمبەرەوە ~ هاتوون لەسەر ئەمە... چونکە فیتنە و ئاشوب خۆی لەخۆیدا لە کوشتاردایە و فیتنە و ئاشوب گەورەترە لە دەرئەنجامی ستەمی حوکمڕانان، خراپە گەورەکە وەلا دەنرێت ئەگەر مایەی ئازاریش بێت، تەنانەت وای لێهاتووە کە هیچ دەستەیەك ناناسین کە دەرچووبێت ئەوا بەهۆی دەرچوونەکەی خراپەی زیاتر بەرپابووە لەو خراپەیەی کە کاری کردووە تا لای بدات و لای بردووە ". (ابن تيمية: الاستقامة ١/٣٣٠) بەڵام ئیبن تەیمیە ئیمامەتی نەکردۆتە چاوگ و سەرچاوەی شەرعیەت، بەڵکو کارکردن بەشەریعەتی کردۆتە سەرچاوە، بۆیە دەلاقەیەکی فراوانی کردۆتەوە بۆ شۆڕش کردن، تەنانەت ناوبراو ڕای وانەبوو کە بەزۆری جەنگ بکرێت لەگەڵ خەواریجەکان، بەهۆی گریمانی ئەوەی ئەوەك خەواریج لە دەرچوونەکەیان دا پشتیان بەستبێت بە تەئویل. ئیبن تەیمیە ڕەتی کردەوە هیچ فەرموودەیەکی ڕاست هەبێت لەسەر ئەوەی کە فەرمان بکات بە جەنگ کردن لەگەڵ دەرچووانی دژبە ئیمام، تەنانەت ناوبراو وتویەتی تاکە فەرموودەیەك کە ئەوانەی بۆ چوونیان وایە پێویستە جەنگ لەگەڵ دەرچوواندا بکرێت ئەوا فەرموودەی (کوثەری کوڕی حەکیمە) کە لە نافیعەوە گێڕاویەتیەوەو ئەو فەرموودەیە هەڵبەستراوە، ئەو فەرموودە ڕاستانەی کە فەرمان دەکەن بەجەنگ کردن لەگەڵ دەرچوواندا ئەوا مەبەستیان جەنگ کردنە لەگەڵ ئەوانەی لە شەریعەت دەرچوون نەوەك ئەوانەی لەدژی ئیمام دەرچوون. دەڵێت: " جەنگ کردن لەگەڵ ئەوەی کە تەنها

سعوديه، چاوی نوقاند لەئاست ئەو بۆچوونەی ئیبن تەیمیه و دووباره هاتەوه بۆ ئەوەی دەست بگرێتەوه به ڕاو بۆچوونی سوننی کۆن که به شێوەیەکی ڕەها دەرچوون دژ به حوکمڕان به حەڕام دەزانێت.

فیکرەی گوێڕایەڵی ڕەها بۆ ئیمام پێشتر له فیکری سیاسی سەلەفی (سوننی)[1]، بەستڕابووەوه به تیۆری شەرعیەتی ئیمامەتی کەسی زاڵبوو بەبێ لەبەرچاوگرتنی دادگەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی یان پابەندبوون به یاسا، تەنانەت پەڕاوێز خستنی ڕۆڵی ئوممەت له پرۆسەی چاکسازی و کۆمەڵایەتی و ئۆپۆزۆسیۆنی سیاسی، بەجێهێشتنی لایەنی سیاسی بۆ ئەمیرەکان و حوکمڕانەکانیش پێشبڕکێ دەکەن لەناو خۆیان تا یەکێکیان زاڵ دەبێت لەسەر ئەوانی تردا. فیکری سیاسی وەهابی ئەمەشی بۆ ئەوه زیاد کرد که پێویسته

---

له گوێڕپەڵی ئیمام دەرچووه ئەوا له هیچ دەقێکدا نەهاتووه که فەرمانی پێکرابێت ". ئیبن تەیمیه بۆچوونی وابوو که دروسته دەربچیت لەدژی ئیمامی دادپەروەر بەهۆی تەئویل یان گومانەوه هەروەك موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دەرچوو دژ به ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب. (ابن تیمیه: مجموع الفتوی ٤/٤٥٠ _ ٤٥٢).

(١) سەلەفیەکان هەموو سوننه پێك ناهێنن، ئەگەر دانەر مەبەستی ئەوەبێت که هەموو سوننه پێك دێنن ئەوا ڕاستی نەپێکاوه، ئەگەر مەبەستیشی ئەوەبێت که بەشێکی سوننەن ئەوا ڕاستی وتوه. تەنانەت (شێخ د. محمد سعید رمضان بوطي) له کتێبه بەپێزەکەی دا (السلفية مرحلة زمنية مباركة لا مذهب اسلامي) بەشی سێیەمی کتێبی ناوبراوی ناوناوه به (التمذهب بالسلفية بدعة لا يقرها اتباع السلف) زۆر بەتێروتەسەلی دوواوه لەسەر ئەوەی که ناونانی مەزهەب به "سەلەفی" بیدعەیه، بەڵگەکانیشی لەوبارەوه له هەمان بەشدا خستوونەتەڕوو. بۆیه بەڕەوای نازانم که دانەر ناوی سەلەفی بگشتێنێ بەسەر ئەهلی سوننەدا. (وەرگێڕ).

تاکەکانی بزوتنەوەی وەهابیەت ملکەچ و گوڕایەڵ بن بۆ پێشەواکانی بانگەوازی وەهابیەت، سەرباری خەڵکانی تر(١).

بەپێی ئەمە ئەوا شێخ موحەمەد مافی بەشداری کردن و ناڕازی بوون یاخود یاخی بوون و دەرچوونی نەداوە بە ئوممەت یان بزوتنەوەی وەهابیەت. سەرباری نەبوونی یاسای لێپرسینەوە یان ڕەخنە یاخود گۆڕانکاری کردن. شێخ ئەوەشی ڕەتدەکردەوە کە ڕەخنە ئاراستەی ئەمیرەکان بکرێت بەشێوەیەکی ئاشکرا(٢).

---

(١) شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمان فیکرەی گوێڕایەڵی ڕەها بۆ ئەمیرەکانی، داڕشتووە لە چەند دێڕە شیعرێکدا، تیایدا وتویەتی:

فيلزمكم أن توفوا بعهد امامكم     على الكره منكم و الرضا و التحميد
وتعطونه في ذاك سمعا وطاعـة     كما جـــاء في النص الأكيد المـؤيـد
ولو جار في أخذ المال و اعتـــدى     بضرب و تنكـيل عـــنيف مـــنكد
فلا تخرجوا يوما عليه تعـــنتا     تريدون كشفا للظـــــــلامة باليد

واتە: پێویستە لەسەرتان کە پابەندبن بەو پەیمانەی داوتانە بە ئیمامەکەتان، جا چ پێتان ناخۆش بێت یان پێی ڕازی بووبن و ستایشتان کردبێت. لەسەر ئەمەش گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ببن هەروەك دەق هاتووە لەسەری و جەختیشی لێکراوەتەوە. وە ئەگەر ستەمی کرد لە بردنی سەروەت و سامان و دەستدرێژی کرد بەهۆی لێدان و سزای توندی خەراپ. ئەوا هەرگیز ڕۆژێك دەرمەچن لەدژی بەمەبەستی ئازار پێگەیاندنی و مەبەستان ئەوەبێت کە ستەم بە هێزی بازوو نەهێڵن و لابەرن.

(٢) ئیبن غەننام لە (تاريخ نجد ٣٥٢) دا دەڵێت: جارێك هەندێ کەسی ناو بزوتنەوەکە ڕەخنەیان گرت لە ئەمیرێك لە ناوچەی (سەدیر)، شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب ڕەخنەگرتنی بە ئاشکرای ڕەتکردەوەو پەیامێکی ڕەوانەکرد بۆ دانیشتووانی (سەدیر) و (حرمة) و (المجمعة) و (الغاگ) و (الزلفی) تیایدا هاتبوو کە ڕێگریان لێدەکات لەوەی ڕەخنە بە ئاشکرا ئاراستەی ئەمیرەکان بکرێت تەنانەت ئەگەر والی ناوچەکانیش بن، پێی وتن: " ئەگەر کارێکی ناپەسند لە

## ٢_ توندووتیژی و ترساندن

گشت موسڵمانان تەفسیری وەهابی بۆ یەکتاناسیان ڕەت دەکردەوە، مشتومڕی توندیشیان دەکرد لەسەر ئەوەی کە دوعا و یارمەتی و هاوار کردنی پیاوچاکان هاوبەشدانان بێت بۆ خوای پاك و بەرز، بەتایبەتی کە ئەوان بڕوایان وایە ئەولیاکان تەنها هۆکارن بەرەو خوای گەورە و هیچ سوود و زیانیان بەدەست نییە. ئەمەش پاساوێکی تەواو بوو تاکو تەکفیری موسڵمانان بوەستێنرێت، چونکە موسڵمانان _ بەلایەنی کەمەوە _ بڕوایان بەو شتە هەیە بەهۆی نەزانی و گومانەوە[١]. بەڵام وەهابیەکان ئیعترافیان نەدەکرد بەو

---

ئەمیر یان جگەلەوی بینرا ئەوا بە نەرمی و نهێنی ئامۆژگاری دەکرێت، جا ئەگەر ئامۆژگاریەکەی وەرگرت ئەوە تەواو ئەگەر ئامۆژگارییەکەی وەرنەگرت ئەوا داوا لەکەسێك دەکرێت کە ئامۆژگاری تاوانبارەکە بکات کە قسەی لەلا بڕوات، ئەگەر هەر ئامۆژگارییەکەی وەرنەگرت ئەوا ئەوسا بە ئاشکرا با ئامۆژگاری بکرێت، تەنها ئەمیر نەبێت کە ئەگەر ئامۆژگاری کرا بەنهێنی لە لایەن کەسانی دوورو نزیکی ئەویش قبوڵی نەکرد ئەوا بەنهێنی مەسەلەکە بۆ لای ئێمە بەرزی بکەنەوە".

(١) شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت: " تەنها ئەوانە تەکفیر دەکەین کە بانگەوازە ڕاستەکەی ئێمەی پێگەیشتووە، بەڵگەی بۆ ڕۆشن بۆتەوەو لەسەر بەرپا بووە، کەچی هەر لووت بەرز و نکۆڵی بکات، وەك زۆربەی ئەوانەی ئەمڕۆ جەنگیان لەگەڵ دەکەین، سوورن لەسەر هاوبەشدانان.... پاساو بۆ ئەوە دێنینەوە کە بەسەرچووە: بەوەی هەڵەیان کردووە و پاساویان هەیە، لەبەر ئەوەی پارێزراو نین لە هەڵە.

ئەگەر وتت: ئەی ئەوەی بەڵگەکانی پشکنیوەو وتەکانی پێشەواکانی خوێندۆتەوە، سەرباری ئەمەش سوربوو لەسەر ئەمە تا مرد؟

پاساوانە، بەڵکو پێداگیریان دەکرد لەسەر سەپاندنی تێڕوانین و خوێندنەوە تایبەتیەکەی خۆیان بۆ یەکتاناسی بە زەبری هێز لەسەر خەڵکی و، جەنگ کردن لەگەڵ ئەوەی کۆك نەبێت لەگەڵیان لەسەر تیۆرەکەیان، شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە پرۆسەی تەکفیردا زۆر دوور چووە بەشێوەیەك تا دژەڕاکانی و بێ لایەنەکان و تەنانەت ئەوانەی دوودلیشن تەکفیر بکات.

ئەوەی بەڕاشکاوی دەربڕیوە لە پەیامێکدا کە بۆ شەریفی مەککەی ڕەوانە کردووە، کە پرسیاری لێکرد بۆچی جەنگ لەگەڵ خەڵکی دەکات؟ لەسەرچی خەڵکی تەکفیر دەکات، وتی: تەکفیر و جەنگ لەگەڵ هەندێ لە خەڵکی دەکات:

یەکەم: هەر کەسێ (یەکتاناسی) [1] ئایینی خواو پێغەمبەرەکەی ناسی، ئەوەی کە ئێمە بە خەڵکیمان ڕاگەیاندووە، تەنانەت دانی نا کە بڕوا بوون بە بەرد و درەخت و مرۆڤ کە ئایینی زۆربەی خەڵکییە بریتیە لە هاوبەشدانان بۆ خوا، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دەستخستنی (یەکتاناسی) نەدا و کۆششی نەکرد بۆ فێربوونی و فڕێدانی (هاوبەشدانان) ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە و بەهۆی بێ باوەڕییەکەی لەگەڵی دەجەنگێین، چونکە ئەو دینی پێغەمبەری

---

دەڵێم: هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی پاساو بێنینەوە بۆ ئەوەی کە باست کرد، ناشڵێین: بێ باوەڕە، تەنانەت ناشڵێین کە هەڵەی کردووە، ئەگەرچی سوریش بوو بێت لەسەر هەڵە، چونکە لەسەردەمی ئەوا یەکێك نەبووە لەدژی ڕاپەڕێت بە زمان و شمشێر و چەکەکەی، بەڵگەی بۆ ڕوون نەکراوەتەوەو لەسەری بەرپا نەبووە ". الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٢٣٤/١ _ ٢٣٥ و صيانة الانسان عن وسوسة الشيخ دحلان، لمحمد بشير السهسواني الهندي ٤١٩.

(١) مەبەستی لێی تێڕوانینە تایبەتەکەی خۆیەتی لەبارەی یەکتاناسیەوە، هەروەك ئەمە ڕوون و دیارە؟

ناسیوه کەچی جێبەجێی نەکردووە و هاوبەشدانانی ناسیوه کەچی فەرامۆشی نەکردووە، سەرباری ئەوەی کە نە ڕقی لە دینی پێغەمبەرە نە ئەوەی شوێنی کەوتووە و ستایشی هاوبەشدانانیش ناکات و نایڕازێنێتەوە بۆ خەڵکی.

دووەم: هەر کەسێ هەموو ئەوانەی زانی بەڵام دەرکەوت کە تانە و تەشەر دەدات لە (دینی پێغەمبەر) سەرباری بانگەشە کردنی ئەوەی کە کار دەکات بە دینی ناوبراو، دەریش کەوت کە ستایشی ئەوانە دەکات کە (یوسف) و (ئەشقەڕ) و (ئەبا عەلی) و (خضر) دەپەرستن و بەباشتریان دادەنێت لەوانەی خوای گەورە بەیەك دەزانن و هاوبەشدانانیان فڕێداوە، ئەمەی باسکرا گەورەترە لەوەی لەخاڵی یەکەم دا هاتووە.

سێیەم: هەر کەسێ (یەکتاناسی) ناسی و خۆشی و یست و شوێنی کەوت و (هاوبەشدانانی) ناسی و فەرامۆشی کرد، بەڵام ڕقی لەوانە دەبێتەوە کە دێنە ناو (یەکتاناسی)ەوە و ئەوانەی خۆش دەوێت کە لە سەر (هاوبەشدانان) ماونەتەوە، جا ئەوەش بێ باوەڕە.

چوارەم: هەر کەسێك پاك و سەلامەت بوو لە تێکڕای ئەو شتانەی کە لە سێ خاڵەکەی ڕابردوودا خرانەڕوو، بەڵام دانیشتووانی شارەکەی سورن لەسەر دوژمنایەتی و جەنگ کردن دژبە (یەکتاناسی) و شوێنکەوتنی هاوبەشدانەران، بەڵام کارێکی گرانە لەسەری و ناتوانێت شارەکەی بەجێ بێڵێت هاوشان لەگەڵ دانیشتووانی شارەکەی جەنگ دەکات بە ماڵ و سەروەت و سامان و گیانی لەگەڵ (یەکتاناسان)، بەهەمان شێوە ئەوەش بێ باوەڕە ".

## بەردەوامی توندو تیژی

بەلەبەر چاوگرتنی ئەو عەقیدە توند رەو و زیاد رۆچووەی کە تێکڕایی موسڵمانان تەکفیر دەکات و تۆمەتباریان دەکات بەوەی هاوبەش دانەرن و هەوڵ دەدات سەر لەنوێ "بیان هێنێتەوە ناو ئیسلام"[1]، دەوڵەتی وەهابی نەیدەتوانی

(١) ئەمیر سعودی کوڕی عەبدولعەزیز پابەندبوونی بزوتنەوەی وەهابی بە جیهادی سەرەتا ڕاگەیان، کاتێك لە ساڵی ١٢١٨ك چووە ناو مەککە ڕوونکردنەوەیەکی ڕاگەیاند کە تیایدا دوای لێکدانەوەی واتای هاوبەشدانان لە تێڕوانینی وەهابی دا وتویەتی: "... ئائەمەیە خەڵکی بۆ بانگ دەکەن و جەنگیان لەگەڵ دەکەین لەسەر ئەمە دوای بەرپاکردنی بەڵگە لەسەریان بەو بەڵگانەی کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرەکەی دا (صلی الله علیه وسلم) یەکدەنگی پێشینە چاکەکانی ئەم ئوممەتە، لەمیانەی کارەکانماندا هەڵدەسین بە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز:﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرە: ١٩٣. واتە: (ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت). هەر کەسێ وەڵامی بانگەوازەکە نەداتەوە بەبەڵگە ئەوا بە شمشێر و ڕم ".

لەشوێنێکی تردا وتویەتی: " پێشتر وتومانە کە ئێمە خەڵکی تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهو تاوانەوە، بەڵکو جەنگ دەکەین و تەکفیری ئەوە دەکەین کە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە... ئەگەر وازی لە کارەکەی خۆی نەهێنا بە جەنگ کردن لەگەڵی، ئەوا جەنگ لەگەڵ کردنی پێویستە تاکو دین و بەرنامەو فەرمارەوایی هەر بۆ خوا بێت...

بەڵام ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر ئەو حاڵەتانە و تۆبەیان نەکرد و پەشیمان نەبوونەوە لەو هاوبەشدانانەی کە ئێوە بڕواتان پێی هەیە و پابەندی ئایینی خوای گەورە نەبن کە لە ڕێی پێغەمبەرانی دا ناردوویەتی، ئەو هاوبەشدانان و شتە پڕوپووچ و خورافیاتانە فرێنەدەن، ئەوا هەر بەردەوام دەبین لەسەر جەنگ کردن لەگەڵتاندا تا دەگەڕێنەوە سەر دین و ڕێگەی ڕاست و دروستی

نەیدەتوانی دابمەزرێت بەبێ تووندو تیژی، بەردەوامی بوونی تەنها لەژێر سێبەری شمشێردا بوو، ئا لەوکاتەدا شتێکی پێویست بوو کە وەڵامی دەوڵەتی ناوبراو بدرێتەوە بە هێزو تووندو تیژی، دەوڵەتی ناوبراویش ناچاربوو بۆ بەکارهێنانی تووندو تیژی و تۆقاندن زیاتر بۆ سەپاندن و زاڵبوونی دەسەڵاتەکەی بەسەر موسڵماناندا، بۆیە ململانێیەکی گەرموگوڕ هاتە کایەوە لەنێوان دەوڵەتی ناوبراو و جەماوەری موسڵمان، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکیش ئەو ململانێیە نەمابایە ئەوا بۆ ئەوەبوو کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ خولێکی نوێ لە جەنگدا. هیچ ماوەیەك نەبوو لەژێر سایەی عەقیدەی وەهابی بۆ هاتنە کایەی ئاشتەوایی و ئاشتی لەنێوان دەوڵەتی وەهابیەت و هۆزو نەتەوەو دەستە جیا جیاکانی ئیسلامی، تەنها ئەو ماوەو ڕێگەیە نەبێت کە ببێت بە وەهابی و بەس، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەستەو تاقمانە سەلامەت نەدەبوون لە تووندو تیژی و تێکشکاندن و تۆمەتبار کردن بە هەڵگەڕانەوە.

بێگومان بزوتنەوەی وەهابی لە کۆمەڵگایەکدا لەدایك بووە کە ئیسلامییە و ئەو بانگەوازە وەهابیەی کە تەکفیری دەکات ڕەتدەکاتەوە، ناکرێ کە

---

خوای گەورە:﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرە: ١٩٣. واتە: (ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت)".

سعود زانایانی مەککەو مەدینەی ناچار کرد کە فەتوایەك دەربکەن کە تیایدا هاتووە: " هەر کەسێ نەیەتە ناو ئەو دینە و کاری پێ نەکات و شوێنکەوتووانی خۆشنەوێت و دژایەتی دوژمنانی نەکات ئەوا باوەڕی نیە بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی. پێویستە لەسەر ئیمامی موسڵمانان و موسڵمانان جیهاد و جەنگ بکات لەگەڵ ئەو جۆرە کەسە تا تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە لەو تاوانە تا کار بەو دینە دەکات".

کۆمەڵگای ناوبراو بە ئاسانی ملکەچ بکات و ئیعتراف بکات بەو تەئویلاتە ناشیاو زۆرەملێیانەی کە وەهابیەت هێناویەتی و لە دوایشدا کۆمەڵگەکە دان بەخۆی دابنێت کە هاوبەشدانەر و بێ باوەڕە و لەسەر دەستی وەهابیەت سەر لەنوێ بێتەوە ناو ئیسلام.

ئەوەی تەفسیری ئەمە دەکات ئەو جەنگانەن کە وەهابیەکان بەرپایان کردووە بۆ سەپاندنی مەزهەبەکەیان یان تۆڵە سەندنەوە لە دوژمنانیان چ لە نەجد[1] یان لە ئەحساء[2] یاخود لە حیجاز[1] یان لە عێراق بەتایبەتی لە کەربلا.

---

(١) مێژوو نووسی وەهابی عوسمانی کوڕی بەشیر، وەسفی تێکشکانی دانیشتووانی (ریاض) دەکات: " " دانیشتووانی (ڕیاض) بە پیاو ئافرەت و منداڵ هەڵاتن هیچ یەکێکیان ئاوڕی بەلای ئەویتر نەدەدایەوە، بەسەر ڕوویی خۆیان هەڵاتوون بەرەو وشکانی و دەشتاییەکان بەمەبستی هەڵاتن و دەرچوون، ئەمەش لەکاتی وەرزی هاوینە بووە، جا خەڵکێکی زۆریان تیاچوو بەهۆی برسێتی و تینوێتی.... بەجێهێشتنی بەکاوڵی و داڕوخاوی، خواردن و گۆشت لە مەنجەڵەکان و سەرمەنجەڵەکان لەولاوە کەوتوون، دەرگاکانی خانووەکان دانەخرابوون و پارەو سامانێکی زۆر لە شارەکەدا هەبوو، جا کاتێك عەبولعەزیز چووە ناو شاری (ڕیاض) ئەو بەچۆڵی بینی تەنها کەمێك دانیشتووانی نەبێت مابوون ئەوانی تر هەڵاتبوون و ئەمیر عەبدولعەزیز بەشوێنیان داچوو و دەیکوشتن و ماڵ و سامانەکەیان بەدەستمایەی هەڵدەگرت ...". (عنوان المجد ١٢٠).

ئیبن غەننام دیمەنەکە تەواو دەکات، دەڵێت: " ئیبن سعود دەستی گرت بەسەر گشت ماڵ و سەروەت و سامان و دار خورما وەك دەستمایەیەك لەلایەن خوای گەورەوە چونکە هیچ ئەسپ و سوارێکی پێ ماندوو نەکرد ". (ابن غنام، تاریخ نجد ١٨٢ _ ١٨٣)،

(٢) ئیبن غەننام دەڵێت لەساڵی ١٢٠٦ و ١٢٠٧ ئیبن سعود هێرشی کردە سەر (القطیف) و (الاحساء) نزیکەی هەزارو پێنج سەد پیاوی کوشت و لەناوی برد، تەنانەت قەسابخانەی تۆقێنەری بۆ دانیشتوانەکە دانا. (ابن غنام، تاریخ نجد ١٨٢ _ ١٨٣).

له ساڵی ۱۲۰۸ سعود گەمارۆی هەندێ لادێ و گوندی دا له (الاحساء) چەند پیاوێکی لێکوشتن و دەستی گرت بەسەر هەندێ سەروەت و ساماندا، فەرمانی بە دانیشتووانی (القرین) کرد کە بچنە دەرەوەی شوێنگەی دانیشتنیان. عەرەبە دەشتەکیەکان و ڕەشماڵ نیشینەکان ئەوانەی لەگەڵ سعود بوون ئەوا لەوکاتدا سەرگەرمی تێکدان و بڕینی دارخورما بوون له (الاحساء). (ابن غنام: تاریخ نجد ۱۸۷).

مێژوو نووسی وەهابی عوسمانی کوڕی بەشیر باسی ڕووداوەکانی یەکێك له جەنگەکانی کردووە کە ناوێته بووە بە توندو تیژی و خوێناوی بووە، ئەویش ڕووداوی (جەنگی: الرقیقة)ە کە لەساڵی ۱۲۱۰ك ڕوویدا، لەم بارەوە دەڵێت: " موسڵمانان بەیەکەوە چەکەکانیان تەقاند و زەوی لە رزی و ئاسمان تاریك بوو و ئەڕەو ڤاوقیژی دوکەڵ و هەڵم بڵاو بوومەوە بە کەش و هەوادا و زۆربەی ئافرەتانی سك پڕی (الأحساء) منداڵەکانیان له بەرچوو له ترسان. دوای ئەوە سعود هاتە ناو (الرقیقة)ی ناوبراو. مانگێك له شوێنی ناوبراو مایەوەو هەڵدەستا بەکوشتنی هەر کەسێ کە خۆی ویستی لەسەربایە. ئەوەی ویستی لەسەربایە دەری دەکرد لەسەر ماڵ و حاڵ و له شارەکەی خۆی و ئەوەی حەزی لێبایە بەندی دەکرد و بەکەیفی خۆی له ماڵ و سامانی خەڵکی دەیبرد، ئەوەی دەسەڵاتی ڤێڵاوییە لەناویبرد، هەڵسا بە هەڵکەندنی چاڵ و خانووی دەڕووخاندن، هەزاران دیرهەمی وەك باج بەسەردا سەپاندن و لێسەندن، سعود خەڵکێکی زۆری لێکوشتن... ڤڵان کوژراوە له شارەکە و ڤیسارە دەیبەنە لای ڕەشماڵەکان و لەلای ڕەشماڵ ئیبن سعود سەری دەپەڕێنن، تا زۆربەی دانیشتووانەکەی لەناوبرد، سعود لەو جەنگەدا سەروەت و سامانێکی لەژمار نەهاتووی کۆ کردەوە ". وە ئیبن بەشیر دەڵێت: ئیبن سعود سێ سەد پیاوی کوشت له دانیشتووانی (الفضول)، تەنانەت ئەم گوندە وای لێهات کە وەك نمونە بهێنرێتەوە. (عنوان المجد ۲۱٦).

(۱) "الجبرتي" دەڵێت: وەهابیەکان شارەکەیان داگیر کرد و بە زەبری هێز خۆیان بەسەردا سەپاند و پیاویان لێکوشتن و ئافرەت و منداڵانیان دیل کردن، ئەمە ئەریتی وەهابیەکان لەگەڵ هەر کەسێ کە لەگەڵیان بجەنگێت./ غالب، محمد أدیب: من أخبار الحجاز و نجد في تاریخ الجبرتي ۹۰.

## قەسابخانەکەی کەربەلا

لەسەرووی ئەو قەسابخانانەی وەهابیەکان دایاننا لە قۆناغی سەرەتایاندا قەسابخانە تۆقێنەرەکەی کەربەلا بوو، کە بە سەرکردایەتی سعودی کوڕی عەبدولعەزیز هێرشێکی کوتوپڕی لەناکاوی کرد بەبێ ئەوەی پێشتر ئاگاداریان بکاتەوە یان بانگهێشتیان بکات بۆ ئەوەی ببنە وەهابی، بەڵکو هێرشەکە لەکاتی بێ ئاگایی دانیشتووانی شارەکە بوو، جا قەسابخانەی تۆقێنەریان تیایدا دانا، ئەمەش لەمانگی (ذي القعدة) بوو لە ساڵی ١٢١٦ك (بەرامبەر بە: ٢٠ نیسانی ١٨٠٢ز).

مێژوو نووسی وەهابی عوسمانی کوڕی بەشیر لە کتێبەکەی خۆیدا (عنوان المجد في تاريخ النجد) دەڵێت: سعود بە سەربازو هێزە سەرکەوتووەکەی کە پێکهاتبوو لە دانیشتووانی نەجد و لادێ نیشینەکان خەڵکی باشور و حیجاز و توهامە و جگەلەو شوێنانەی ناوبراو و ئەسپە ئازاد بووە ناودارەکانی ڕوویان کردە کەربەلا و شوێنگەی حوسەین، جا لەناکاو موسڵمانان گەمارۆی کەربەلایاندا و بەزۆر چوونە ناویەوەو زۆربەی دانیشتووانەکەیان کوشت لەناو بازارو خانووەکانیان دا، ئەو گومبەتەیان ڕووخاند کە دانرابوو بەو گومانەی کە گوایە گۆڕی حوسەینە و لاشەی ئەوی تێدایە، ئەوەی لەناو گومبەت و دەورووبەری بوو تاڵانیان کرد، ئەو بەشەی (النصيبة) کە لەسەر گۆڕەکەیان دانابوو کە پێکهاتبوو داڕێژرابوو لە (زمرد) و (یاقوت) و (گەوهەر) بردیان، ئەو سەروەت و سامان و چەك و ڕایەخ و زێڕ و زیو و کتێب و مەصحەفی گران بەها و جگە لەوانەش کە لە ژمار نایەن لەشارەکەدا هەبوون تاڵانیان کرد. هێز و سەربازەکانی سعود تەنها چێشتەنگاوێك لەوێ بوون دواتر نزیك نیوەڕۆ

بەهەموو ئەو سامانەی تاڵانیان کردبوو کە دەچوون لە شارەکەدا، نیزکەی هەزار پیاویان کوشت لە دانیشتووانی شارەکە، دواتر سعود لەشاری ناوبراو دەرچوو (خومس)ی لە دەستمایە (الغنیمە)ی دەرهێنا ئەوەی مایەوە بەسەر موسڵمانانی دابەش کرد و پشکێکی دا بە پیادە و دوو پشکی دا بە سوار "[1].

دەکرێ پشت بەستنی بانگەوازی وەهابیەت بە توندو تیژی لە جێگەی گفتووگۆو قەناعەت دروست کرد و گۆڕینی ململانێکە زیاتر بۆ ئەوەبووە کە دەسەڵاتی ئالی سعود بسەپێنن نەوەك لەوەی بۆ ئەوەیان بووبێت بنەماکانی بانگەوازی وەهابیەت بڵاوبکەنەوە، هەر ئەمەش تەفسیری ئەو ناڕازی بوونە توندەی نەجدمان بۆ تەفسیر دەکات کە بانگەوازی ناوبراو ڕووبەڕووی بووەوە و نزیکەی چل ساڵی خایەند، بۆیە ئەو خەڵکەی کە بە شمشێر ملکەچ بوو بوون بۆ ماوەیەك بۆ دەسەڵاتی ئالی سعود، ئەوا هەر بەخێرایی دەردەچوون یاخی دەبوون کاتێك کەمێك تەرازووی هێز بەلای ئەواندا دەکەوت.

ئەو ساتە بەردەوام بوو بەڵام پڕ بوو لە شۆڕش و ڕاپەڕین، لەگەڵ دەست بەکاربوونی سعودی کوڕی عەبدولعەزیز وەك سەرکردەی هێزی سەربازی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی دوازدەهەمی کۆچی، ئەوا پەشێوییەکی توند و دوودڵییەك دروست بوو لە ملکەچی و گوێڕایەڵ بوونی لادێکانی دەورووبەری نەجد بۆ ئالی سعود و یاخی بوون لێیان، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە سعود ناسراو بوو بە توندو تیژی و خوێنڕێژی و تۆقاندن، هەر کە سعود دەستی دەگرت بەسەر شارێك ئەوا شارێکی تر یاخی دەبوون، هەر کە لادێیەکی سەرکووت دەکرد ئەوا لادێیەکی تر یاخی دەبوو تەحەددای دەکرد.

---

(١) ابن بشر: عنوان المجد ٢٥٧ _ ٢٥٨.

## بانگ کردنی دانیشتووانی مەککە بۆ ئەوەی بێنە ناو ئیسلام

دوای ئەوەی سعودی کوڕی عەبدولعەزیز دەسەڵاتی خۆی سەپاند بەسەر نەجد و (الاحساء) ئەوا ڕووی کردە مەککە بۆ داگیر کردنی، ئالێرەوە زمانی گفتووگۆی بزوتنەوەی وەهابی لەبەرامبەر دانیشتووانی حیجاز و دەوڵەتی عوسمانی گۆڕا، دوای ئەوەی پێشتر شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب سۆزداری دەردەبڕی بۆ شەریفی مەکە و پشتیوانی و خۆشەویستی خۆی پیشاندەدا و "تۆمەتی تەکفیری گشی" لەسەر خۆی لادەدا، سعود نوێنەری نارد بە سەرۆکایەتی شێخ حامدی کوڕی ناصری کوڕی مەعمەڕ بۆ لای شەریفی مەککە ئەمیر (غالبی کوڕی موساعید)، سعود چەندین تۆمەتی ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوی ئاراستەی دانیشتووانەکەی کرد بەبوونی دیاردەی هاوبەشدانان لە مەککە و پاڕانەوە لە مردووان، دانیشتووانی مەککە نکۆڵیان کرد لەبوونی ئەو شتانە بەڵام هیچ گرنگیەکی نەبوو.

کاتێك هێزەکانی سعود لە مەککە نزیك بووەوە لە کۆتایی ساڵی ١٢١٧ك، دانیشتووانی مەککە داوای ئاشتیان لێکرد، بەڵام سعود ڕوونکردنەوەیەکی دەرکرد کە گومانی هەیە لە موسڵمانێتی دانیشتووانی مەککە، بۆیە بانگیان دەکات بۆ ئەوەی بێنە سەر "دینی خوای گەورە" لەو ڕوونکردنەوەدا هاتووە:

" بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لە سعودی کوڕی عەبدولعەزیزەوە

بۆ تێکڕایی دانیشتووانی مەککە و زانایان و ئاغا و کوێخاکان و دادوەری دەسڵات

سڵاویش لەسەر ئەو کەسانە بێت کە شوێنی هیدایەت و ڕێبازی ڕاستەقینە کەوتوون.

پاشان: ئێوە دراوسێی ماڵی خوای گەورەن و دانیشتوانی شاری ئەون لەژێر چاودێری ئەودا ئارامن: " بانگتان دەکەین بۆ سەر دینی خواو پێغەمبەرەکەی ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ آل عمران: ٦٤. واتە: ("ئەی موحەممەد ~ بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەکەیەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لە جیاتی ئەو زاتە نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین). ئێوە ئارام و ئاسوودەن و بێ باکن لەسایەی خوای گەورە پاشان لەسایەی ئەمیری موسڵمانان سعودی کوڕی عەبدولعەزیز و ئەمیرەکەتان (عەبدولوعەیەنی کوڕی موساعید)، جا گوێڕیەڵ و فەرمانبەردار بن بۆی تا ئەمیرەکەتان ملکەچی فەرمانەکانی خوا بێت و سڵاو "[١].

(١) ابن بشر، عنوان المجد ٢٦١.

لە ماوەی دەقی ڕوونکردنەوەکەدا ئەوە بەدەردەکەوێت، کە سعود بە تێڕوانینێکی تایبەت دەڕوانێتە (وەهابیەکان) بەو مانایەی کە (موسڵمانن) دەیڕوانیە دانیشتووانی مەککە بەو مانایەی کە ئەوان (هاوبەشدانەرن) بۆیە سڵاوی لە دانیشتووانەکە نەکرد بەڵکو سەلامی کرد لەوانەی شوێنی هیدایەت و ڕێنمایی دەکەون، بانگی ئەوانی کرد بۆ وشەیەکی هاوسەنگ و هاوبەش کە بریتیە لە یەکتاناسی.

کاتێك سعود چووە ناو مەککەی پیرۆزەوە لە ڕۆژی هەشتەمەوە لە مانگی (محرم) ١٢١٨ك و داوای لە خەڵکی کرد تا کۆببنەوە لە مزگەوتی حەڕام، بەدەم ئەم وتانەوە وتاری دا: " سوپاسی ئەو خوایە بکەن کە ئێوەی ڕێنما کرد بەرەو ئیسلام و ڕزگاری کردن لە هاوبەشدانان. داواتان لێدەکەم کە بەیعەت و پەیمانم پێبدەن لەسەر دینی خواو پێغەمبەرەکەی و پشتی ئەوە بگرن کە خواو پێغەمبەرەکەی پشتی دەگرن و دژایەتی ئەوە بکەن کە ئەوان دوژمنایەتیان دەکەن لە خۆشی و ناخۆشیدا بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری "[1] ڕوونکردنەوەیەکی دەرکرد کە تیایدا هاتووە: " کارەسات بەگشتی بڵاوەی کردووە بە ڕوودانی چەند شتێك گەورەترینیان: هاوبەشدانان بۆ خوا و ڕوو کردنە مردووان و داوای سەرکەوتن لێ کردنیان بەسەر دوژمنان و جێبەجێ کردنی پێویستیەکان و لابردنی ئەو ناخۆشیانەی کە تەنها خوای زەوی و ئاسمانەکان دەسەڵاتی بەسەردا هەیە و توانای بەسەردا دەشکێت... دەڵێم هەر کەسێ لە نێوان خۆی و خوای گەورە هۆکار دابنێت و شەفاعەتیان لێ داوا بکات ئەوا بەو کارەی پەرستوویەتی و هاوبەشی بڕیارداوە. شەفاعەت تەنها بۆ خوای

---

(١) عبد العزيز التويجري، لسراة الليل هتف الصباح ٤٩.

گەورەیە. هەروەك لە فەرموودەیەكدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ~ كە دەفەرمووێت: قیامەت هەڵناسێ تا كۆمەڵێ لە ئوممەتەكەم نەگەن بە هاوبەشدانەران و هەتا كۆمەڵانێ لە ئوممەتەكەم بتان دەپەرستن...

ئا ئەوەیە كە ڕاجیایی دروست كردووە لە نێوان ئێمە و خەڵكی دا تا كار گەیشتە ئەوەی ئێمەیان تەكفیر كرد و جەنگیان لەگەڵ كردین و ماڵ و سەروەت و سامان و خوێنیان حەڵاڵ كردین... تا خوای گەورە سەری خستین لەسەر ئەواندا، ئا ئەمەشە كە ئێمە خەڵكی بۆ بانگ دەكەین دوای بەرپاكردنی بەڵگە لەسەریان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) و یەكدەنگی پێشینە چاكەكانی ئوممەت، بەجێبەجێ كردنی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرة: ١٩٣. واتە: (ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەكو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت). هەر كەسێ وەڵامی بانگەوازەكە نەداتەوە بە بەڵگە و ڕوونكردنەوە ئەوا جەنگی لەگەڵ دەكەین بەشمشێر و ڕم ".

دواتر وەهابیەكان دەست پێشخەریان كرد بۆ ڕووخاندنی ئەو گومبەتانەی لەسەر شوێنی لەدایك بوونی پێغەمبەر ~ و ئەبو بەكر و ئیمامی عەلی و خەدیجە بوون، ئەو گومبەتانەی تریش كە وەهابیەكان بەوەیان دادەنا كە " بتانێكن لە جیاتی خوای گەورە دەپەرسترێن ". سعود پەیامێكی ڕەوانەكرد بۆ سوڵتان سەلیمی عوسمانی، كە هەواڵی پێدەدات بەوەی هەڵساوە بە " ڕوخاندن و لەناوبردنی ئەو شتانەی هاوشێوەی بت و پەیكەرن "[1]. فەرمانی كرد بە

---

(١) عبد العزيز التويجري، لسراة الليل هتف الصباح ٤٦.

بانگدەرەکەی کە ڕابگەیەنێت لە مەککەی پیرۆزدا:﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا ﴾ التوبة: ٢٨. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە چاك بزانن کە موشریك و هاوەڵگەران ناپوخت و پیسن، ئیتر لەم ساڵەیان بەدواوە نابێت نزیکی مزگەوتی حەڕام (کەعبەی پیرۆز) بکەون).

شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە مەککە ڕاوەستا و وتی: " هەر کەسێ بڵێت ئەی پێغەمبەری خوا یان ئەی ئیبن عەبباس یاخود ئەی عەبدولقادر یان هاواری جگەلەوانەی ناوبراو بکات کە بەدیهێنراون، مەبەستی لەو هاوار کردنە لابردنی ناخۆشیەك بێت یان هێنان و دەستخستنی خێر و چاکەیەك بێت یان گشت ئەو شتانەی کە تەنها خوای گەورە توانای بەسەردا هەیە وەك شیفای نەخۆش و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و پاراستن لە شتی ناخۆش و هاوشێوەی ئەمانە: ئەوا ئەو کەسە هاوبەشدانەرو موشریکە بە هاوبەشدانانێك، کە خوێن و سەروەت و سامانی بە فیڕۆ دەدات، ئەگەرچی بڕواشی وابێت کە ئەوەی کارای کاریگەری هەیە لەسەر بوونەوەر تەنها خوای تاك و پاکە، بەڵام کەسەکە مەبەستی لە پاڕانەوە لە بەدیهێنراوەکان شەفاعەت خواستن بووە کە بەهۆیەوە نزیك ببێتەوەو پێویستیەکەی لەلایەن خوای گەورە جێبەجێ بکات بەهۆی ئەو نهێنیەی خۆیان و شەفاعەتیان لە ژیانی بەرزەخدا "[1].

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٢٢٤/١، سەرباری ئەوەی کە بەڕاشکاوی تەکفیری تێکڕایی موسڵمانان دەکەن ئەوانەی کە پێشتر و ئێستاش داوای شەفاعەت لە پێغەمبەران و ئەولیاکان دەکەن، ئەوا شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە شوێنانی تردا سکاڵا دەکات لەدەست درۆکانی

دژمراکانی لەوەی تۆمەتی تەکفیری موسڵمانان بەگشتی دەدەنە پاڵ وەهابیەکان، لە پەیامێکی دا دەڵێت: " ئەو درۆیەی بەدەمی ئێمە هەڵدەبەستن ئەوا مەبەستیانە ڕاستی دابپۆشن و سەر لەخەڵکی بشێوێنن... گوایە ئێمە تەکفیر دەگشتێنین و ئەوەی دوای شەش سەد ساڵیش تەکفیر دەکەین، تەنها ئەوانە تەکفیر ناکەین کە وەك ئێمەن، یەکێ لە شتەکانی تر ئەوەیە کە ئێمە بەیعەتی کەس قبوڵ ناکەین تا دان نەنێت بەوەی پێشتر موشریك بووە و باوك و دایکی لەسەر هاوبەشدانان مردوون.... وەڵامی ئێمە لەهەمبەر هەر مەسەلەیەك لەمانە ئەوەیە کە دەڵێین (پاك و بێ گەردی بۆتۆ خوایە بەڕاستی ئەمە بوختانێکی گەورەیە). شێخ وتەکانی تەواو دەکات و دەڵێت: " ئەگەر یەکێك وتی، " لەو دان پێدانان و حوکمە یەکلایی کراوەتاندا ئەوە پێویست دەبێت کە هەر کەسێ بڵێت:(ئەی پێغەمبەری خوا داوای شەفعەتت لێ دەکەم) ئەوا ئەو کەسە خوێنی بە فیڕۆدراوە، ئەوکاتە پێویستە بوترێت: کە زۆربەی ئوممەت بەتایبەتی پاشینەکان بێ باوەڕن، بەهۆی ئەوەی زانایان ڕاشکاوانە دەریان بڕیوە کە ئەو شتە: شتێکی چاك (مندوب)ە، تەنانەت دەبێت دەست بکەن بە هێرش کردنە سەر ئەوانەی بە پێچەوانەی بۆچوونەکەتان دەجوڵێنەوە لەو بارەدا.

دەڵێم (مەبەستی شێخ موحەمەد خۆیەتی _ و _): ئەوە پێویست ناکات، چونکە ئەوەی مەزهەب پێویست دەکات ئەوا خودی مەزهەب نییە (لازم المذهب ليس بمذهب)، لەبارەی ئەو کەسەی مردووە دەڵێین: ئەو ئوممەتە تێپەڕی و بەسەرچوو، تەنها ئەو کەسە تەکفیر دەکەین کە بانگەوازی ڕاستی ئێمەی پێگەیشتبێت، بەڵگەکە بۆی ڕوون کرابێتەوەو بەڵگەی لەسەر بەرپا بووبێت، کەچی هەر لووت بەرزبێت و نکۆڵی بکات، هەروەك زۆربەی ئەوانەی ئەمڕۆ جەنگیان لەگەڵ دەکەین ئەوا سورن لە سەر هاوبەشدانان... ئەوەی کەمینەن: بۆیە جەنگی لەگەڵ دەکەین چونکە پشتی ئەو حاڵەت و بارودۆخە دەگرێت و پێی ڕازییە، هەوڵی زیادبوونی کەسانی وەسفکراو دەدات (وەسفکراو لە دوو سێ دێرەکەی ڕابردوودا _ و _)، گەرم و گوڕییەکەی لەگەڵ ئەو حاڵەت، ئەو کاتە حوکمەکەی لە کوشتنی دایە. پاساویش دێنینەوە بۆ ئەوەی مردووە: بەوەی ئەوان هەڵەکار و بووردراوون، لەبەر پارێزراو نەبوونیان لە هەڵە.

ئەگەر وتت: حوکمی ئەوە چییە کە بەڵگەکانی پشکنیوە و وتەی پێشەواکانی پێگەیشتووە؟ کەچی سوربوو لەسەر حاڵەتەکەی خۆی تا مرد؟

وەهابیەکان کۆمەڵێك ڕوونکردنەوەیان دەرکرد بە زانایانی دوو شارە پیرۆزەکە (مەدینە و مەککە) و بە (شەریف غالب) دانان بە ئایینی نوێی (ئیسلام) و خۆبەری کردن لە ئایینی کۆنیان (هاوبەشدانان) و فەتوادان بە تەکفیر کردنی تێکڕای موسڵمانان _ بێ گومان ئەمەش لە ژێر هەڕەشە و هێزی چەك _ جا زانایانی مەککەی پیرۆز ئەو ڕوونکردنەوەیەی خوارەوەیان دەرکرد: "ئێمەی زانایانی مەککە گەواهی دەدەین لەسەر ئەو پەڕاوەی نووکی خامە و ڕووی خەتمەکانمانی لەسەرە: کە ئەو دینەی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ هێنای و ئەو بانگەوازەی ئیمامی موسڵمانان سعودی کوڕی عەبدولعەزیز بانگەشەی بۆ کرد لە خوا بەیەکزانین و نەهێشتنی هاوبەشدانان کە لەو کتێبەدا باسی کردووە ڕاستەو هیچ دوو دڵی و گومانی تێدا نیە، ئەوەی پێشتر ڕوویدا لە مەککە و مەدینە و میسر و شام جگەلەو وڵاتانەش تا ئێستا لە هەموو جۆرەکانی هاوبەشدانان.... ئەوا کوفرێکە کە خوێن و ماڵ و سەروەت و سامان حەڵاڵ دەکات و ئەنجامدەری هەتا هەتا لە ئاگری دۆزەخ دا دەبێت، هەر کەسێ نەچێتە ناو ئەو دینە (کە شێخ موحەممەد هێناویەتی) و پشتگیری هەڵگرانی نەکات و دوژمنایەتی دژەڕاکانی نەکات ئەوە لەلای ئێمە باوەڕی نییە بە خوا و بەڕۆژی دوایی و، پێویستە لە سەر ئیمامی موسڵمانان (سعودی کوڕی عەبدولعەزیز) و موسڵمانانی جیهان جەنگ لەگەڵ

---

دەڵێم: هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی پاساو بێنینەوە بۆ ئەوەی باسی لێوەکرا، ناشڵێین: ئەو بێ باوەڕە یان هەڵەکارە ئەگەرچی سوریش بێت لەسەر هەڵەکەی، بەهۆی نەبوونی یەکێك لە سەردەمی ئەودا کە لە دژی ڕابپەڕێت بە زمان و شمشێر و ڕمەکەی، جا بەڵگەی لەسەر بەرپا نەبووە و بۆی ڕوون نەبۆتەوە ". الدرر السنية و الأجوبة النجدية ١/٢٣٤ _ ٢٢٥ و صيانة الانسان عن وسوسة الشيخ دحلان، دانراوی: محمد بشير السهسواني الهندي ٤١٩.

ئەو جۆرە کەسانە بکەن تا واز دێنێت و تەوبە دەکات لەو بۆچوونەی کە لە سەریەتی و کار بەو دینە دەکات.

ئەمانەی شایەتیان لەسەر ئەم پەڕاوەدا:

١_ عەبدولەلیکی کوڕ عەبدولونعیمی قەلعی حەنەفی، موفتی مەککەی پیرۆز.

٢_ موحەمەدی کوڕی صاڵحی کوڕی ئیبراهیم، موفتی شافیعیەکان لە مەککە.

٣_ موحەمـەدی کـوڕی موحەمـەدی عـەرەبی بـەناتی، مـوفتی مالکیـەکان لـە مەککە.

٤_ موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی مالیکی.

٥_ موحەمەدی کوڕی یەحیا، موفتی حەنبەلیەکان لە مەککە.

٦_ عەبدولحەفیزی کوڕی دەرویشی عەجیمی.

٧_ زەینولعابدین (جمل اللیل).

٨_ عەلی کوڕی موحەمدی بەیتی.

٩_ عەبدوڕەحمان جەماڵ.

١٠_ بیشری کوڕی هاشمی شافیعی "[١].

بەهەمان شێوە زانایانی مەدینەی منەوەرەش ڕوونکردنەوەیەکی هاوشێوەیان دەرکرد، کە تیایدا هاتووە: " شایەتی دەدەین کە ئەوەی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب هێناویەتی و پێی هەڵساوە و ئیمامی موسڵمانانیش سعود ئێمەی بۆ بانگ کرد لە بەیەکگرتنی خوای گەورە و فرێدانی شیرك ئەوا هەر وایە کە دینی ڕاست و دروستە و گومانی تێدا نییە. ئەوەی پێشتر ڕوویداوە لە مەککە و مەدینە و شام و میسر و جگەلەوانیش لە

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٣١٤/١.

شارەکانی تر تا ئێستا لەو جۆرانەی هاوبەشدانان کە باسکران لەو کتێبەدا: کە کوفرێکە خوێن و ماڵ و سەروەت و سامان حەلاڵ دەکات و هەرچی نەیەتە ناو ئەو ئایینە و کاری پێنەکات و نەبێتە خاوەن عەقیدە، ئەوا باوەڕی نییە بەخواو بەڕۆژی دوایی و پێویستە لەسەر ئیمامی موسڵمان و تێکڕای موسڵمانان، هەڵسن بە ئەنجامدانی فەرزی تیکۆشان (الجهاد) و کوشتنی خەڵکی هاوبەشدانەرو لاسار! و ئەوەی کار بکات بەپێچەوانەی ئەو بڕیارو حوکمانەی کە لەو کتێبە دا هاتوون لە خەڵکی میسر و شام و عێراق و هەموو ئەوانەی کە هاودینیانن! ئەو باوەڕەی کە ئێستا هەیانە هەر لەسەری بەردەوام بن ئەوا هەر لە شوێنی خۆی بێ باوەڕێکی هاوبەش دانەرە.

شایەتی دەدەم لەم بارەوە و منیش هەژاری (مەبەستی خۆبەکەم زانینە[1]) کوڕی حوسەینم، لە مێرگی (روضة)ی پیرۆز[2]، موحەمەدی کوڕی صالح ڕیضوان و موحەمەدی کوڕی ئیسماعیل و هەژاری دەرگانەی پەروەردگار حەسەن نووسیویانەو شایەتی دەدەن لەسەر ئەمە "[3].

بەهەمان شێوە (شەریف غالبی کوڕی موساعد) واژووی کرد لەسەر ڕوون کردنەوەیەکی هاوشێوەی ئەمە کە تیایدا ئیعتراف دەکات لەسەر ئەوەی کە خۆی بێ باوەڕ بووە، سەرباری تەکفیر کردنی تێکڕایی ئوممەتی ئیسلامی[4].

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) روضة: ئەو شوێنەیە کە دەکەوێتە نێوان گۆڕو مینبەری پێغەمبەر ﷺ، هەروەك پێغەمبەر دەفەرمووێت: (لەنێوان گۆڕو مینبەرەکەم مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت) بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە. (وەرگێڕ).

(٣) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٣١٧/١.

(٤) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٢١٦/١.

## ڕاگەیاندنی تەکفیر کردنی دەوڵەتی عوسمانی

کاتێك دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دا کە کەمێك دابەزێت بۆ سعودی کوڕی عەبدولعەزیز و چەندین نوێنەرو نامەی بۆ لای ڕەوانە کرد کە تیایدا داوای ئاشتەوایی و ڕێکەوتن دەکات، لەوەڵامدا سعود پەیامێکی درێژی ڕەوانە کرد بۆ یوسف پاشای والی، کە تیایدا هاتووە: " بە ڕێکەوتن و ئاشتەوایی کردن لە جیاتی ئیسلام ئەوا شتێکی مەحاڵە بە هێزو پشتیوانی خوای گەورە، تۆش تێدەگەیت کە چەندین جار داواتان کردووە.... جزیەتان لەسەر خۆ پێویست کرد کە سی هەزار میسقاڵ زێڕبوو تا بیدەن بە ئێمە، بەڵام ئێمە قبوڵمان نەکرد و ڕێك نەکەوتین لەسەر ئاشتەوایی کردن، ئەگەر ئیسلامتان قبوڵ کرد ئەوا چاکەکەی بۆ ئێوە و هەر ئەوەشە مەبەست و ئامانجی ئێمە و ئەگەر ڕازیش نەبوون ئەوا پێتان دەڵێین هەروەك خوای پاك و بەرز دەفەرمووێ:﴿ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيم ﴾ البقرة: ١٣٧. واتە: (بەڵام ئەگەر هەر پشتیان تێکرد، ئەوە بێ گومان دەکەونە دژایەتی و دووبەرەکییەوە، "بەڵام دڵنیابە ئەی محمد ~، ئەی ئیماندار" خوا تۆ دەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان چونکە ئەو خوایە زۆر بیسەرو زانایە)[1].

والی بەغداد سولەیمان پاشا نارەزایی دەربڕی لەسەر ئەم پەیامە توونـدو تیژە، سعود پەیامێکی بۆ نارد کە هەڵوێستی بەڕاشکاوی ڕادەگەیەنێت

(١)پەراوێزی: عنوان المجد: ابن بشر، ب١، لا ٣٢٣، وەرگیراوە لە: الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٢٦١/٧.

لەبەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی، کە سعود تۆمەتباری کرد بە کوفر و هاوبەش دانان و هەڵگەڕانەوە و بانگی دەکرد بۆ دووبارە هاتە ناو ئیسلام. لە پەیامەکەدا هاتووە: " باسی ئەوەتان کردووە کە ئەو پەیامەی ئێمە ناردوومانە بۆ یوسف پاشا بەپێچەوانەی ئەو گوتارەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی پیویستیان کردووە بەکاربهێنرێت لەگەڵ موسڵمانان بەڵکو ئەو شێوازەی لەگەڵ بێ باوەڕان و موشریکان بەکاردەهێنرێن، ئەمەی تیایدا باس کراوە حاڵ و باڵی گومڕابووان و پێشەوا نەفامەکانە، ئێمەش دەڵێین: شوێنی ئەوە دەکەوین کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەران و بەندە ئیماندارەکانی جێبەجێی بکەن. بەڕاستی لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتانەوەیە کە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەو کارانەی جولەکە و مەسیحیەکان کە خوای گەورە سەرزەنشتی کردووە کەچی هاوشێوەی کاری جولەکە و مەسیحیەکان لە ناو ئوممەتیشدا هەن... ئەوەی براکانیان دەیکەن لەبەردەم تاغوتەکانیان، جا ئەوانە ڕێ و شوێنی ئەوانەی پێش خۆیان هەڵگرتووە... هاوبەشدانان زاڵبوو بەسەر زۆربەی خەڵکیدا، بەهۆی دەرکەوتنی نەزانی و پەنهان بوونی زانست و چاکە بووە خراپە و خراپە بووە بە چاکە... لە لەو بارودۆخەدا منداڵ گەورەبوو گەورەش پیر بوو، مەشخەڵەکانیش کوژانەوە و ئیسلام زیاتر نامۆ بوو و زانایان کەم بوونەوە و نەفامەکان زاڵ بوون و کارەکە ئاڵۆز بوو و ئازار و ترس بەهێزتر بووە و تاوان خراپە دەرکەوتووە و هەموو سەرزەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان گوناهانەی کە خەڵکی دەستیانداوەتێ. بەڵام بەردەوام کۆمەڵ و دەستەیەك لە شوێنکەوتووی پێغەمبەر موحەمەد هەن کە کار بەحق دەکەن و لەسەر حەقن و جیهاد دەکەن لەگەڵ هاوبەشدانەر و بیدعەتکاران تا ڕۆژی

قیامەت..... سەیری وتەی ئەو پێشەوایانە بکە کە دەڵێن ئەو کارانەی هاوبەشدانانن خەڵکی بەگشتی ئاڵوودەی بووەو بڵاوبووەتەوە لە زۆرێك لە وڵاتانی شام و جگە لەویشدا، لەبەرامبەرد ئیسلام زۆر نامۆ بووە... و ئەو زیارەتگە و گومبەت و شتە دروستکراوانەی سەر گۆڕەکان زۆر بووە و هاوبەشدانانیش بەو هۆیە زیاتر بووەو تەنانەت وای لێهاتووە کە هەندێ لەو زیارەتگەیانە وەك (لات) و (عوزا) و (مەنات)ی سێیەمی لێهاتووە، تەنانەت شیرکی ئەو زیارەتگەیانە لە بتە ناوبراوەکان گەورەترە. ئەمەش ئەو وتەیەتان پوچەڵ دەکات کە دەڵێن ئێمە لەسەر فیترەتی ئیسلامی و عەقیدەی ڕاست و دروستین، تەنانەت ئەوەش دەسەلێنێت کە زۆربەتان ئیسلام وعەقیدەی ڕاستتان فڕێداوە و دینتان بووەتە هاوبەشدانان بۆ خوا و پاڕانەوە و هاوار کردن و داوای یارمەتی کردن لە مردووان.

بەڵام ئەو وتەیەتان کە دەڵێن:(ئێمە موسڵمانی ڕاست و دروستین و پێشەواکانمان پێشەوای چوار مەزهەبە و کۆششکار (مجتهد)ەکانی ئایین و ئوممەتی موحەمەدی یەکدەنگن لەسەر ئەمە)".

ئێمەش دەڵێین: فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی و پێشەوای چوار مەزهەبەکەمان بۆ ڕوون کردنەوە کە بەڵگە لاوازو بێ بنەماکەتان پوچەڵ دەکاتەوە. حاڵی ئێوەو پێشەواو سوڵتانەکانتان گەواهیدەرن لەسەر ئەوەی کە ئێوە درۆزنن. کاتێ ژووری گۆڕی پێغەمبەرمان ~ ڕزگار کرد، ئەوا ٢٢ پەیامی سوڵتان سەلیمی ئێوەمان بینی، کە ناردبووی بۆ کوڕە مامی پێغەمبەری خوا و بەهۆی کوڕەمامی ناوبراوەوە داوای یارمەتی و بەهانا هاتن و سەرکەوتن دەکات بەسەر دوژمنە مەسیحی و دوژمنانی تریش، لە پەیامەکانی سوڵتانی ناوبراو

ملکەچی و پەرستش و مل دانەواندن و ترس و لەرزی تێدایە کە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئێوە درۆزنن، یەکەم پەیام:(لە سوڵتان سەلیمەوە کۆیلەکەی جەنابت. پاشان: ئەی پێغەمبەری خوا ناخۆشی و چەرمەسەری دەوری داوین و بەسەرماندا باریوە، داوای یامەتی و سەرکەوتنت لێدەکەین بەسەر دوژمناندا). زۆرێك لە زانایان وتویانە: یەکێك لە هۆکارەکانی هاوبەشدانان و بێ باوەڕی: زیاد ڕۆچوونە لە پیاوچاکان.... جا هەموو ئەو جۆرە شتانە هاوبەشدانان و گومڕایین، پێویستە داوای تەوبە لە بکەرەکەی بکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە تەواو ئەگەرنا ملی دەپەڕێنرێت.

ئەو وتەیەشتان کە دەڵێن: (ئەو گوناهو تاوانانەی کە دەشیکەین ئەوا نابێتە هۆی دەرچوونمان لە بازنەی ئیسلام، هەروەك خەواریج واگومانیان دەبرد).

دەڵێین: سوپاس بۆ خوا ئێمە هیچ یەکێك لەوانەی سوژدە دەبەن بەرەو مزگەوتی حەڕام (کە ئەهلی قیبلەن) تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهەوە، بەڵکو ئەوانە تەکفیر دەکەین کە خواو پێغەمبەرەکەی دەقیان لەسەر هێناوە و زانایانی ئوممەتی موحەممەدی یەکدەنگ بوونە لەسەری: کە ئەو کارە بێ باوەڕیی و کوفرە، وەك هاوبەشدانان بە پەرستنی غەیری خوای گەورە، نمونەی ئەو هاوبەشدانانەش وەك پاڕانەوەو نەزر کردن و قوربانی کردن و ڕقبوونەوە لەدین و دینداران و سوکایەتی پێکردنیان.

ئەو وتەیەشتان: (چۆن بەتەکفیر کردنی موسڵمانان کار لەسەر وشیار کردنەوەیان دەکرێت لەهەمبەر ئەو ئاشوب و فیتنە، جەنگ کردن لەگەڵ میللەتێك کە بڕوایان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە، تەنانەت حەڵاڵ کردنی

ماڵ و سەروەت و شەڕەفیان و سەربڕینی مەڕو ماڵاتیان و سوتاندنی خۆراکیان لەلای شام....تاد؟).

دەڵێین: پێشتر ڕوونمان کردەوە کە ئێمە بە ئەنجامدانی تاوان تەکفیر ناکەین، بەڵکو جەنگ دەکەین و تەکفیری ئەو کەسە دەکەین کە هاوبەش و هاوەڵی بۆ خوا بڕیارداوە..... جا ئەگەر ئێوە ڕاستگۆبن لەو بانگەشەیەتان کە:( ئێوە لە ئوممەتی ئیسلامن و شوێنکەوتەی پێغەمبەرن ~) ئەوا ئەو گشت بت و پەیکەرانە بڕوخێنن و تەختیان بکەن لەگەڵ زەوی دا، تەوبە بکەن بگەڕێنەوە لای خوا و دەست هەڵگرن لە گشت ئەو جۆرە هاوبەشدانان و بیدعەتانە، ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە بەجێ بێنن کە (لا اله الا الله)یە. هەر کەسێ هەر جۆرێ لە جۆرەکانی پەرستشی کرد بۆ شتی مردوو یان زیندوو جگە لە خوای گەورە ئەوە قەدەغەی بکەن، پیشانیشی بدەن کە ئەمە خۆچوواندنە بە بت پەرستان و پێچەوانەی دینی ئیسلامە، ئەگەر دەستی هەڵنەگرت لەو کارانە تەنها بەجەنگ نەبێت ئەوا پێویستە جەنگی لەگەڵ بکرێت تا ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوا بێت...

ئەگەر ئەو شتانەی باسم کردن جێ بەجێتان کرد ئەوا ئێوە برای ئێمەن هەمان ئەرك و مافی ئێمەتان دەبێت و خوێن و ماڵ و سەروەتتان لەسەر ئێمە حەڕام دەبێت. ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر حاڵەکەتان و تەوبەتان نەکرد لە هاوبەش دانانەکەتان و پابەندی دینی خوا نەبن کە ڕەوانەی کردووە بە پێغەمبەرەکانی و ئەو شیرك و بیدعەت و شتە داهێنراوانە فڕێنەدەن، ئەوا هەر بەردەوام دەبین لەسەر جەنگ کردن لەگەڵتاندا تا دەگەڕێنەوە سەر ڕێگە و دینی ڕاست و دروستی خوای گەورە.

﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرة: ١٩٣. واته: (ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت).

ئەم پەیامە نووسراوە لە ڕێکەوتی چواردەی مانگی (ذی القعدة)ی ساڵی بیست و پێنج "[1].

ڕاگەیاندنی تەکفیری دەوڵەتی عوسمانی و دانیشتووانی دەوڵەتی ناوبراو لەلایەن بزوتنەوەی وەهابی بە سەرکردایەتی ئەمیر سعودی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود، کە لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسا بە هەڵمەتی سەربازی توند بۆ سەر شوێنە جیا جیاکانی دەورووبەر و بەکارهێنانی تۆقاندن بەشێوەیەکی بەرچاو، بووە هۆی ئەوەی ئیبن سعود بتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بسەپێنێت، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی و جیهانی ئیسلامی هاندا و وروژاندنی تا هەڵسێت بە هەڵمەتێکی پێچەوانە کە بریتی بوو لە فەرماندان بە والی میسر (موحەمەد عەلی) پاشا تا هێرش بکاتە سەر حیجازو نەجد و دەوڵەتی وەهابی بڕوخێنێت. دوای ئەو فەرمانەی دەوڵەتی عوسمانی پەشیمان بوونەوەی سەرکردەی وەهابی نوێ ئەمیر عەبدوڵڵای کوڕی سعود لە تەکفیر دادی نەدا، تەنانەت ئەوەش دادی نەدا کە سەرکردەی وەهابیەکان هەڵسا بە ڕاگەیاندنی خۆشویستن و پشتگیری تەواو بۆ سوڵتان مەحمود غازی عوسمانی و سەرکردەی وەهابیەکان ڕایگەیاند

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٢٨٧/١ و ٣٠٤ _ ٣١٣ و سەیری ئەمەش بکە: رسائل أئمة الدعوة التوحيد: فيصل بن مشعل آل السعود ٥٥ _ ٧٩.

که ئەو "کۆیلەو بەندەیەکە لە کۆیەلەکانی (بابولعالی) و لەڕیزی خزمەتکارەکانە"[1].

هەروەك شتێکی زۆر سەخت بوو لەسەر تێکڕایی موسڵمانان کە قبوڵی بانگەوازی وەهابیەت بکەن، ئەو بانگەوازەی کە پێویستی دەکرد لەسەر موسڵمانان دان بنێن بەخۆیان کە هاوبەشدانەر و بێ باوەڕبوونە و سەر لەنوێ بچنەوە ناو ئیسلام. بزوتنەوەی ناوبراو تووشی ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی فراوان و درێژ دەبووەوە لەلایەن موسڵمانان، بۆیە تەنها ڕێگەی توندوتیژی و تۆقاندن لە بەردەمی وەهابیەکاندا ما بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ خۆیان و عەقیدەکەیان ملکەچ بکەن، ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ کارکردن لەهەمبەر ڕووبەڕوو بوونەوەیان و هەڵکەوتنی فرسەت و هەل بۆ ڕزگاربوون لێیان بەزەبری هێز. چونکە هیچ ڕۆژێك بە تەنها شمشێر بنەمای دەوڵەتی پێك نەهێناوە و ئەو گەلەی بەشێوەیەکی کاتی ملکەچی بزوتنەوەیەك دەبێت بە زەبری هێز ئەوا ڕەتکردنەوەی لەلایەن هەمان گەل بەشێوەکی نەرێنی خراپ و توند دەبێت. هەر ئەوەش بوو ڕوویدا لە ئەنجامی ئەو ڕاپەڕین و ڕووبەڕوو بوونەوانەی بەردەوام بوون لە نێوان زۆربەی دانیشتووانی شوێنەکانی دوورگەی عەرەبی لەگەڵ هێزە جەنگاوەرەکانی سعودیەی وەهابی دا، ئەم ڕووبەڕوو بوونەوە سەربازیانە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ڕووخانی دەوڵەتی وەهابی یەکەم.

هەر ئەمەش بوو بۆچوونی (حافظ الوهبة) ڕاوێژکاری شا عەبدولعەزیزی کوڕی سعود، کە دەڵێت هۆکاری ڕووخانی دەوڵەتی سعودەیەی یەکەم: زیاتر

---

(١) عبدالرحيم عبدالرحيم، الدولة السعودية الأولى ٣٩٢ _ ٣٩٣.

پشتی بەستبوو بە هێزی سەربازی لەوەی پشت ببەستێت بە کێش کردن و ڕام کردنی دڵەکان، بانگەواز لە دڵی خەڵکیدا جێگیر نەبوو بوو، بۆیە شۆڕشەکان لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەردەکەوتن بۆ لابردنی حوکمی سعودیی، بەتایبەتی لەو شارانەی دوور بوون لە نەجد وەك شاری (عەسیر) و (عمان) [1]، دکتۆر عەبدوڵای کوڕی عوثەیمین هەمان بۆچوونی هەیە و دەڵێت: " جەنگەکانی هۆکار و بنەمای سەرەکی فراوان بوونی سنوری دەوڵەتی سعودییەی یەکەم بوو هەروەك چۆن هۆکاری سەرەکیش بوو بۆ لەناوچوونی "[2].

(١ )كشك، محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ١٩٠ _ ١٩١.

(٢) ابن عثيمين، تأريخ المملكة العربية السعودية ١٧٧.

## ٣_ دوودڵ بوون لەنێوان دژایەتی و لایەنگیری دەوڵەتی عوسمانی

ئیبراهیمی کوڕی عەلی پاشا دەستی گرت و زاڵبوو بەسەر دەوڵەتی سعودی وەهابی یەکەم، پایتەختەکەی کە درعیەبوو لەناوی برد و تەختی کرد، زۆرێك لە سەرکردە سیاسی و دینیەکانی کوشتن و لەناوی بردن کە پێکهاتبوون لە خانەوادەی سعود و خانەوادەی شەیخ، بەم کارە دەرگای کردەوە بەڕووی سەردەمێکی نوێ لە دەسەڵاتی سیاسی و زاڵبوونی سەربازی ڕاستەوخۆ بەسەر نەجددا، بەڵام نەیتوانی تەواو بزوتنەوەی وەهابی ڕیشە کێش بکات کە خۆی دەبینیەوە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دەسەڵاتی میسری عوسمانی، ئەو پاشماوەی بزوتنەوەی وەهابی کە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر هەوڵی داوە چەند سەرکەوتنێك تۆمار بکات و حکومەتی نوێ پێك بهێنێت، بەڵام بزوتنەوەی ناوبراو نەیتوانی ئەو سەربەرزی و شکۆیە بەدەست بێنێت لە دەوڵەتی دووەمی دا کە لە دەوڵەتی یەکەمیدا هەیبوو، چونکە ئەمیرەکانی دەوڵەتی دووەمی وەهابی بە جیاوازی ئاستەکانی هەر پاشکۆ بوونە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و دڵسۆزی و پشتیوانیان بۆ دەربڕیوە. لەبەر ئەوەی عەقیدەی بزوتنەوەی وەهابی دەوڵەتی عوسمانی و بەژداربوون لەو دەوڵەتەدا بە بێ باوەڕو موشریك دادەنا، هەر ئەوەش بوو کە ئەمیر سعودی گەورە بەڕاشکاوانە دەریبڕی دوای داگیر کردنی حیجاز، جا (خۆشویستن و ملکەچی و پاشکۆیەتی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بە هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان و یەکتاناسی و بنەماکانی بزوتنەوەی وەهابی دادەنرێت)، چونکە بزوتنەوەی ناوبراو تەکفیری ئەومیان دەکرد کە بێ

لایەن بوو چ جای ئەو دەوڵەتەی جەنگی لەگەڵ دەکات و پایتەختەکەی لەناودەبات و سەرکردەو پیاوەکانی دەکوژێت و بەندیان دەکات؟ ئالێرەوە لەهەمبەر هەڵوێست لەبەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی بزوتنەوەی وەهابی بوون بە دووبەش کە یەکەمیان دژی بوون و ئەوانی تریش پاشکۆ و پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی بوون، بزوتنەوەکە تووشی قەیرانێکی ترسناك بوو کە ڕەنگی دایەوە لە پەیوەندییە ناوەخۆییەکان، چونکە دژ و نارازییەکان تەکفیری ئەوانەیان دەکرد کە پاشکۆن و یارمەتی یەکتری دەدەن لەگەڵ هێزەکانی میسری و دەوڵەتی عوسمانی "بێ باوەڕ". شێخ سولەیمانی کوڕی عەبدوڵڵای ئالوشەیخ و شێخ حەمەدی کوڕی عەتیق فەتوای دەرکرد بە بێ باوەڕ بوون و هەڵگەڕانەوەی ئەوەی یارمەتی هێزەکانی "هاوبەشدانەران" دەدات کە هێرشیان کردبووە سەر ناوچەکانی نەجد[1]، شێخ سولەیمان وتی: " ئەگەر

---

(١) شێخ حەمەدی کوڕی عەتیق وتی:خەڵکی بۆ چەند بەشێك دابەش بوون یەکێکیان: هەوڵی سەرخستنی دینی ئیسلام دەدات و کۆشش دەکات لەو پێناوەدا بەهەموو تواناکانی ئەوانە کەمینەن لەڕووی ژمارەوە و پاداشتیان زۆر گەورەیە لەلایەن خوای گەورە. بەشی دووەم: ڕیسواکەری موسڵمانانە و یارمەتیشیان نادات. بەشی سێیەم: دەرچووە لە شەریعەتی ئیسلام بەهۆی ئەوەی بە یارمەتی دانی حیزبی هاوبەشدانەران و ئامۆژگاری کردنیان. (مجموعة التوحید ٢٥٦ ، ٢٥٧).

بەهەمان شێوە ناوبراو دەڵێت: ڕووی دووەم: لە ڕووکەشدا لەگەڵیاندا و لە ناخیدا دژیان بێت و لەژێر دەسەڵاتی ئەوانیشدا نەبێت، ئەوەی وای لێکردووە لە ڕووخساردا لەگەڵیاندا بێت یا بۆ دەست خستنی سەرۆکایەتیە یاخود سەروەت و سامان یان وەك چاوچنۆکیە لە نیشتمان و خاوخێزان لەترسی ئەوەی لە داهاتوودا ڕوودەدات، ئەو کەسە لەو حاڵەتەدا هەڵگەڕاوەیە و لەناخیشی دا ڕقی لێیان دەبێتەوە ئەوا دادی نادات و لەوانەیە کە لەبارەیانەوە وتراوە: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ النحل: ١٠٧. واتە: (ئەو خەشم

مرۆڤ ڕازیبوونی دەربڕی لەسەر دینی هاوبەشدانەران لەبەر ترسان لێیان و بەتەنگەوەهاتنیان و تەڵەکەبازی لەگەڵیان بەمەبەستی دوور خستنەوەو وەلانانی خراپەیان ئەوا ئەو کەسە وەك هاوبەشدانەران بێ باوەڕە، ئەگەرچی ڕقیشی لە دینی ئەوان بێت و "ئیسلام و موسڵمانان"یشی خۆش بووێن، ئەگەر بەس ئەوو کارەی باسمان کرد ئەنجامی بدات، ئەی ئەو کەسەی لە شاری ئەوان بوو و بەناوی ئەوانەوە بانگی دەکرا و ملکەچیان بوو بوو و بە ئاشکرا ڕازی بوو بوو بە دینی پوچی ئەوان و پارمەتی دەدان و سەری دەخستن بەسەروەت و سامان و پشتی ئەوانی دەگرت و پشتی "موسڵمانان"ی نەدەگرت و خۆشی نەدەویستن، تەنانەت بووە یەکێك لە سەربازەکانی گومبەتەکان (مەبەستی گومبەتی سەر گۆڕەکانە[1]) و هاوبەشدانان و هاوبەشدانەران دوای ئەوەی کە سەربازی دڵسۆزی (الاخلاص) و یەکتاناسی و یەکتاناسان بوو؟ هیچ "موسڵمانێك" گومانی نییە لەوەی ئەو کەسە بێ باوەڕە و لە سەرسەختترین دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ~ و تەنها کەسی زۆر لێکرا (المكره) حوكمی کوفری بەسەردا نادرێت کە بریتیە لەو کەسەی "هاوبەشدانەران" دەیگرن وبەندی دەکەن و پێی دەڵێن: کوفر بکە یان ئەو شتە بکە گەرنا بەزۆر کارەکەت پێدەکەین و دەتکوژین یاخود سزای دەدەن تا ببێتە هاوڕایان ئەوکاتە بۆ کەسەکە دروستە بە زمان لەگەڵیان دابێت و کەچی دڵی پڕ لەئیمان بێت و بەدڵ دژیان بێت. زانایان یەکدەنگن کە هەر کەسێ وشەیەکی کوفری دەربڕێت

---

و ڤینەش لەبەر ئەوەیە، چونکە بەڕاستی ئەوانە ژیانی دنیایان خۆش وویستووە تا ژیانی دواڕۆژ، بێگومان خوا هیدایەتی قەوم و کەسانی بێ باوەڕ و خوانەناس نادات). (مجموعة التوحيد ٢٩٦).

(١) وەرگێڕ.

به گاڵتەو گەپیش بێت ئەوا پێ بێ باوەڕو کافر دەبێت، ئەی ئەو کەسە دەبێت حوکمی چی بێت کە بێ باوەڕی دەردەخات لە ترسان و لەبەر خۆشویستنی دونیا "[1] و شێخ سولەیمان داوای کردن بە پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ "هاوبەشدانەران" چ کۆمەڵایەتی چ سیاسی چ ئابووری بێت.

ناوبراو وتویەتی: " خوای گەورە زۆر جەختی کردۆتەوە لەسەر قەدەغەیی خۆشویستن و دۆستایەتی کردنی بێ باوەڕان، پێغەمبەریش ~ هەواڵی داوە کە هەر کەسێ گەلێکی خۆش بوویت ئەوا حەشرو لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەوانە. لەوەی باسمان کرد ئەوە بەدەر دەکەوێت کە چەند شتێ هەن هەر کەسێ ئەنجامیان بدات سزای ئاگر دەچێژێت، یەکەمیان: خۆشویستنیان بەگشتی (لە تێکڕای ئەو خاڵانەدا مەبەستی بێ باوەڕانە[2])، دووەم: خۆشویستن و سۆزی تایبەت، سێیەم: کەمێك دڵ بۆ لا چوون، چوارەم: ڕووخۆشی و ڕوپامایی لەگەڵ کردنیان، پێنجەم: گوێڕایەڵی کردنیان لەو کارەی کە بێ باوەڕان سەرپەرشتی دەکەن و ڕاسپاردە دەردەکەن، شەشەم: لە نزیك دانیشتنیان و چوونە لایان وەك چوون بۆ لای حوکمڕانانی ئیسلام[3]. حەوتەم: ڕاوێژ پێ کردنیان لە کاروبارەکان دا، هەشتەم: ئەرك و کار پێ سپاردنی

(١) سلیمان بن عبدالله بن الشیخ، پەیامی حەوتەم لەسەر حوکمی خۆشویستن و پشتیوانی کردنی هاوبەشدانەران، مجموعة التوحید النجدیة ٢٤٧.

(٢) وەرگێڕ.

(٣) پێم سەیرە! لێرەدا باسەکە لەسەر هەڵسوکەت کردنە لەگەڵ بێ باوەڕان، کەچی لە خاڵی شەشەم دا لە دەقی عەرەبیەکەدا بەو شێوەیە هاتووە:(والدخول علی أمراء الاسلام) بەڕاستی من نەم توانی هیچ مانایەکی لێ وەربگرم تەنها ئەوە نەبێت کە کردمە وێچواندن (تشبە) و بەوشێوەیە بەکوردیم کرد: چوونە لایان وەك چوون بۆ لای حوکمڕانانی ئیسلام. (وەرگێڕ).

موسڵمانان هەر کارێك بێت ئەمیرایەتی یان کرێکاری یاخود پیشەی نوسەر یان جگەلەوانە، نۆیەم: هەڵبژاردنی دەستو پێوەندی نا ئیماندار، دەیەم: دانیشتن لەگەڵیان و سەردان کردنیان، یازدەم: ڕووخۆشی و ئاسوودەیی پیشاندانیان. دوازدەم: ڕێزگرتنیان بەگشتی، سێزدەم: بە ئەمیندار دانانیان کە خوای گەورە بە ناپاك و نا ئەمینی داناوون، چواردەم: یارمەتی دانیان لە کارەکانیاندا ئەگەر کەمیش بێت وەك مەرەکەبی پێنوس و نزیك خستنەوەی ئامرازەکانی نوسین بۆ ئەوەی ستەمکارییەکانیان بنوسن، پازدەم: ئامۆژگاری کرنیان، شازدەم: شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان، حەفدەم: هاوڕێیەتی و هاودەمی کردنیان، هەژدەم: ڕازی بوون لە کارەکانیان و خۆ چوواندن بەوان و لەبەر کردنی پۆشتەی ئەوان، نۆزدەم: باس کردنی گەورەیی ئەوان پیشان دەدات وەك ناونانیان بە (سادات) و (حکماء) هەروەك بە تاغوت دەووترێت "سەید فڵان"، بیستەم: مانەوە لەگەڵیان لە وڵاتیان دا هەروەك پێغەمبەر ~ فەرموویەتی:" هەر کەسێ لەگەڵ هاوبەشدانەران کۆ بووەوەو لەگەڵیان دانیشت و مایەوە ئەوا لەوانە " ئەبوداوود گێڕاویەتیەوە[1].

شێخ (سولەیمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شێخ) هەر کەسێ داوا لە "موسڵمانان" _ وەهابیەکان _ بکات بە وازهێنان لە _میسرِی و تورکەکان _ ئەوا شێخ سولەیمان ئەو کەسەی بە گەورەترین پشتگیرو خۆشەویستانی بێ باوەڕ و هەڵگەڕاوەو دووڕوەکان داناوە " و دەڵێت: پێویستە هەڵوێست لە

(١) بگەڕێوە بۆ: سليمان بن عبدالله بن الشيخ، پەیامی شەشەم، مجموعة التوحيد النجدية ٢٤٠ _ ٢٤١. بگەڕێوە بۆ پەیامی هەشتەم، شێخ سولەیمان، حوکمی سەفەر کردن و مانەوە لە وڵاتی هاوبەشدانەران بۆ بازرگانی و دیارخستنی نیشانەکانی دووڕووی و خۆشویستنی بێ باوەڕان ٢٦٦.

بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان توندتر بێت لەوەی بێ باوەڕە ڕەسەنەکان، چونکە کەسی هەڵگەڕاوە دوای ئەوەی ڕێنمایی کراوە ئەوا دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ~ پاش ئەوەی ڕاستی و حەقی ناسی کەچی دواتر نکۆڵی لێکرد و دژایەتی کرد و پەنا بەخوا.... ئەی چی دەڵێی بۆ ئەوەی دەچێتە لای بێ باوەڕان بە سوزو خۆشەویستی نواند و پێ ڕاگەیاندنیان بەوەی کە ئەو خۆشیان دەوێت تا بێ باوەڕان پەیوەندی لەگەڵ ببەستن و ڕێزی بگرن؟[1].

وەك کاردانەوەیەك لەهەمبەر ئەو پەیوەندیە نەرمە و یارمەتی دان و پاشکۆیەتی هەندێ لە وەهابیەکان هەیانبوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، ئەوا شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی حەسەنی کوڕی شێخ هەڵوێستی خۆی ڕاگەیان لە بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی و تۆمەتباری کرد بە هاوبەشدانان و سیفەتی ئیسلامەتی و موسڵمانێتی کورت کردەوە لە شوێنکەوتووانی بانگەوازی وەهابیەتدا و ڕوونکردنەوەیەکی دەرکرد بۆ هەموو شارەکانی نەجد، لەو ڕوونکردنەوەیدا هاتووە: " ئەوەی ئەو نوسراوە پێویستی کردووە، بریتیە لە بیرهێنانەوەی ئەو نیعمەت و بەخششانەیە کە خوای گەورە پێتانی بەخشیوە لە نیعمەتی ناسینی ئیسلام و ڕێنمایی کردنتان بۆی و ناونانتان پێی و تەنها ئێوە موسڵمانانن!! ئەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە لەو دینەدا پێی بەخشیوون ئەوا لە ژمار نایەن... یەکەمیان: بانگەواز کردن بۆ دینی ئیسلام تەنها یەك کەس هەڵسا بە ئەنجامدانی ئەویش (موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب)ە... نازانرێت کە یەکێکی تر جگەلە ناوبراو بانگەوازی کرد بێت بۆ یەکتاناسی و فڕێدانی هاوبەشدانان، بەڵکو گومانیان وابوو کە هاوبەشدانان

---

(١) سليمان بن عبدالله بن الشيخ، پەیامی شەشەم، مجموعة التوحيد النجدية ٢٤٢.

دروسته یان شتێکی چاکە، جا تێکڕای خەڵکی لە سەرجەم لادێ و شارەکان تووش بوون بە پەرستنی تاغوت و گۆڕ و جنۆکە و درەخت و بەرد.... دەك خوا ڕەحم بەو شێخە بکات (مەبەستی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب[1]) کە خوای گەورە لە شوێنی پێغەمبەرەکانی دانا لە بانگەوازی کردن بۆ بانگەوازی دینەکەی.

ئا ئەوە ئامۆژگاری و ڕاسپاردەی منە بۆ ئێوە بەگشتی و زاناکان و ئەمیرەکان بەتایبەتی، پێویستە لەسەرتان کە لەو دینەدا لە پێشەوە بن (مەبەستی: وەهابیەتە) بە خۆشی و ناخۆشی، ببنە پشتیوان و پشتگیر بۆ ئەو کەسەی لەناو بنەماڵەی (ئالی سعود) فەرمان دەکات بەچاکە و ڕێگری دەکات لە خراپە "[2].

کاتێك موحەممەد پاشا هەڵسا بە بەند کردنی ئەمیر فەیصەڵی کوڕی تورکی لە ساڵی ١٢٥٣ك و دانانی ئەمیر خالدی کوڕی سعود بەوالی نەجد لەشوێنی فەیصەڵ، ئەوا شێخ عەبدوڕەحمان ڕایگەیاند: پشتگرتن و خۆشویستنی "هاوبەشدانەر" و دڵ بۆ لاچوونی و سەرخستنی و یارمەتی دانی بەدەست و زمان و سەروەت و سامان ئەوا لە هەڵوەشێنەرەوەکانی یەکتاناسییە[3] و شێخ عەبدوڕەحمان دەستی کرد بە هاندانی خەڵکی لە ڕاپەڕین و ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی میسری "هاوبەشدانەر" و جیهاد کردن لە دژیان ئەگەر

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) ابن بشر، عنوان المجد ٢/٤٩.

(٣) مجموعة الرسائل و المسائل ٤/٢٩١.

ئیمام نەشبێت[1].

کاتێك فەیصڵی کوڕی تورکی دەسەڵاتی گرتەوە دەست پاش لاچوونی خالید، ئەوا شێخ عەبدوڕەحمان داوای لێ کرد: " جیهاد بکات لەگەڵ لادێ نشین و شار نشینەکان ئەوانەی یەکتاناسی دەناسن و پابەند نابن پێی، بەتایبەتی (خانەوادەی زوفەیر) کە هاوبەشدانەرن ئەوانەی پێویستە جیهادیان لەگەڵ بکرێت و بانگ بکرێن بۆ لای خوای گەورە "[2].

وەك هەوڵێك بۆ ڕاسپاردەکانی شێخ عەبدوڕەحمان و تەکانێك بۆ توونده وتۆڵ کردنی یەکێتی ناو ڕیزەکانی وەهابیەت و جۆرە پاراستنێکی عەقیدەیی لە دژی ئەوەی عوسمانیەکان درزی تێدا دروست بکەن، ئەوا ئەمیر فەیصەڵ هەڵسا بە ناردنی نوسراو بۆ شوێنەکانی دەورووبەر، "هانیان دەدات لەسەر دەست گرتن بە یەکتاناسیەوەو جێگیر بوون لەسەری" و پێی گوتن: "لەو

(١) ئەوانەی وازیان هێنابوو ودانیشتبوون لە ماڵەکانی خۆیاندا و ملکەچی واقیع بوون بەڵگەیان بەوە دەهێنایەوە کە ئیمامێك نییە بچنە پاڵی، ئەوا شێخ عەبدوڕەحمان بەسەر زەنشت کردنەوە وتی: "بە چ کتێبێك یان بەچ بەڵگەیەك دەسەلێنن کە جیهاد تەنها لە پاڵ ئیمام پێویستە؟ ئەمە درۆ هەڵبەستنە لە دیندا و لادانە لە ڕێگەی ئیمانداران، بەڵگەکانیش لەسەر پوچی ئەو وتەیەیان ناودارترە لەوەی باس بکرێن. لەو بەڵگانە گشتگیری فەرمانکردن و هاندان لەسەر جیهاد کردن... هەر کەسێ هەڵسا بە بەرپاکردنی جیهاد لەپێناو خوا ئەوا گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووە و ئەو فەرزەی لەسەری بووە جێبەجێ کردووە و کەسێ بەبێ جیهاد نابێ بە ئیمام بەڵام جیهاد بەبێ ئیمام دەبێت". وە ناوبراو بەڵگەی هێناوەتەوە بە چیرۆکی (ئەبی بەصیر) کاتێك چەند کەسێك بوون هێرشیان دەکردە سەر قورەیشی و کاروانە بازرگانیەکانیان و جەنگ کردنی سەر بەخۆیان: ئایا پێغەمبەری خوا پێی وتن کە ئێوە لە کوشتنی قورەیشیەکان هەڵەن چونکە ئێوە لەگەڵ ئیمام دا نین!. الدرر السنية ٩٧/٧.

(٢) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ١٩.

سەردەمانەدا زۆربەی خەڵکی کارێکیان ئەنجامدا کە پێشتر هاوبەشدانەران ئەنجامیان دەدا، کەچی خەڵکەکە قورئانیش دەخوێنن بەڵام کەرو کوێر بوون لە ئاست "یەکتاناسی" و بەڵگەکانی"[1] و ئەو گوتانەش زیاد دەکات: " بزانن کەسانێك کە زانا و دونیا بەکەم زان و پارێزگارو پەرستش کارن کەچی بە هەڵەدا چوون، تەنها توێکڵی زانستیان دەست خست و بێ بەش بوون لە کرۆك و ناوەڕۆکی زانست، شوێنی پێشینانێك کەوتن کە لە ئەنجامدا گومڕابوون و خەڵکێکی زۆریشیان گومڕاکرد و لایاندا لە ڕێگای ڕاست، ئای لەو کارەسات و زەرەرە گەورەیە، جا هیچ هەوڵ و هێزێك نییە مەگەر بە تواناو ویستی خوای گەورە نەبێت. وا نییە کە ئێوە بێ منەت و بێ باك بن لە فێربوون و زانینی (یەکتاناسی) و مافەکانی لەو شتانەی خوای گەورە پێویستی کردووەو کردوویەتی بە ئەرك لەسەرتان تەنانەت پێویستە ئەوە ببێتە گەورەترین ویست و ئامانجی زانستەکەتان "[2].

بەڵام شێخ عەبدوڕەحمان زۆر بایەخی دەدا کە لە ڕۆشەنبیری و سیاسیەوە دەست بگرێت و زاڵ بێت بەسەر مزگەوتەکان دا و هەوڵدان بۆ دانانی پێشەوای وەهابی لە مزگەوتەکاندا لە ترسی ئەوەی نەوەك دەستەو تەیارە میانڕەوەکان بێنە ناو جەماوەرەوە، بە شتێکی ناپەسەندی زانی کاتێ زانی کە شێخێکیان لە دانیشتووانی (الاحساء) کردووە بە ئیمام لە هەندێ مزگەوتدا، بەبێ ڕەزامەندی ئیمام (ئیبن سعود)[3]. بۆیە پەیامێکی نووسی بۆ نوێنەرەکەی لە

(١) ابن بشر: عنوان المجد ٢١٦/٢ و آل السعود، فيصل: رسائل ائمة الدعوة الوهابية ١٠١.

(٢) ابن بشر: عنوان المجد ٢١٨/٢.

(٣) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٣٦٩/١.

(الاحساء) شێخ عەبدوڵەتیفی کوڕی موبارەك، دەڵێت: " شێخەکەمان (مەبەستی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهابە[1]) _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ کاتێ ئەو بانگەوازە ئیسلامیەی ڕاگەیاند، چەندین زانای بینی لە (الاحساء) و شوێنانی تریش کە یەکتاناسی و هاوبەشدانان لێکدەر ناکەن، بەڵکو هاوبەش دانانیان کردووەتە پەرستش و دینداری پێوە دەکەن، جا ڕقیان لە بانگەوازەکەی بووەوە لەبەر شارەزا نەبوونیان لە یەکتاناسی و مانای (لا اله الا الله).. زانایان نە (یەکتاناسی) و نە (هاوبەشدانانیان) نەناسیوە، تەنانەت زانایەك نییە لە زاناکانی (الاحساء) کە نکوڵی و ڕێگری کردبێت لەو کارانەی هاوبەشدانانەران، بەڵکو ڕێگری و دژایەتی ئەوەیان کردووە کە پەرستش تەنها بۆ خوای گەورە بکرێت بە دڵساغی و دڵسۆزی. هەر کەسێ بانگەوازی کردبێ بۆ دڵسۆزی و دڵساغی ئەوا تەکفیریان کردووەو بە بیدعەتچیان داناوە، ناشزانین کە زانایەك لە زاناکانی (الاحساء) ئەو دینەی بڵاو کردبێتەوەو بانگەشەی بۆ کردبێت و ناسیبێتی و ناساندبێتی "[2].

ئەوە بەدیار دەکەوێت کە بزوتنەوەی ڕۆشنبیری میانڕەو چالاکی خۆی دەکرد لە (الاحساء) بەسەر کردایەتی شێخی حەنبەلی (موحەمەدی کوڕی فەیرۆز) کوڕەزای ئیبن فەیروز دوژمنی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، ئەو بزوتنەوە میانڕەوە لە (القصیم) و (عنیزە) بە سەرکردایەتی شێخ (داودی کوڕی جەرجیس) بڵاو بووەوە کە داوای دەکرد بە خاوکردنەوەی ئەو تەکفرە تووند ڕەوەی کە ئاراستەی موسڵمانان دەکرێ، توانی هەندێ جەمسەری

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٣٢٤/١.

وەهابیەکان بەدەست بخات، تا وای لێهات درزو کەلێنێکی گەورەی دروست کرد کە وای لە هەندێکیان کرد کەنارگیر بن و نەیەنە نوێژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵ لە (الاحساء) و تەکفیر کردنی " ئەو موسڵمانانەی لەو وڵاتانەدا نیشتەجێن "، دەڵێن: دانشتووانی (الاحساء) لەگەڵ ئیبن فەیرۆز دادەنیشن و لەگەڵ ئەو و هاوڕێنەکانی تێکەڵاون ئەوانەی کە بێ باوەڕی خۆیان دەرنەبڕیوە لە بەرامبەر تاغوت و تەکفیری باپیرەکەی نەکردووە ئەوەی کە بانگەوازی شێخ موحەمەدی ڕەتکردەوەمو قبوڵی نەکرد و دژایەتی کرد. وتویەتی: هەر کەسێ بە ڕاشکاوی بەبێ باوەڕی نەزانێ ئەویش باوەڕی نییە بەخوا، چونکە تەکفیری تاغوتی نەکردووە، هەر کەسێ لەگەڵی دابنیشێت ئەوا وەك ئەوە. لەسەر ئەم دوو پێشەکییە چەند حوکمێکیان بنیادنا... کە ئەو حوکمانە لەسەر هەڵگەڕانەوەی ڕاشکاو جێبەجێ دەبن تەنانەت سەلامیشیان وەڵام نەدەدایەوە "(١). ئەمەش وای کرد کە شێخ عەبدوڕەحمان هێرش بکاتە سەر (الاحساء) و زاناکانی و گومان دەربڕین لە عەقیدەکانیان، هەروەك لە پەیامێکی شێخ عەبدوڕەحماندا هاتووە کە بۆ هەندێ لە زانایانی (الاحساء)ی ناردووە: " دانیشتووانی پێشووی شارەکەتان ئەوانی تریش ئەوا ئەشعەرین، ئەشعەرییەکانیش لە سێ بنچینەی دیندا هەڵەیان کردووە: لەوانە: تەئویل کردنی سیفەتەکانی خوای گەورە... هەڵەیان کردووە لە یەکتاناسی دا، مانای (لا اله الا الله)یان نەزانیوە تەنها ئەو مانایە نەبێت:(ئەو زاتەی توانای بەدیهێنانی هەیە). ئەگەر زانایان لە پێش ئێستا و لە ئێستاشدا لە زۆربەی شارەکان تەنها ئەو مانایە لە (لا اله الا الله) دەزانن کە بریتیە لە خوا

---

(١) ابن بشر: عنوان المجد ٢/٢٦٩.

بەیەکزانین لە پەروەردگاریّتی دا، ئەوەش لە ئەنجامی هەڵخەڵەتانیانە بە وتەی هەندێ لە زانایان.... زانایانی (الاحساء) لەسەرەتای بانگەوازی شێخ موحەممەد تەنها لەبەر ئەوە دژایەتی بانگەوازی ناوبراویان کرد کە: وایان دەزانی کە پەرستنی (یوسف) و (عیدرویس) و هاووێنەکانیان بە یەکتاناسی پوچ نەبۆتەوە "[1].

ئەمیر فەیصەڵی کوڕی تورکی هەڵسا بە ناردنی شێخ (عەبوڵەتیفی کوڕی عەبدوڕەحمان) بۆ (الاحساء) بۆ دامەزراندن و جێگیر کردنی (عەقیدەی وەهابی) و ئەنجامدانی مێزگەرد لە گەڵ زاناکانی لەبارەی ئیمان و عەقیدە[2] و کار کردن بۆ دانانی کتێب لەبارەی بابەتەکە[3].

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٣٢٠/١.

(٢) پەراوێزی: عنوان المجد، دانراوی: توێژەر عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵەتیفی خانەوادەی شێخ ٢٧٨/٢.

(٣) شێخ عەبدوڵەتیف هەڵسا بە بەرپەرچدانەوەی شێخ داود جەرجیس بە دوو کتێب کە بریتین لە: (منهاج التقديس في الرد على داود بن جرجيس) و (تحفة الطالب و الجليس في الرد على داود بن جرجيس). شێخ عەبدوڵەتیف هەوڵی داوە کە تۆمەتی تەکفیری بەگشتی کە ئیبن جەرجیس ئاراستەی وەهابیەتی کردبوو لابدات، لەوبارەوە وتی: " ئەو وتەیەی کە گوایە ئێمە (ی وەهابی _ و _) بەگشتی تەکفیر دەکەین و کۆچ بۆ لای خۆمان بە پێویست دەزانین لەسەر یەکێ کە توانای ڕاگەیاندنی دینەکەی هەبێ بە ئاشکرا. ئێمە تەکفیری ئەو موسڵمانە دەکەین کە نەجەنگێت و تەکفیر نەکات، بەڕاستی ئەو قسەو قسەلۆکانە هەموویان درۆو دەلەسە و بوختانن کە تەنها بە مەبەستی ئەوە بڵاو دەکرێنەوە کە خەڵکی دوور خەنەوە لە دینی خواو پێغەمبەرەکەی، خوایە پاك و بێگەردی بۆ تۆ بەڕاستی ئەمە بوختان و تۆمەتێکی مەزنە ". عبدالعزيز عبداللطيف: دعاوى المناوئين لدعوة الشيخ ١٧٤.

تەنانەت شێخ عەبدوڵەتیف هەوڵی دا کە نەرمی لە ووتەکانی باپیرەکەی دا بخاتەڕوو، وەك وتویەتی: " شێخ موحەممەد _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ یەکێك لەو کەسانەی کە سور بوو

سەرباری ئەوەی شێخ عەبدوڵەتیف ڕووبەڕووی ئەو میانڕەوانە دەبووەوە کە تەکفیری گشتیان ڕەت دەکردەوە ئەوا لەلایەکی تر لە (الاحساء) بەسەرکردایەتی عەبدولعەزیز خەطیب گەشەی دەکرد و لە پاڵ لای ڕاستی سیستەمی وەهابی وەستا و تۆمەتباری سیستەمی وەهابی دەکرد بەوەی پاشکۆی دەوڵەتی عوسمانی "بێ باوەڕ"ە، تەنانەت دواتر تەکفیری سیستەمی ناوبراویان دەکرد. شێخ عەبدوڵەتیف هەوڵی دا کە بیانگێڕێتەوە لەوەی خۆیان هەڵقورتێنن لەو کارەدا و تۆمەتباری کردن بەوەی کەسانێکی نەزانن و شوێنی خەواریجەکان کەوتوون. شێخ عەبدوڵەتیف نامەی نارد بۆ یەکێکیان: " ئەوەمان پێگەیشتووە لەبارەی ئەوان: تەکفیری ئیمامەکانی موسڵمانان دەکەن بەهۆی پەیام گۆڕینەوە لەگەڵ پادشاکانی میسر، بەڵکو بەوەش نەوەستاون تەنانەت ئەو شێخانەی موسڵمانانشیان تەکفیر کردووە کە بەشدار بوونە لە نووسینی ئەو پەیامانەدا... بەهەمان شێوە ئەو هەواڵەشمان لەبارەی ئێوە بەهەمان شێوە پێگەیشتووە، کە خۆتان هەڵدەقورتێنن لەو مەسەلەو بابەتانە، وەك قسەکردن لەسەر دۆستایەتی (موالاة) و دوژمنایەتی کردن (معاداة) و ئاشتەوایی و ئاشتبونەوەو پەیام گۆڕینەوەو خەرج کردنی سەروەت و سامان و پێشکەش کردنی دیاری و هاوشێوەی ئەوانە.

---

لەسەر ئەوەی کە تەکفیر نەگشتێنرێت، تەنانەت شێخ موحەممەد بە بڕیاری یەکلاییکەرەوەی تەکفیری کەسی نەزانی نەکردووە کە لە غەیر خوای گەورە دەپاڕێتەوە وەك گۆڕنشین و هاوشێوەکانیان، چونکە نەوەك ئەو کەسە نەزانە بەڵگە و ئامۆژگاری پێ نەگەیشتبێت لەوەی کە بەو کارەی باوەڕی لەدەست دەدات.. تەنانەت شێخ موحەممەد تەنها ئەوانەی تەکفیر دەکرد کە خواو پێغەمبەر و تێکڕایی ئوممەت کۆك بوون لەسەر تەکفیر کردنی، وەك ئەو کەسەی هاوبەش و هاوەڵ بۆ خوای جیهانیان بڕیارداوە. عبدالعزیز عبداللطیف: دعاوی الناوئین لدعوة الشیخ ١٧٤.

قسەکردن لەسەر ئەو جۆرە بابەتانە پێویستی بە زانینی ئەو شتانە هەیە کە باسمان لێوەکردووە و پێویستی بە زانینی بنەما گشتیە سەرەکیەکانە، دروست نییە بۆ کەسێ بدوێت لەسەر ئەو بابەتە و بابەتەکانی تریش کە نەزان بێ و وردەکاریەکانی ئەو شتانە نەزانێ، چونکە شتی نادیارو کەم ڕوون و کورتبڕ و کەم زانستی و دەرکردنی حوکمی ڕەها و شارەزانەبوون بە شوێنگەی وتار و فەرمایشتەکان و وردەکارییەکانیان ئەوا دەبێتە هۆی سەر لێ تێکچوون و ون کردنی ڕاستی و حەق و تێنەگەیشتن لە حەقیقەتی خوایەتی کە دواتر دەبێتە هۆی خراپ و کاولبوونی دین و پرۆسەی تێگەیشتن و پەیی پێ بردن پەرش و بڵاو دەکاتەوەو دەبێتە هۆی تێنەگەیشتن لە سوننەت و قورئانی پیرۆز.

ئێوە کە تەکفیر دەکەن بەهۆی شتانێك کە وادەزانن لەو شتانەن کە موسڵمان پێی تەکفیر دەکرێ ئەوا ئەوە مەزهەبی (حەڕوریەکانە)[1] کە دەرچوون دژبە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمیری بڕواداران و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵیدا بوون.

زۆر خراپت پێکاوە لەو وتەیەت دا: کە وتوتە شێخی باوکمان نکۆڵی نەکردووە لەو تەکفیرەی کە ئێمەی ڕاستڕەو عقیدە پاك دەیکەن، چونکە مەبەستی لەو تەکفیرە نییە کە ئێمە پێی هەڵدەستین. بیرەخۆت بێنەرەوە کە

(١) ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێ: حەڕوریە (الحرورية) بریتین لە: خەواریجەکان، لەبەر ئەوە بە (الحرورية) ناونراون، چونکە لە (حروراء) نیشتەجێ ببوون و لەوێ پەیمانیان دا کە بجەنگن لەگەڵ دادپەروەران دا، (حروراء) گوندێکە لە عێراق لە نزیك کوفە. سەیری:(المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، ئیمامی نەوەوی، بەشی حەوتەم ١٦) بکە. (وەرگێڕ).

براكانت له دانيشتووانى (النقيع) مشتومڕ و ململانێت لەگەڵ دەكەن لەسەر كاروبارى ئێمە، تۆمەتباريشمان دەكەن بەوەى بێ دەنگين لەئاست هەندێ كار. تۆش دەزانيت كە ئەوان ئەو وتانە دەڵێن زۆربەى كات لەسەر شێوازى گاڵتە و توانج ئامێز لە عەقيدەو ڕێڕەوەكەمان، ئەگەر ڕاشكاوانە تەكفيرى ئێمەشيان نەكردبێت ئەوا بەڕاستى كۆبوونەتەوە لە دەورى پەرژينى تەكفير"[1].

شێخ عەبدوڵەتيف هەوڵى داوە تەفسيرى دۆستايەتى (الولاء) و دوژمنايەتى (البراء) بكات بەشێوەيەك كە ئالى سعود بەهۆى يارمەتى وەرگرتنيان لە دەوڵەتى عوسمانى نەچنە دەرەوەى بازنەى ئيسلامەتى، ئەو قسانەى ناراستەى وەهابى توندڕەوەكانى ئەوانەى تەكفيرى وەهابيەكانى تر دەكەن: " پێم گەيشتووە كە ئێوە تەئويلى ئەو فەرمايشتەى خواى گەورەتان كردووە كە لە سورەتى موحەممەد دا هاتووە:﴿ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ﴾ محمد: ٢٦. واتە: (ئەو زاڵ بوونى شەيتانە بەهۆى ئەوەوە بوو كە بەڕاستى دووڕووەكان ديانووت بەوانەى كە داخ لە دڵ بوون بەرامبەر ئەوەى خوا دايبەزاندووە كە قورئانە: ئێمە لە هەندێك هەڵوێستدا بەقسەتان دەكەين). تەئويلتان كردووە بەوەى بەسەر هەندێ لە ئەميرەكانى ئێستا جێ بەجێ دەبێت بەهۆى پەيام گۆڕينەوە يان ئاشتبوونەوە يان ئەنجامدانى ئاگربەست لەگەڵ هەندێ لە دەسەڵاتدارە گومڕاكان و پادشا هاوبەشدانەرەكان، كەچى سەيرى سەرەتاى ئايەتەكەتان نەكردووە كە بريتيە لە:﴿ إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ﴾ محمد: ٢٥. واتە: (بەڕاستى ئەوانەى پاشگەز بوونەوەو بەرەودوا گەڕانەوە، دواى ئەوەى ڕێگەى هيدايەت و ئيمانيان

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٤٦٥/١.

بۆ دەرکەوتبوو). تێش نەگەیشتوون لە مەبەستی ئەو گوێڕایەڵی و ئەو فەرمانەی کە ناسراوەو باس کراوە لە ئایەتە پیرۆزەکە و ئەوەی لە بەسەرهاتی (حودەیبیە) داهاتووە و ئەو داواکاری و مەرجانەی کە دایان نابوو "[1].

شێخ عەبدوڵەتیف لە پەیامێکی تردا حاڵەتی دەستەوەسانی و بێ دەسەڵاتی پاساودار کرد لەوەی کە دوژمنایەتی خۆی ئاشکرا بکات بۆ "هاوبەشدانەران"، تەنانەت ڕەوایی دان بە بەکارهێنانی خۆپارێزی توقیە لەگەڵ "بێ باوەڕان". ناوبراو هەوڵی داوە پاساو بۆ ئەو کارانە بدۆزێتەوە، بۆیە لە وەڵامی ئەوەدا وتی کە پرسیاری لێکرد لەبارەی حوکمی ئەو کەسەی لە ژێر دەسەڵاتی "هاوبەشدانەران" و یەکتاناسی ناسی و کاری پێکرد بەڵام دوژمنایەتی هاوبەشدانەرانی نەکرد و لە وڵاتیاندا نەهاتە دەرەوە: " ئەو پرسیارە سەرچاوەی لە تێنەگەیشتن لە شتەکە و مانای یەکتاسی و کارپێکردنی، چونکە بەمێشکدا ناهێت کە کەسێ یەکتاناسی بناسێ و کاری پێبکات و دوژمنایەتی هاوبەش دانەران نەکا. تەنانەت هەر کەسێ دوژمنایەتی هاوبەش دانەران نەکات ئەوا پێی ناوترێت: (یەکتاناسی ناسیوەو کاری پێکردووە). پرسیارێکە تێکگیراوەو بێ سەروبەرە... من واگومان دەبەم کە مەبەستت بریتیە لە: کەسێ دوژمنایەتی دەرنەخات و لێیان جیانەبێتەوە. مەسەلەی دەرخستنی دوژمنایەتی کردنیان جیایە لە مەسەلەی بوونی دوژمنایەتی، جا مەسەلەی یەکەم دەکرێ هەموو کەسێ نەتوانێ بیکا بەهۆی دەستەوسانی و ترسەوە "[2].

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٤٨٧/١.

(٢) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ٢٩.

شێخ عەبدولڵەتیف جیاوازی کردووە لە نێوان کوفری کرداری و کوفری بیروڕا (ئیعتقادی)، لەوبارەوە وتویەتی: حوکم و داوەری کردن بە جگەلەوەی خوای گەورە ناردوویەتی و ئەنجام نەدانی نوێژ کوفری کردارییە نەك کوفری بیروڕا (ئیعتقادی)، خوای گەورە باسی لەو کەسە کردووە کە کار بەهەندێ لە قورئان دەکات و هەندێکی تر فەرامۆش دەکات بەوەی کە بڕوادارە بەوەی کە کاری پێ کردووە و بێ باوەڕە بەوەی کاری پێ نەکردووە ﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴾ البقرة: ٨٥. واتە: (کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بەبەشێکی (تەورات) هەبێت و بەبەشێکی تر باوەڕتان نەبێت؟). بەرامبەر باوەڕی کرداری کوفری کرداری هەیە، بەرامبەر ئیمانی بیروڕا کوفری بیروڕا هەیە، بەهەمان شێوە دوو جۆری هاوبەش دانان هەن: هاوبەش دانانێك بکەرەکەی دەردەخات لە بازنەی ئوممەت کە بریتیە لە هاوبەش دانانی گەورە، هاوبەش دانانێکیش بکەرەکەی ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئوممەت ئەوەش بریتیە لە هاوبەش دانانی بچوك... پێویست نییە کە هەر کەسێ شتێکی کوفری کرد یان بەشێك لە کوفری تێدا هاتەجێ ئەوا ناوببرێت بە کافر. سەرباری ئەوەی کارەکەشی کوفر بێت، ئەوا پێویست نییە کە بە ڕەهایی ناوی کوفری بەسەردا ببرێت"[1].

ئا بەوشێوەیە دەوڵەتی وەهابی دووەم دوودڵ بوو لەوەی کە ئایا دژی دەوڵەتی عوسمانی بێت و بەرامبەر ڕاست ببێتەوەو تەکفیری ئەوە بکات کە یارمەتی دەدات یان ملکەچی دەوڵەتی بێ باوەڕ دەبێت لەگەڵ دۆستایەتی کردنی دەوڵەتی عوسمانی و حوکم کردن بەناوی ئەوەوە و پاسەوادار کردنی ئەو

---

(١) الدرر السنية و الأجوبة النجدية ٤٨٢/١ و ٤٨٤.

کاره بەناوی خۆپارێزی توقیە و بێ دەسەڵاتی و دەستەوەسانی لەوەی دوژمنایەتی دەربخەن بۆ هاوبەش دانەران، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە بزوتنەوەی وەهابی متمانە و ڕاستی و متمانەی خۆی لە دەست بدات و یەکێتیەکەی پارچە پارچە ببێت و جەماوەر دوور بخاتەوە کە سەرەنجام بووە هۆی ڕووخان و لەناو چوونی.

## ٤_ ململانێ لەسەر دەسەلات دوور لە ویستی گەل

بەهۆی ئامادەنەبوونی ڕاوێژ و سیستەمێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ دەستاودەست کردنی دەسەلات بە پشت بەستن بە ویستی ئوممەت، ئەوا لە دەرەنجام دا ملکەچی سیستەمی دەشتەکی پشتاو پشت و میراتی بوون کە ئەو کات باوبوو، بەلام ئەمە چارەنووسی دەولەتی وەهابی سعودی خستە کونەبادا و وای کرد کە بەش بەش ببێت و ململانێی ناوەخۆیی ڕوویدات.

شتێکی ناسراوە کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بەیعەتی وەرگرت بۆ سپاردنی جێنشینایەتی (ولاية العهد) بۆ ئەمیر عەبدولعەزیز کاتێك کە باوکی موحەممەدی کوڕی سعود هەر لە ژیاندا بوو، دواتر بەیعەتی وەرگرت بۆ سپاردنی جێنشینایەتی (ولاية العهد) بۆ کوڕەکەی سعود کاتێ کە باوکی عەبدواعەزیز هەر لە ژیاندابوو. کاتێ سعود کۆچی دوایی کرد ئەوا کوڕەکەی عەبدوللا بەمیرات گری شوێنی ئەوی گرتەوە، بەلام عەبدوللا سەلامەت نەبوو لە ململانێی براو مامەکەی کە ناوی عەبدولا بوو.

دوای ئەوەی دەولەتی سعودییەی یەکەم ڕووخا... ئیبراهیم پاشا زۆربەی پیاوەکانی خانەوادەی سعودی بە بەندکراوی برد بەرەوە میسر... ئەوا پیاوێ (کە ناوی موحەممەدی کوڕی مشاری کوڕی مەعمەرە) لە خانەوادەی مەعمەر دەرکەوت (لە حاکمە پێشووەکانی عەیینە بوو) هەلسا بە ڕێك و پێك کردنی و ڕێکاری کردن بۆ پرۆسەی بەرگری و ڕووبەڕو بوونەوەی دژ بە هێزەکانی

میسڕی و خۆی وەك ئیمامی بزوتنەوەی وەهابی ناساند[1]. بەڵام ئەمیر مشاری کوڕی سعودی کوڕی عەبدولعەزیز، توانی هەڵبێت لە میسڕ و هاتە نەجد و داوای لە ئیبن مەعمەڕ کرد کە سەرکردایەتی بداتە ئەو و ئیبن مەعمەڕ سەرەتا پێیدا و دواتر کوشتی[2].

کاتێکی زۆر تێپەڕی نەکرد ئەوا تورکی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود لەساڵی ١٢٣٦ بەدەرکەوت بۆ ئەوەی حوکمی ئالی سعود بگێڕێتەوەو دەوڵەتی دووەمی سعودی دابمەزرێنێت، بۆیە لەپێناوی ئەوەدا ئەمیری شاری (ضرما)ی کوشت کە ناوی (ناصر سەیاری) بوو و دەستی گرت بەسەر شارەکەدا، دواتر بەیعەتی بەزەبری هێز لە دانیشتوانەکەی وەرگرت. تورکی شاری (ڕیاز)ی داگیر کرد و موحەمەدی کوڕی مەعمەڕی کوشت[3] و توانی لە ماوەی هاتنی سەرەتای ساڵی ١٢٤١ دەسەڵاتی زاڵ بکات بەسەر نەجد. تورکی کوڕی عەبوڵڵا لە چەسپادنی شەرعیەتی خۆی پشتی بەست بە فیکر (قەدەری)، لە ڕوونکردنەوەی ئەمەدا بۆ تێکڕایی موسڵمانانی وت: (خوای گەورە کاری ئەوانی پێ سپاردووە)[4].

سەرباری ئەوەی ئیمام (تورکی کوڕی عەبدوڵا) هەموو مەرجە شەرعیەکانی تێدابوون بە پێی فیکری سیاسی وەهابی و پشتیوانی پیاوانی دینی لە ئالی شەیخ بۆ ئەو، ئەوا هەموو ئەوانەی باسکران نەبوونە ڕێگر لە

---

(١) ابن بشر: عنوان المجد ٤٤٢/١.

(٢) ابن بشر: عنوان المجد ٤٤٢/١.

(٣) ابن بشر: عنوان المجد ٢٨/٢.

(٤) ابن بشر: عنوان المجد ١١٣/٢.

پەنهان کوشتنی له ساڵی ١٢٤٩ لەسەر دەستی کوڕه خوشکەکەی (مشاری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی مشاری کوڕی سعود) که بۆسەی بۆ دانابوو له لای دەرگای مزگەوت و بەناپاکانه کوشتی دوای هاتنه دەرەوەی له نوێژی هەینی، مشاری دوای کوشتنی تورکی دەستی گرت بەسەر حوکمڕانی دا به زۆرەملێ.

لەگەڵ ئەوەی کوشتنی ئیمامی تورکی بووە هۆی توڕەبوونی توندی ئالی شەیخ، چونکه ئالی شەیخ پیان وابوو که مزگەوت پەناگەیه و ناکرێ خوێنی تێدا بڕێژرێت[1]، بەڵام دواتر لەگەڵ ئەوەشدا ئالی شەیخ ملکەچی ئەمری واقیع بوون و بەیعەتیاندا به ئەمیری نوێ مشاری[2]، دەسەڵات لەسەرتا و کۆتادا بۆ ئەوەیه که زاڵ دەبێت و ئوممەت هیچ ڕۆڵێکی نییه له هەڵبژاردنی ئیمام و تەنانەت زانایانی دینیش هیچ ڕاو بۆچوونێکیان نیه لەم بارەوە.

ئەگەر فەیصەڵی کوڕی تورکی یاخی نەبووایه و دژ به هەڵگەڕانەوەکه نەبووایه ئەوا ئەمیر مشاری هەر لەسەر دەسەڵات دەمایەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە دەیەویست، لەوانەیه منداڵ و نەوەکانی به میرات دەسەڵاتەکەیان وەرگرتبایه. بەڵام فەیصەڵی کوڕی تورکی دوای چەند مانگێك توانی تۆڵەی باوکی بکاتەوە و مشاری بکوژێت و دەسەڵات بگەڕێنێتەوە. وە لەو کاتەدا تەنها

---

(١) کاتێ خانەوادەی شێخ زانیان که پەنهان کوژی هەیه، ئەوا له مزگەوتدا دانیشتن و لێی دەرنەچوون، تەنانەت مشاری نوێنەری خۆی نارده لایان و بانگی کردن، بەڵام نەچوون بەپیر بانگهێشتەکەیەوە تەنها به پێدانی بەڵێنی پاراستنی گیانیان نەبێت، بۆیه مشاری بەڵێنی پارێزراوی ئەمانەتی پێدان، ئەوکات ئالی شەیخ چوونه لای و مشاری داوای بەیعەتی لێ کردن و ئەوانیش بەیعەتیان دا. هەروەك ابن بشر: عنوان المجد ٢/١٠٠.

(٢) ابن بشر: عنوان المجد ٢/١٠٠.

ئەوە لەسەر ئالی شەیخ بوو کە دڵسۆزی و دۆستایەتیان گواستەوە دووبارە بۆ ئیمامی سەرکەوتووی نوێ (فەیسەڵ).

دوای سێ ساڵ والی میسڕ (موحەمەد عەلی پاشا) بڕیاری دا بە گەڕاندنەوەی حوکمی میسڕ بۆ (نەجد)، بە هۆی ئەمیرێکی کە کێ بڕکێ بکات و هەر لە ئالی سعودیش بێت، ئەویش:(خالیدی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود)ە کە ناوبراو بێزار ببوو لە داگیر کردنی دەسەڵات لەلایەن کوڕە مامەکانی، تەنانەت خالید هەندێ پشتگیری هەر هەبوون ئەوانەی کە ڕازی نەبوون ئیمامەت بگوازرێتەوە لە منداڵەکانی سعودی گەورەوە بۆ منداڵەکانی عەبدوڵای کوڕی موحەمەد[1]. جا موحەمەد عەلی پاشا پشتی بەست بە خالید و لە ساڵی ١٢٥٣ك لەگەڵ هێزێکی سەربازی میسڕی ڕەوانەی کرد بۆ (ریاز)، کاتێك خالید نزیك بووەوە لە (ریاز) ئەوا بارودۆخەکە ئاڵۆز بوو لە فەیسەڵ و بۆیە فیسەڵ و خانەوادەی شەیخ هەڵاتن، بەڵام هێزەکانی میسڕی فەیصەڵیان گرت و دووبارە گەڕاندیانەوە بۆ میسڕ. لە کاتێکدا کە زۆربەی دانیشتووانی نەجد سوکی و ڕیسوا نەبوون بە حوکم کردن و هاتنە سەر دەسەڵاتی خالید، چونکە لە خانەوادەی سعود بەهێزترینە، ئەوا هەندێ لە دانیشتووانی نەجد ملکەچی خالید نەبوون بەهۆی پارمەتی وەرگرتنی لە میسڕیە "هاوبەش دانەرەکان" و لە ترسی ئەوەی نەوەك حوکمی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی عوسمانی تورکی[2] بگەڕێتەوە بۆ سەر نەجد، ئەمەشە

(١) الحصين، احمد: دعوة الامام... سلفية لا وهابية ٢/٢٣١.

(٢) دانیشتووانی (الحويطة) پەیامێکیان نووسی بۆ خالیدی کوڕی سعود: " ئەگەر کاروبارەکە بۆ تۆ بێت و حوکم بەدەستی تۆ بێت و سەربازی تورکی بەلامانەوە نەهێن ئەوا ئێمە ژێر دەستەی تۆین،

ئاماژه دەدات بەوەی کە قبوڵی حوکمی هەر کەسێ دەکەن کە زاڵ ببێت، لەولاوەش ڕەتکردنەوەی حوکمی تورکی کە بە " بێ باوەڕ و هاوبەشدانەریان " دادەنا[1].

کاتێك هێزەکانی میسری گەڕانەوە میسر لە ساڵی ١٢٥٧ك ئەوا (عەبدوڵڵای کوڕی ئەنیان) چووە (ریاض) و خۆی وەك حوکمڕانێکی نوێی ئەو شارەی ناساند. کاتێ خالید هەوڵی دا کە هەڵسێت بە بەرگری کردن ئەوا ڕاوێژکارەکانی لە سەرکردەکانی (ریاض) پێیان وت: " ئەو موڵك و حوکمە لە دەستی تۆ دا نەما و چوو و کەسێکی تر جگەلە تۆ گرتیە دەست، ئەم کارە بەدەست خوایە، دواتر بەدەست ئەو کەسەی کە بەسەریدا زاڵ بووە "[2]. بەو شێوە خالید بەبێ بەرگری کردن خۆی بەدەستەوەدا، عەبدوڵای کوڕی (سەنیان) بووە ئەمیر، ئالی شەیخ چوونە لای ئەمیری نوێ و بەیعەتیان پێدا، دەستە دوای دەستە دەهاتن و بەیعەتیان پێی دا[3].

دوو ساڵ تێپەڕی نەکرد، فەیسەڵی کوڕی تورکی هەڵات لە بەندیخانە لە ساڵی ١٢٥٩، بۆ ئەوەی بە زەبری هێز دەسەڵات لە عەبدوڵا وەربگرێتەوەو

---

ئەگەر کاروبارو حوکم بۆ تورکەکان بێت ئەوا ئێمە جەنگ لە دژیان بەرپا دەکەین ". (ابن بشر، عنوان المجد ١٤٧/٢).

(١) " شوێن و لادێکانی نەجد یەکیان گرت و چەند شۆڕش بەرپا کران بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی ئەنیانی کوڕی سعود، کە دەیانویست ڕزگار ببن لە حوکمی تورك و میسرییەکان، ئامانجیش پاراستنی دینی ئیسلامی ڕاستە لەسەر ڕێبازی ئیمام موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب " . الحصين، احمد، دعوة الامام... سلفية لا وهابية ٢٣٣.

(٢) ابن بشر، عنوان المجد١٩٩/٢.

(٣) الحصين، احمد، دعوة الامام... سلفية لا وهابية ٢٣٣/٢.

عەبدوڵا فرێبداتە بەندیخانە تا مردن[1] سەرباری ئەوەش عەبدوڵا پشتیوانی تەواو و شەرعی هەبوو لەلایەن خانەوادەی شێخ کەچی لۆژیکی زاڵ بوون بۆ کەسی بەهێزترە... ئەو کۆتاییە مەینەتی و ناخۆشی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی (ئەنیان) نووسی.

کاتێ فەیصەڵی کوڕی تورکی کۆچی دوایی کرد لەساڵی ١٢٨٢ك ئەوا ململانێی ناوەخۆی گەڕایەوە بۆ نێوان چوار لە کوڕەکانی ناوبراو (عەبدوڵڵا و سعود و موحەمەد و عەبدوڕەحمان باوکی شا عەبدولعەزیز)، بەشێوەیەك کە سعود یاخی بوو لە براکەی عەبدوڵڵا پاش ئەوەی کە عەبدوڵڵا ماوەی ساڵێك بوو حوکمڕانی بەدەستەوە بوو، چووە جەنگەوە لەگەڵ براکەی، دواتر هەڵات بۆ بەحرەین کە ئەوکات لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیز دا بوو، دواتر سعود گەڕایەوە بە پشتیوانی ئینگلیزو ئەمیری بەحرەین و حوکمڕانی (مەسقەت) تا هێرش بکاتە سەر (الاحساء) و براکەی موحەمەد بەند بکات کە سەرکردایەتی هێزی دەکرد بۆ جەنگ کردن لەگەڵی، ئەو هەموو پشتیوانی کردنەی سعود لەلایەن ناوبراوانەوە بووە هۆی ئەوەی ترس بکەوێتە دڵ و دەروونی براکەی عەبدوڵڵا کە دواتر لە (ریاز)ەوە هەڵات بۆ بیابان، سعود لە ساڵی ١٢٨٨ك چووە ناو (ریاض) و بەردەوام بوو لە ڕاوەدوونانی براکەی لێرەو و لەوێ.

عەبدوڵا لەو حاڵەتەدا هیچ پەناگەیەکی نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە یارمەتی وەربگرێت لە هێزەکانی عوسمانی، بەوەی براکەی تۆمەتبار کرد کە ڕاپەڕیوە لە دژی و ئینگلیز لەو شتەدا یارمەتی دەدات، نوێنەری نارده لای مەدحەت پاشای والی عێراق داوای یارمەتی لێ کرد، والی ناوبراو زۆر بەخێرایی

---

(١) ابن بشر: عنوان المجد ٢/٢٠٨.

بەدەم داواکارییەکەی چوو بە ڕەوانەکردنی پێنج هەزار سەرباز بۆی[1] بەوشێوەیە عەبدوڵای کوڕی فەیسەڵ گەڕایەوە بۆ (ریاز) دوای ئەوەی سعود هەڵات بوو، بەڵام ئەوە تەنها دوو ساڵی خایاند، لەبەر ئەوەی دووبارە سعود گەڕایەوە بۆ (ریاض) لە ساڵی ١٢٩٠ك تا براکەی عەبدوڵلا دەربکات لە دەسەڵات.

کاتێ سعود کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ١٢٩١ك (١٨٧٥ز) ئەوا براکەی عەبدوڕەحمان بۆ دوو ساڵ حوکمی گرتە دەست دواتر موحەمەدی براکەی کە بە تەمەن لەو گەورەتر بوو لێی یاخی بوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو شیاوترە بۆ حوکمڕانی و گرتنە دەستی دەسەڵات، چەندین جەنگ لە نێوان دوو براکەدا بەرپا بوون دواتر هەر دووکیان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە برا گەورەکەیان عەبدوڵلا حوکم بگرێتە دەست، جا عەبدوڵا لە لادێ گەڕایەوە و حوکمی گرتە دەست بۆ جاری سێیەم لە ساڵی ١٢٩٣ك.

بەڵام کوڕەکانی سعود بەو ڕێکەوتن و گرێبەستە ڕازی نەبوون بۆیە یاخی بوون لە مامەکەیان عەبدوڵا لە ساڵی ١٣٠٥ك و شاری (ریاز)یان داگیر کرد و مامەکەیان بەند کرد و یەکێکیان کە موحەمەدی سعودە بۆ ماوەیەك حوکمی گرتە دەست.

لێرەدا عەبدوڵلا لە بەندیخانەدا داوای یارمەتی کرد لە ئەمیری حائیلی (وەهابی): موحەمەدی کوڕی ڕەشید، بۆیە ئیبن ڕەشید بەرەو (ریاض) هات و داگیری کرد و عەبدوڵلای ڕزگار کرد و موحەمەدی کوڕی سعودی کوشت، بەڵام عەبدوڵلای نەگەڕاندەوە بۆ دەسەڵات بەڵکو وەك میوان بردی بۆ حائیل، کەسێکی خۆی کرد بە والی (ریاز). هۆزەکانی نەجدی پەلەیان کرد لە

---

(١) الحصين، احمد: دعوة الامام... سلفية لا وهابية ٢/٢٣٥.

بەیعەتدان بە موحەممەدی کوڕی ڕەشید. کاتێ عەبدوڵڵا کۆچی دوایی کرد دوور لە کورسی دەسەڵات، ئەوا براکەی عەبدوڕەحمان لە ساڵی ١٣٠٨ك هەوڵی دا کە ئیبن ڕەشید لەسەر کار لاببات و میرنشینایەتیە لەناوچووەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام هەوڵەکەی مایەپوچ دەرچوو، بۆیە هەڵات بۆ کوەیت کە ئەو کات لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دا بوو.

بەم شێوەیە حوکمی ئالی سعود لە دەوڵەتی دووەمیاندا کۆتایی پێهات لە دەرەنجامی ململانێیە ناوەخۆ تاڵەکان کە دامەزرابوو لەسەر بنەمای هێزو زاڵ بوون. لە دەرەنجامی ئامادەنەبوونی ڕاوێژ یان هەر ڕۆڵێکی ئوممەت یاخود ئەندامانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (الحل و العقد) یان بوونی دەستورێ کە ڕێگەی وەرگرتنی دەسەڵات ڕێك بخات[1].

(١) ئەحمەد حوصەین دەڵێت: " شایەنی تێبینی کردنە کە ئالی ڕەشید دەستیان گرت بەسەر دەسەڵاتدا و زاڵ بوون بەسەر حوکمی ئالی سعود دا بەبێ جەنگ کردن، لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئالی ڕەشید بەسەر ئەواندا ئەو ململانێ و جەنگە خوێناوییە ناوەخۆییانە بوون کە هاتنە کایە لە نێوان تاکەکانی یەك خانەوادە کە ئارەزووی دەستخستنی ئیمامەتیان بوو، کە بووە هۆی ئەوەی دانیشتووانەکە دڵسۆزی لاواز بوو بۆ باگەوازی وەهابیەت و پیاوەکانی " . (دعوة الامام... سلفية لا وهابية ٢/٢٣٧).

ئەگەر دەوڵەتی سعودیەی یەکەم گەیشتبێت بە چەند شتێ و بنەماکانی و ئامانجەکانی جێبەجێ کردبێ لەسەر دەستی ئەمیر سعودی گەورە. دەوڵەتی ناوبراو خۆی نەگرتبێت و ڕووخابێ لەبەرامبەر هێزی دەرەکی کە هێزی میسری عوسمانی بوو کە پایتەختەکەی (دڕعیە)ی داگیر کرد و ئەمیرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی سعودی بەند کرد و لە سێدارەی دا، ئەوا دەوڵەتی سێیەمی سعودیە ئاڵای وەهابیەتی بەرز کردەوەو پشتی پێبەست لە جێگیر کردنی پێگەو پێیەکانی و گەورە کردنی چوارچێوەی دەسەڵاتی بەسەر نەجد و ئەحساء و حائیل و حیجاز، ئا ئەوە بووە هۆی هەڵگەڕانەوەی لە بزوتنەوەی وەهابی کە خۆی دەبینێتەوەلە ئیخوان و دواتر بەسەریدا زاڵ بوو، بەهۆی سروشتی پەیوەندی تاکڕەوی و خۆسەپاندن و سیستەمی سعودی و بزوتنەوەی وەهابی و لەنێوان سیستەم و بزوتنەوەی ناوبراو لەگەڵ تێکڕای تاکەکانی گەل. ئەگەر سیستەمی سعودی یەکەم لە ڕەحمی بزوتنەوەی وەهابی دا لە دایك بوو بێت، ئەوا دوا سیستەمی  لە دایك بوو لە دەرەوەی ڕەحمی بزوتنەوەی وەهابی بە پشت بەستن بە هێزی بێگانە کە بەریتانیا بوو هانی عەبدولعەزیزی کوڕی سعود دا بۆ داگیر کردنی ڕیاض و هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەتی عوسمانی.

## پەیوەندی ڕژێمی سعودی لەگەڵ بەریتانیا

پەیوەندی شا عەبدولعەزیزی کوڕی سعود لەگەڵ بەریتانیا دەستی پێکرد لە کوەیت، کاتێ شای ناوبراو وەك پەنابەر لەوێ دەژیا لەگەڵ باوکی دا (عەبدوڕەحمانی کوڕی فەیسەڵی کوڕی سعود) دوایین ئیمام لە دەوڵەتی سعودییەی دووەم، دوای یاخی بوونی حوکمڕانی کوەیت (شێخ موباڕەك سەباح) لە دەوڵەتی عوسمانی و پەیمان بەستنی لەگەڵ بەرتانیا لە سەرەتای سەدەی بیستەم، تورکیا فەرمانی دا بە ئەمیری حائیل (عەبدولعەزیز کوڕی ڕەشید) کە یەکێك بوو لە والیەکانی بەوەی دەست بگرێت بەسەر کوەیت و ئەمیرە یاخی بووەکەی تەمێ بکا. لێرەوە موباڕەك لە چوارچێوەی پلانەکەی بۆ ڕووبەڕو بوونەوەی ئەمیری حائیل هەڵسا بە پشت بەستن بە ئیبن سعود کە ئەو کات تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی بیست ساڵ، جا ئیبن سعود پێشڕەوایەتی دەستەیەکی سەربازی کرد بۆ داگیر کردنی (ریاض) لە مانگی (ذي القعدة) ١٣١٨ك _ مارسی ١٩٠١، بەڵام ناوبراو تووشی تێکشکانێکی خراپ بوو کە دەرەنجام تووشی پاشەکشە بوو، هێزەکانی ئیبن ڕەشید شوێنی کەوتن و ڕاوەدوی نان تا سنورەکانی کوەیت، تەنها ئەو سەربازانە ڕزگار بوون لە دەستی هێزەکانی ئیبن ڕەشید کە تۆپەکانی بەریتانیا بەرگری لێ کردن.

عەبدولعەزیز ئەوە فێربوو کە بەرگری قەڵاکانی بەڕیتانیا لە ئیبن صەباح و هێشتنەوەو جێگیر کردنی لەسەر عەرش و تەختی لە کوەیتدا و پوچەڵ کردنەوەی کاریگەری فەرمانی عوسمانی، ئەمە وانەیەکی گرنگ بوو کە بووە

هۆی قەناعەت هێنان بە عەبدولعەزیز بەوەی پشت ببەستێت بە بەریتانیا لە هەر ڕووبەڕوو بوونەوەیەکدا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانەکانی لە خانەوادەی ڕەشید، ساڵی دواتر ناوبراو توانی لەگەڵ دەستەیەکی بچوك لە شوێنکەوتووەکانی بگەڕێتەوە و سەرکەوتوو بوو لە دەست گرتن بەسەر کۆشکی ئەمیرایەتی لە (ریاض) لە سەرەتای شەوالی ساڵی ١٣١٩ك _ پازدەی یەنایەری ساڵی ١٩٠٢ز _ و ئەمیر ئیبن عەجلانی کوشت کە والی ئیبن ڕەشید بوو لەوێ.

زاڵ بوونی عەبدولعەزیزی کوڕی سعود بەسەر (ریاض) وێنەیەك بوو لە زنجیرەیەکی درێژی ململانێی ناو بزوتنەوەی وەهابی لەسەر دەسەڵات، دوور لە ویستی گەل، ئەمەش بە پشت بەستن بە لۆژیکی هێز و زاڵ بوون و خۆسەپاندن. لەگەڵ ئەوەی داگیر کردنی (ریاز) بەو شێوەیە لەلایەن عەبدولعەزیزەوە بە جۆرێك لە یاخی بوون دادەنرا لە بەرامبەر ئەو دەسەڵاتەی شەرعیەتی هەبوو (عوسمانی)، کە ئەو کات سعودییەکان دانیان پێدادەنا، بەڵام ئیبن سعود هەر لەڕۆژی یەکەم دا کە (ریاز)ی داگیر کرد ڕایگەیاند کە ئەو بەناوی سوڵتانی عوسمانی حوکم دەکات و بە حاکمی بەصرەی ڕاگەیاند کە خۆی بە یەکێك لە والیەکانی ئەودا دەنێت[1].

---

(١) باوکی عەبدولعەزیزیش ئیمام عەبدوڕەحمان هەمان کاری کرد، لە بەرواری ٥ سەفەری ١٣٢٠ك لە کاتی دەرچوونی لە کومیت، پەیامێکی نووسی بۆ سەید ڕەجەب نەقیبی خانەدانەکانی بەسرە، کە پاساو دەهێنێتەوە بۆ یاخی بوون و دەرچوون دژ بە ئیبن ڕەشید، لە پەیامەکەیدا جەخت دەکاتەوە لەسەر " ئێمە لە ڕیزی ئەوانەین کە خزمەتکاری دەولەتی پایەبەرزن (مەبەستی دەوڵەتی عوسمانییە _ و _). کاتێك ئەو ڕووداوانەی ڕابردوو بەسەر ماندا هاتن لە دەرەنجامی ستەم و زۆرداری و ناپاکی ئیبن ڕەشید ئەوا پەنامان بۆ هیچ شتێ نەبردووە تەنها بۆ خوای پایەبەرز و دواتر دادپەروەری ئەمیری بڕواداران نەبێت خوای گەورە سەربەرزیی و شکۆدارییەکەی

کەچی لە گۆڕەپانی واقیعدا پرۆسەکە دوور نەبوو لەبەر چاوی بەریتانیا و پاڵپشتی هاوپەیمانەکەی ئەمیری کومیت. هەروەك عەبدولعەزیز رەشید مێژووناسی هاوچەرخی کوەیتی دەڵێت: شێخ موبارەك صەباح پشتگیری ئابوری و سەربازی چالاکی پێشکەش کرد بە ئیبن سعود، بەتایبەتی کاتێ کە ئیبن رەشید هەوڵی هێرش کردنە سەر شاری (ریاز) و گێرانەوەی دەسەڵاتی خۆی لە سەرەتاکانی ساڵی ١٣٢٠ك ئا لەو کاتەدا موبارەك خێرا بە هانای ئیبن سعود هاتوو فەرمانی دا کە چەندین کەشتی کویتی پڕ کەرستە و کەلوپەل و خواردن بکرێ، فەرمانی بە هێزی سەربازی دا کە بەرێبکەون بەرەو (ریاز) تا ئەوەی پێویست بێت بگوازنەوە[1]. سەرباری ئەمەش موبارەك کە لەشاری خۆیشی دا بوو کەچی نەخشەی سەربازی دەکێشا بۆ ئیبن سعود، چونکە سەرکەوتنی ئیبن سعود بەسەر ئیبن رەشید دا، خۆی لەخۆیدا سەرکەوتنی موبارەکە بەسەر دوژمنەکەی و جێبەجێ کردنی ئەو نەخشەیەیە کە کێشابووی[2].

لەو کاتدا بەریتانیا تێ دەکۆشا بۆ جیاکردنەوەی هەرێمی (الأحساء) لە دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەوەی هەرێمی ناوبراو بگەیەنێت بەو شوێنگەیانەی کە شێخەکانی خەلیج سەرپەرشتیان دەکرد و ملکەچی پاراستن و بەرگری

---

بەردەوام کات... ئێمە لە گشت شوێن و بارودۆخ و حاڵێکدا ئەوا بە ویستی خوا هەر هەوڵی پێشکەش کردنی خزمەتین بۆ جەنابی ئەمیری بڕواداران بەو ئامانجەی کە لەو تێکۆشان و ماندوبوونەماندا ڕەزامەندی جەنابیان بەدەست بێنین و زیاتر ملکەچی بنوێنین بۆ فەرمانەکانی دەوڵەتی پایەبەرز ".

(١) الرشيد، عبد العزيز، تأريخ الكويت ١٨٢.

(٢)الرشيد، عبد العزيز، تأريخ الكويت ١٧٥.

بەریتانیا بوون، بەرتانیا هەوڵی زۆری دا لەگەڵ دانیشتووانی (الأحساء) بە مەبەستی یاخی بوون و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی و داواکردنی پاراستن و بەرگری بەریتانی[1] بەڵام گشت ئەو هەوڵانە مایە پوچ بوون کە دواتر پاڵی بە

(١) "هەوڵی یەکەم لە ساڵی ١٨٩٩ز بوو کاتێ نوێنەری بەریتانیا سەردانی مەنصورِ پاشای کوڕی جومعەی کرد لە بەحرەین، نوێنەرەکە لە جیاتی بەرِیتانیا پارمەتی پێشکەش کرد بۆ مەنصورِ بۆ سەربەخۆیی و دابین کردنی پاراستن و بەرگری بەریتانیا لە دژی هەر پرۆسەیەکی سەربازی دەوڵەتی تورکیا. بەڵام مەنصورِ پاشا بەهۆی دینداری و وەفاداری بۆ دەوڵەتی ئیسلامی ئەو داواکارییەی بەرِیتانیا بە وردو درشتەوە رەت کردەوە. وە هەواڵی ئەو داواکارییەی بەرِیتانیا و رەتکردنەوەی لەلایەن مەنصورِەوە گەیشت بە سوڵتان عەبدولحەمید لە بەرامبەردا سوڵتان پلەی پاشای بەخشی بە منصورِ.

هەوڵی دووەمی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٠٥ لەگەڵ حوسەین نەصربوو دەسەڵاتدار و راگری (سیهات) بەڵام ناوبراو ئەو داواکارییەی بەریتانیای لەلایەن خۆی رەتکردەوە، بەڵام داواکارییەکەی ناراستەی مەنصورِ پاشای کوڕی جومعە کرد بەڵام مەنسورِ جەختی لەسەر رەتکردنەوەی کردەوە بۆ جاری دووەم.

لە ساڵی ١٩٠٧ (مستر برسی کوکس) نوێنەری دانیشتووی بەریتانیا لە خەلیج ئەو هەوڵەی لە ئەستۆ گرت و وەك میوان هاتە لای مەنصورِ پاشا لە کۆشکەکەی کە ناوی (کۆشکی دەرویشی) بوو لە ناوچەی قەتیف، نوێنەری ناوبراو داوای لە مەنسورِ پاشا کرد کە رازی بێت بە سەربەخۆیی (الاحساء) بەبێ پابەند بوون بە پەیمانی بەرگری و پاراستنی بەرِیتانی، بەڵام مەنسورِ پاشا جەختی کردەوە هەستە دینیەکەی تاکە هۆکارە کە رێگرە لەوەی خۆی ئەناس بکات و پشت بکان لە دەوڵەتی ئیسلامی، ئەوەك پارمەتی سەربازی یان داوای پراستن رێگرین لەبەردەمی، بەڵام کاتێ بەریتانیا بە فێڵەکەی زانی لە دەستخستنی چەند رووکارێکی نیشتمانی بۆ پاساودان بە هاتنە ناوەوەی هێزەکانی خۆی بۆ ناو (الاحساء) ، ئەوا بەریتانیا دەستی کرد بە ئەنجامدانی ناردنی کەشتیەکی جەنگی لە ساڵی ١٩٠٨ بۆ (راس تنورة) لە (قطیف) لەو شوێنەدا ئاڵای بەریتانیا هەڵدرایەوە. بەڵام هەر کە هەواڵەکە گەیشت بە گوێچکەی دانیشتووانی (صفوا) ئەو خێرا چوون

دەوڵەتی ناوبراو تا بۆ ئەوەی گڵۆپی سەوز پێبکات بەرووی ئیبن سعود بۆ داگیر کردنی (الأحساء).[1] ئیبن سعود هەڵسا بەو پرۆسە گرنگە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۳ لەو کاتەی کە تورکیا رووبەرِوی هێرشی بولغارییەکان بووەوە لە ئەستانە و صیربەکان لە صالۆنیك و داگیر کردنی لیبیا لەلایەن ئیتاڵیاوە.

لەگەڵ ئەوەی ئیبن سعود دوای داگیر کردنی ئەحساء ئەوەی پیشان دەدا کە دۆست و دڵسۆزی دەوڵەتی عوسمانیە، کەچی هەر زوو بەدەرکەوت کە ئیبن سعود نەك دۆست بەڵکو دژی دەوڵەتی عوسمانییە و لە راستیدا دۆستی بەریتانیایە ئەمەش لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم بەدەرکەوت[2]،

---

بۆ هێنانە خوارەوەی ئاڵایەکە و پارچە پارچەکردن و شکاندن و سووتاندنی ئاڵاکە ". ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ١٥.

(١) بەنو میشان باسی کردووە کە: عەبدولعەزیز پەیوەندی کردووە لەگەڵ موبارەك صەباح لە ساڵی ۱۹۱۱ و داوای لێکردووە کە هاوڕێیە ئینگلیزەکانی رازی بکات لەوەی کە لەوانەیە بتوانێت ئەحساء داگیر بکات و بەریتانیاش خۆشحاڵی خۆی بەوکارە دەربری. ناسر الفرج، قیام العرش السعودی ٢٧. بەڵگەنامە پارێزراوەکان لە خانەی بەڵگەنامەی بەریتانی جەخت لەوە دەکەنەوە کە: بەریتانیا داوای لە عەبدولعەزیز کردووە کە هەڵسێت بە داگیر کردنی ئەحساء، هەروەك لە بەرگی ۲۱۳۹ بەو دەقە هاتووە: " بروسکەیەك لەلایەن جێگری پاشاوە لە هیند ئاراستەی لەندەن کرا، کە تیایدا داوای لە ئیبن سعود کردووە کە پامەتی دەربێت لە وەدەرنانی تورکەکان لە ئەحساء و قطیق، لەبەرامبەر ئەو یارمەتی دانەی پەیمانی لەگەڵ دەبەستن کە لەمیانەیدا دان دەنێن بە سەربەخۆیی ئەو وەك حوکمرانی نەجد و ئەحساء و گرەنتی پێدانی لەوەی پارێزراو بێت لەهەر هێرشێکی دەریایی " ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٣٥.

(٢) لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا هاتووە لە بەرگی ژمارە ۲۱٤۰ بەو دەقە: " لە ٥ ئۆکتۆبەری ۱۹۱٤ وەزارەتی هیند پەیامێکی ئاراستەی نەقیب شکسبیر کرد کە پێویستە لەسەری سەفەر بکات بە خێراترین کات و راستەوخۆ پەیوەندی بکات بە ئیبن سعودەوە، هەموو تواناکانی خۆشی بخاتەگەڕ بۆ گەیشتن بە دوو ئامانج: یەکەم: رێگری کردن لە سەرهەڵدانی پەشێوی لە ناوەندەکانی

تەنانەت بەژداربوو لە کۆبوونەوەکانی بەصرە و کومیت و مەحمەڕ کە موبارەك و (خزعل) و (تالیب نەقیب) گرێیان دەدا، هەوڵیشی دا کە عەجمی سەعدون سەرکردەی هۆزی مونتەفیك لە باشوری عێراق بێنێتە پاڵ بەریتانیا بۆ یارمەتی دانی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی[1] ڕاوێژکاری عەبدولعەزیز (حافظ

---

عەرەبیدا لە دەرئەنجامی ئەو پرۆسانەی بەریتانیا پێی هەڵدەستێت لە خەلیج و زەویەکانی عەرەب کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی تورکیەوە، دووەم: جەختکردنەوە لەوەی کە عەرەب یارمەتی پێشکەش بە تورکەکان نەکەن ئەگەر هاتوو جەنگ هاتە کایە لەنێوان بەریتانیا و تورکەکانەوە.

لە مانگی یەنایەری ساڵی ١٩١٥ ئەوا جێگری پاشا لە هیند بروسکەیەکی نارد بۆ وەزارەتی هیند کە هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەر ئیبن سعود دەخاتەڕوو، ئەو بروسکەیە گەیشتە نوێنەری بەریتانیا لە خەلیج لە ڕۆژی ٣١ دیسەمبەر لەساڵی ١٩١٤ نوێنەرەکە وەڵامی دایەوە کە ئیبن سعود ڕایدەگەیەنێت کە لە پاڵ دەوڵەتی بەریتانیادایە یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی ڕزگار کردنی بەسرەیە لە حوکمی تورکەکان ". لە بەڵگە نامەی پارێزراو لە بەرگی ٢٤٧٩ لە خانەی بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا هاتووە بەو دەقە کە: " ئەو هەواڵانەی لە ئیبن سعودەوە هاتوون ئەوە ڕادەگەیەنن کە ڕێگای بۆ هێرش کردنە سەر ئیبن ڕەشید و هیوای سەرکەوتنی هەیە بەسەریدا لە کۆتایی مانگی یەنایەری ساڵی ١٩١٥، شکسپیریش هەر هاودەمی دەبێت و لەگەڵی دەبێت، ئەو گرەنتیانەی کە داوەتە ئیبن سعود بەو مەرجەیە کە یارمەتی دەربێت لەگەڵ شێخی کومیت و مەحمەڕە لە داگیر کردنی بەسرەدا. لەکاتی سەرنەکەوتنیان لەو پرۆسەیاندا ئەوا کاردەکەن لەسەر نەگەیشتنی یارمەتیەکانی تورکی بۆ بەسرە ".

(مس بیل) لە کتێبەکەی دا (فصول من تأریخ العراق القریب) دەڵێت: " ئەو هاوڕێیەتیەی لە نێوان ئێمەو ئەمیری نەجدا هەبوو ئەوەی سەلماند کە ناخەملێنرێ ". ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٣٦.

(١) "مس بیل" لە کتێبەکەی دا (فصول من تأریخ العراق القریب) باسی کردووە کە: ئیبن سعود پەیامێکی نووسی بۆ عەجمی سەعدون کە هانی دەدا لە دژی تورکەکان و داوای لێ دەکرد بێتە ڕیزی ئینگلیزەوە، بەڵام عەجمی سەعدون بە نووسراوێك وەڵامی دایەوە کە تیایدا داواکەی ئیبن

وهبة) له كتێبەكەی دا (خمسون عاما في جزيرة العرب) باسی كردووه كه: عەبدولعەزیز كاتێ سەرەدانی كوەیتی كرد له ساڵی ١٩١٦ كۆبوەوە لەگەڵ گەورە پیاوەكانی كوەیت وتەكانی عەبدولعەزیز هەر هەمووی دەخولایەوە لەسەر ناشرین كردن و توانج تێگرتنی توركەكان و هێنانە خوارەوەی پلەوپایەیان و ئامادەدان بەوەی كه ئەگەر له لاشەی ئەوا یەك دڵۆپە خوێن هەبێت و توركەكانی خۆشبوێت ئەوا هەموو ڕێگەو هۆكارێكی دەگرتەبەر بۆ دەرهێنان و فڕێدانی[1].

---

سعود ڕەتدەكاتەوەو جەخت دەكاتەوە لەسەر ئەوەی كه كۆشش دەكات له پێناو پاراستنی وڵاتی ئیسلامی لەوەی پیس ببێت بە بێ باوەڕان. ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٣٢.

(١) ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٣٣.

## قبولّ کردنی بەرگری و پاراستنی بەریتانی

سەرباری ئەمەش عەبدولعەزیز هەڵسا بە واژووو کردن لەسەر پەیماننامەی پاراستن و بەرگری لەگەڵ بەریتانیا، کە بریتیە لە پەیماننامەی (دارین) کە واژووی لەسەر کرد لە ڕێکەوتی ٢٦ دێسەمبەری ١٩١٥ کە تیایدا هاتووە بەپێی ئەو پەیماننامەیە ئەوا پێویستە لەسەر عەبدولعەزیز گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی بەریتانیا بکات و بەریتانیا مافی چاودێری کردنی پەیوەندییە دەرەکیەکانی هەیە و نابێت پەیوەندی ببەستێت لەگەڵ هیچ دەوڵەتێ تەنها دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی بەریتانیا نەبێ، دانان بە دەسەڵاتی داگیرکاری (ئیستعماری) بەریتانی بەسەر ئەو میرنیشینانەی لە خەلیج داگیر کراون، لە بەرامبەردا بەریتانیا دان دەنێ حوکمی بەعەبدولعەزیز و گرەنتی دان پێی بەبەردەوام بوونی ئەو حوکمە بۆ ئەو و نەوەکانی دوای ئەو.

لە بەندی یەکمی پەیماننامەکەدا هاتووە: " حکومەتی بەریتانی دان دەنێت بەوەی (نەجد) و (ئەحساء) و (جبیل) و پاشکۆکانی ئەو شوێنە ناوبراوانەن کە دیاریکراون و بەندەرەکانی خەلیجی بیانی (خلیج العجم) کە سەر بە شوێنە ناوبراوەکانن ئەوا گشت ئەو شوێنانە لەژێر دەسەڵاتی ئەمیر ئیبن سعود دان و پێشتر لەژێر دەسەڵاتی باووباپیرانی ئەو دابوونە، بەریتانیا دان دەنێت بەوەی ئیبن سعود حوکمڕانی ئەو زەویانەیە کە ناویانبرا و سەرۆکی ڕهای ئەو هۆزانەیە کە ئامادەن لەو شوێنانە، و دان دەنێت بە کوڕ و

نەوەکانی کە لەدوای ئەو ببن بە خلیفەی هەڵبژێردراو لەلایەن حوکمڕانەوە. بەهیچ شێوەیەك دژ بە ئینگلتەڕا نەوەستێتەوە ".

لە بەندی سێیەم دا هاتووە: " ئیبن سعود پەیمان دەدات کە هەرگیز هەڵنەستێت بە هەواڵ گەیاندن یان ئەنجامدانی ڕێکەوتن لەگەڵ هەر حوکمەتێك یان دەوڵەتێکی بیانی، سەرباری ئەمەی پەیمان دەدات کە حکومەتی بەریتانیا ئاگادار بکاتەوە لە هەر ڕووداو سەرپێچی و دەست درێژییەك کە لەلایەن حکومەتەکانی تر دەکرێتە سەر زەویەکانی ئەو ".

لە بەندی چوارەم دا هاتووە: " ئیبن سعود پەیمان دەدات بە شێوەیەکی گومان هەڵنەگر و یەکلای کەرەوە کە پشت نەکا لە هیچ پارچە زەویەك و نەیانفرۆشێت و بە بارمتەیان نەیدات، بە هیچ جۆرێ لە جۆرەکان ئەو زەویانەی ناویان براوە لە پەیماننامەکەدا ئەوا یەك پارچەشی لێ فەراموش نەکات، مافەکانی ئەو زەویانە نەدات بە دەوڵەتێکی بیانی یان پاشکۆی دەوڵەتی بیانی بەبێ ڕەزامەندی حکومەتی بەریتانی و گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی دەبێت کە زیان بە بەرژوەندییەکانی نەگەیەنێت ".

لە بەندی شەشەم دا هاتووە: " ئیبن سعود پەیمان دەدات _ هەروەك پێشتر باوکی پەیمانی داوە _ کە خۆی دوور بگرێت لە هەر سنور بەزاندنێك یان چوونە ناو خاکی کومیت و بەحرەین و زەوی و کەنارەکانی ئەو زەویانەی شێخەکانی قەتەر و عەمان و هەموو ئەو شێخانەی هەن لە ژێر چاودێری ئینگەلتەڕا هاوپەیمانیان لەگەڵدا هەیە "[1].

---

(١) ناصر الفرج، قيام العرش السعودی ٥٩.

بەجێبەجێ کردنی ئەو پەیماننامانە بەریتانیا هەڵسا بە پێشکەش کردنی ڕاوێژی سەربازی بۆ ئیبن سعود لە ماوەی هەڵسانی بە هێرش دژ بە ئەمیری حائیل ئیبن ڕەشید. نەقیب شکسپیری وەك ڕاوێژکاری سەربازی دیاریکرد بۆی، ئەو ڕاوێژکارە کوژرا لە جەنگدا لە کاتێ کە هەڵدەستا بەیارمەتیدان بۆ زەخیرە تێکردن لە تۆپ لەکاتی گەرمەی جەنگدا[1].

سەرباری ئەوەی کە چوونی ئیبن سعود بۆ پاڵ بەریتانیا لە جەنگ کردن دژ بە موسڵمانان و دەوڵەتی عوسمانی و واژوو کردنی لەسەر پەیماننامەی پاراستنی و بەرگری ناوزڕێنی بەریتانی[2]، لە لۆژیکی وەهابیدا و بەپێی مەرجەکانی یەکتاناسی کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب داینابوون بە گەورەترین هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان دادەنرا، کە بریتیە لە دۆستایەتی کردنی بێ باوەڕان[3]. بەتایبەتی لەو کاتە ناهەموارە کە ئینگلیز پیلانی دادەنا بۆ

---

(١) ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٣٦.

(٢) فوئاد حەمزە بریکاری وەزارەتی دەرەوەی سعودیە وەسفی ئەو پەیماننامەی کردووە بەوەی کە " پەیماننامەیەکی زۆردارانەیە ". باڵوێزی سعودی خەیرەدین زرکلی وتویەتی لەبارەی پەیماننامەکەوە: " وەك ئەو پەیماننامانە بوو کە ئینگلیز دەیبەستی لەگەڵ میرنشینەکانی کەنداو ". وە (حافظ وهبة) ڕاوێژکار و باڵوێزی عەبدولعەزیز لە لەندەن وەسفی ئەو پیماننامەیەی کردووە؛ پەیماننامەیەکە کە عەبدولعەزیز دەخاتە ژێر چاودێری بەریتانی وەك گشت ئەمیرەکانی تری کەنداو، تەنانەت هەموو پەیوەندیەکانی لەگەڵ سەرۆکی کەنداو بوو کە لە (بوشهر) دادەنیشت. ناصر الفرج، قیام العرش السعودی ٨٥.

(٣) شێخ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵەتیف لە ئالشەیخ دەڵێت: " پشتگرتن (التولي)؛ کوفرێکە بکەرەکەی دەخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلامەوە، ئەمە بەرگری کردنە لێیان و یارمەتی دانیانە بە ماڵ و جەستە و دیدو بۆچوون، دۆستایەتی (موالاة)؛ یەکێکە لە گەورە گوناهەکان وەك تەرکردنی

ئەوەی گورز بوەشێنێ لە یەکڕیزی موسڵمانان و پەرت کردنی بەستەرەکانی دەوڵەتە گەورەکەیان (دەوڵەتی عوسمانی) و جێگیر کردنی ڕیشەی ئیستعماری و داگیر کاری لە ناوچەکە و دامەزراندنی چەند سیستەمێکی پاشکۆی خۆی. بەڵام ئەمە کاریگەری نەبوو لەسەر پەیوەندی ئیبن سعود بە بزوتنەوەی وەهابیتەوە کە لە ژێر حوکمی ئەودا چالاکی دەکرد و لە ناو هێزەکانی دا پێگەی هەبوو و تێکڕایی موسڵمانانی وەسف دەکرد بەوەی هاوبەشدانەرن و جیاوازی نەدەکرد لە نێوان داگیر کەر و داگیر کراو.

---

شوشەی مەرەکەب یان ئامادەکردنی پێنوس یان ڕووخۆشی نواندن لەبەرامبەریان بەرزکردنەوەی قامچی بۆیان " الدرر السنية و الأجوبة النجدية ۲۰۱/۷.

## پەیوەندی ئیبن سعود لەگەڵ (ئیخوان)

لەگەڵ گەڕانەوەی حوکم بۆ دەستی ئالی سعود لە (ریاض)، وەهابیەت لە بزوتنەوەیەکی نوێدا دەستی پێکرد، ئەمەش بەوەی یەکێك لە شێخەکانی وەهابیەکان کەناوی (عەبدولکەریمی مەغریبیە) هەڵسا بە دامەزراندنی شانەیەك لە مێرگی (أرطاویة)، نزیکەی پەنجا کەسی لادێ نشینی ڕازی کرد بەوەی لە مێرگەکەدا یان لە لادێکانی دەوروبەریدا نیشتەجێ ببن، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ گەڕاندنەوەی ئەزموونی وەهابی سەرەتا کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دایهێنا بەر لە سەدەیەك یان نیو سەدە بەر لەو کاتە پێی هەڵسابوو. دواتر ئەو دیدو فیکرەیە لە تێکڕای نەجد دا بڵاو بووەوە، بانگخوازانی وەهابی (گوێڕایەڵ) دەگەڕان بەناو هۆزەکانی نەجدا داوایان لێ دەکردن کە کۆچ بکەن و بچن نیشتەجێ ببن لە لادێ و مێرگەکان، تەنانەت ناویان لەو شوێنانە نابوو: "الهجر" یان "الیثربیات" وەك دانە پاڵ (یەثریب) ئەو شوێنەی پێغەمبەری مەزن موحەمەد ~ کۆچی بۆ کرد: (مەدینەی منەوەرە) [1]، (الهجر)یان وەك وڵات و خانەی ئیمان و کۆچ کردن دانا لەبەرامبەر وڵاتی هاوبەشدانان و نەفامی، وەك مەدینەی منەوەرە لەسەرەتای ئیسلام ئەو خاسیەتەی هەبوو، ئەو بە بۆچوونی ئەو دەستەیە یەکێ لە نیشانە و دروشمەکانی دڵساغی و دڵسۆزی بۆ خوای گەورەو دینەکەی و نیشانەی ئیمانی ڕاست بریتیە لە: خۆدارنین و خۆ دوور گرتن لە هەموو ئەو شتانەی

---

(١) بە پشت بەستن بە واجب بوونی کۆچ کردن تا ڕۆژی دوایی هەروەك شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئەمەی خستوەتەڕوو لە کتێبەکەیدا (الأصول الثلاثة).

كه بۆنی نەفامی لێ دێت، دەستیان كرد بە فرۆشتنی حوشترو وڵاغەكانیان و دەچوون كەنارگیر دەبوون لە (الهجر) بۆ پەرستش و فێربوونی قورئان و لەبەركردنی و گوێگرتن لە ژیاننامەی پێغەمبەر ~ و ئەو جەنگانەی پێغەمبەر ~ ئەنجامی داون و مێژووی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە دوورگەی عەرەبدا. ئەوانە ناویان لەخۆیان نا "ئیخوان" وەك جێبەجێ كردنی ئەو ئایەتە: ﴿ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا ﴾ آل عمران: ١٠٣. واتە: (دڵەكانتان بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست كرد بەیەكەوەو هەموو بوونە برای یەكتر).[١]

لادێ نشینەكان ئەوانەی ڕاهاتبوون لەسەر جەنگ و تاڵان كردن و كوشتن لە بیاباندا ئەوا ئاوێتە بوون و كارلێكیان كرد لەگەڵ عەقیدەی وەهابی كە ئەو عەقیدەیە ئەو كارانەیان بۆ بەڕەوا دەزانێت بەهۆی ئەوەی كە وا تەیاریان دەكات كە تەنها ئەوان "موسڵمانن" و جگەلەوانیش "بێ باوەڕو هاوبەشدانەرن" و خوێن و ماڵ و سەروەت و سامان و شەرەفیان پارێزراو و حەرام نیە، بەڵكو ئەم جەنگانەی عەرەبە لادێ نشینەكان بریتیە لە جێبەجێ كردنی پرۆسەی جیهاد لە پێناو خوادا.

دواتر ئەو بزوتنەوەیە فراوان بوو تەنانەت دەستێكی باڵای هەبوو لە كاروباری نەجددا، دوای داگیر كردنی ئەحساء لەساڵی ١٩١٣ز نواندنی ئازایەتی و نەبەردی بێ وێنەی گەورەی سەربازی و قوربانی دانی بێ هاوتا لە جەنگدا ئەمە بووە هۆی ئەوەی كە ئەمیر ئیبن سعود چاودێریان بكات. ئیبن سعود لە ساڵی ١٩١٦ دەستپێشخەر بوو لەوەی خۆی وەك سەركردەی ڕۆحی ئەوان ناساند و ئەوانی بەكارهێنا لە پرۆژە سیاسی و سەربازیەكانی خۆی، تا لەوكاتەدا ئیبن سعود زۆر پێویستی بە سەربازی گوێڕایەڵی وەك (ئیخوان) هەبوو، بۆیە

---

(١) محمد جلال كشك، السعوديون و الحل الاسلامی ٥٥٦.

بڕیاری دا که خۆی سەرکردایەتیان بکات[1] و فەرمانی دا بەوەی گشت هۆزەکانی عەرەب بێنە ڕیزەکانی (ئیخوان)ەوە چ ڕازی ببن یان نا، بۆ ئەم مەبەستە نزیکەی (٢٢٠) یەکەی نیشتەجێی (هجرة) دروست کرد. ئیبن سعود کاروباری ئەو یەکانە و سەرپەرشتی کردنی سپارد بە شێخ عەبدوڵای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵەتیف و ڕایسپار کە هەڵسێ بە تەیار کردن و چاندنی فیکرەی وەهابی لە ناخی ئەوانەی تازە دێنە ناو یەکەکانی نیشتەجێ و جەخت بکاتەوە لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە و گوێڕایەڵی حوکمڕان و دژایەتی "بێ باوەڕان"، دروستکردنی ئەو بۆچوونە لەلایەن ئەوان کە سوارچاکی یەکتاناسین لە دژی بێ باوەڕان[2].

بەر لە کۆتایی هاتنی ساڵێك ئەوا ئیبن سعود خۆی بینیەوە کە سەرکردەی هێزێکی زۆری خۆبەخشی عەقائیدی دەکات کە دەتوانێ پشتیان پێ ببەستێ تا ئاستی مردن و گرەنتی سەر کەوتن بەسەر دوژمنەکانی بەدەست بێنێت[3] و

---

(١) بەکارهێنانی (ئیخوان) لەلایەن ئیبن سعودەوە شتێك نەبوو کە بەریتانیا ئاگای لێ نەبێت بەڵکو بەریتانیا هەوڵی دا کە بزوتنەوەی وەهابی بەکاربێنێ لە پێناو خزمەتکردنی بەرنامەو نەخشەکانی لە ناوچەکەدا. هەروەك سیخوڕی بەریتانی (جۆن فلیبی) دەڵێت: پرۆسەی زیندوو کردنەوەی فیکرەی وەهابی یەکێك بوو لە ئەرکە سەرەکیەکان بۆ ئەوەی لە ناو هەموو شارو هۆز و لادێیەك لە دوورگەی عەرەبدا پیشتوان بۆ ئیبن سعود دروست بکەین. جون فلیبي، تأريخ آل السعود ٥٨٣.

(٢) ئەمین ڕەیحانی دەڵێت: " هەر کەسێ لەسەر مەزهەبی ئەوان نەبێت ئەوا بە موسڵمانی دانانێن هەروەك ئاماژە بەوەدەدەن لە کاتی سەلام کردن لە یەکتری:(سەلامتان لێبێ ئەی برایان "ئیخوان" خوا موسڵمانان بژیەنێ). ئەگەر موسڵمانێکی سوننی یان شیعی سڵاویان لێ بکات ئەوا وەڵامی سڵاوەکە نادەنەوە ". الريحاني، معجزة فوق الرمال ٦٤.

(٣) کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامی ٥٥٩_٥٦٠.

ساڵی ١٩٢٠ بەتەواوی نەهات کەچی جۆش و خرۆش و حەماسەتی وەهابی لەلایەن لادێ نشین و دەشتەکیەکان گەیشتبووە ئاستێکی گەورە، بە شێوەیەك کە هیچ یەکێك نەبوو کە لە دەرەوەی ڕیزەکانی (ئیخوان) بێت[1].

عەبدولعەزیز لە (ئیخوان) کرۆك و کاکڵی هێزی هەمیشەی تایبەت بە خۆی پێك هێنا کە چەك و زەخیرەی تایبەتی بۆ دابین دەکردن، چونکە ئەو کەسانە توندو تیژی لادێ و خۆڕاگری شاریان بەیەکەوە گرێدابوو. ئیبن سعود وەك شانازی کردن پێیانەوە بە فلیپی وت: " ئەوەندە بەسە کە بانگ بکەم بۆ دەست کردن بەجەنگ ئەوا هەزاران سەرباز لەژێر ئاڵای من کۆدەبنەوە لە (بیشة) بۆ (نجران) و لە (رانية) بۆ (تثليث) و جگەلەوانیش، هیچ کەسێکیان تێدا نییە کە مردنی خۆشنەوێ لە پێناوی عەقیدەدا، هەمووشیان بڕوایان وایە کە هەڵاتن لە کاتی جەنگدا ئەوا دەچنە ئاگری دۆزەخەوە "[2].

جۆشدران و ئاوێتە بوونی ئیبن سعود لەگەڵ (ئیخوان)، گۆڕانێکی گەورە بوو لەو جەنگانەی کە ئەنجام دەدرا لە پێناو فراوان کردنی چوارچێوەی میرنشینەکەی، بەشێوەیەك کە سیفەتی جیهادی دینی هەڵگرت دوای ئەوەی کە پێشتر تەنها ململانێیەکی ڕووت بوو لەسەر دەسەڵات[3] و بەو شێوەیە عەبدولعەزیز توانی کە بەهۆی (ئیخوانەوە) (حائل) بگرێت و دواتر (ئەحساء) پاشان (حیجاز) داگیر بکات[4].

---

(١) دیکسون، الکويت و جاراتها ٢٥٢/١.

(٢) کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامی ٣٩٥.

(٣) کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٦١٣.

(٤) شا حوسەین هەستی کردبوو بە مەترسی ئەوان بۆیە داوای لە بریکاری بەریتانی کرد لە (جدة) لە بەرواری ١٩١٨/٩/١٨: کە بەریتانیا ئیبن سعود ناچار بکات بە هەڵوەشاندنەوەی (ئیخوان) " ڕێکخراوی سیاسی کە خۆی پۆشتە کردووە بە بەرگی ئایین " ئەو ڕێکخراوەی کە ئیبن سعود

بەڵام عەبدولعزیز دەیزانی کە ئەو لە دۆڵێك و (ئیخوان) لە دۆڵێکی تر دەڕوات و هەر یەکەیان ئاوازی دەروونیان جیاوازە، عەبدولعەزیز کار دەکات لەسەر نەخشەیەکی دیاریکراو و ئامانجی دەستنیشان کراو کە پەیوەستە بە لایەنی وردی پەیماننامەوە لەگەڵ بەریتانیا، کەچی (ئیخوان) کار دەکەن و دەگوزەرێنن لەسەر هیواو خەون و دروشمەکان و تیۆری توندڕەو کە بووە هۆی داڕوخانی دەوڵەتی سعودییەی یەکەم. عەبدولعەزیز نەیدەویست کە جیهانی ئیسلامی "هاوبەشدانەر" بگەڕێنێتەوە جیهانی یەکتاناسی، بەڵام تەنها دەیویست کە (ئیخوان) و بزوتنەوەی وەهابی بەکاربێنێ بۆ دەستەبەر کردنی سەرکەوتنی سەربازی و سیاسی و دواتر لەناوی ببات و وشکی بکات. ئالێرەوە ئیبن سعود هەستی بە مەترسی وەهابیەت کرد لە سیستەمەکەی ئەگەر لە ژێر دەستی دەرچوو. بۆیە بەردەوام هەوڵی دەدا کە هەردوو قۆچی بەتووندی بەدەستەوە بگرێت و لە کاتی شیاودا لێی بدات. بە نوێنەری نیشتەجێ بەریتانی لە کوەیت (هارۆڵد دیکسۆن)ی وت کاتێ نوێنەری ناوبراو دوودڵی خۆی دەربڕی لەهەمبەر بزوتنەوەی ئیخوان: "هارۆڵد مەترسە، ئیخوان بریتین لەمن نەوەك کەسێکی تر"[1].

---

بەکاریان دەهێن لە خزمەتی ئارەزووەکانی، تەنانەت شای ناوبراو وەهابیەتی وەك مەترسیەکی گەورە بینی لەسەر هێمنی و ئاسایش لە دوورگەی عەرەبیدا. کشك: محمد جلال، السعودیون و الحل الاسلامی ٥٦٧.

(١) دیکسون: الکویت و جاراتها ٢٥٢/١.

## پەیوەندی بزوتنەوەی وەهابی لەگەڵ تێکرایی موسڵمانان دا

بەر لەوەی بەردەوام بین لە قسە کردن لەسەر پەیوەندی ئیبن سعود لەگەڵ بزوتنەوەی وەهابی (ئیخوان) و گەشەکردنی ئەو پەیوەندیە، ئەوا پێویستە هەڵوەستە بکەین لەسەر پەیوەندی بزوتنەوەی وەهابی لەگەڵ تێکڕایی موسڵمانانی تر بە گشت دەستەو کۆمەڵە جیاجیاکان و هەموو لادێ نیشینەکان و تەنانەت چینەکانی وەهابیش. دەڵێین:

کاتێ لە سەرەتایی سەدەی بیستەم عەبدولعەزیزی کوڕی سعود شاری (ریاض)ی داگیر کرد، ئەوا هیچ قسەیەك نەبوو لەهەمبەر تەکفیر کردنی دەوڵەتی عوسمانی کە ئیبن سعود وەك والیەکی دەوڵەتی ناوبراو خۆی ناساند و قسە نەبوو لەسەر تەکفیری حیجاز و خانەدانەکانی ئەوانەی کە ئیبن سعود خۆشەویستی و ڕێزی خۆی بۆ دەرخستبوون[1]. تەنانەت هیچ قسەیەك نەبوو لەسەر تەکفیر کردنی کومیت کە چەند ساڵێ ئیبن سعود وەك پەنابەر لەوێ ژیا بوو. (دە) ساڵ تێپەڕی بەر لەوەی وێنەکە ژێراو ژوور ببێ، ئەمەش دوای ئەوەی ئیبن سعود بڕیاری دا کە بزوتنەوەی وەهابی بینا بکاتەوە لە ١٩١٦ و هێزی (ئیخوان)ی دەشتەکی ئامادە بکات لەسەر ئەو بنچینەیە، بەشێوەیەك

(١) ئیبن سعود لە (دە) ساڵی سەرەتای حوکمڕانیەکەیدا هەوڵی دا خۆشەویستی دەربڕێت تەنانەت دەستەکانی شەریفی مەککەی ماچ دەکرد. پەیامێکی دڵگری ڕەوانەکرد بۆ شەریف حوسەینی کوڕی عەلی، لەو پەیامەدا ئیبن سعود ڕازی بووە کە خۆی بەهۆی شەریفی مەککە ببێتە پاشکۆی دەوڵەتی عوسمانی. عبدالکریم الغرایبة، قیام الدولة السعودیة العربیة ١٠.

دووباره ئاوازی تەکفیر بەرز دەبووەوە، تەماشای موسڵمانان دەکرا بەوەی کە ئەوان "بێ باوەڕو هاوبەشدانەرن"[١].

هەروەك یەکێ لە شێخەکانی وەهابییە بەرپرسەکان لە زەخیرە دارکردن و پرچەك کردن و تەیارکردنی "ئیخوان"، کە ئەو شێخەش شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمانە ئەندامی دەستەی گەورەی زانایان: " ئەوانەی لە دوورگەی عەرەبیدان ئەوا ئێمە نازانین کە لەسەر چ بیرو باوەڕێکن، ئەوەی دیارە لە ئێمە ئەوەیە: کە زۆربەیان لەسەر ئیسلام نین، بەڵام حوکمی بێ باوەڕی و کوفر نادەین بەسەر هەموویان دا لەبەر ئەو گریمانەی کە نەوەك موسڵمانێکیان لەناودا بێت. بەڵام ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی ئیمامی موسڵمانانە ئەوا زۆربەیان لەسەر ئیسلامن لەبەر ئەوەی لە ڕووکەشدا شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ دەکەن... بەڵام ئەوەی لەژێر چاودێری و دەسەڵاتی ئیمامی موسڵکاناندا نەبێ ئەوا ئێمە شارەزاییمان نیە لەهەمبەر حاڵیان و ئەو بیروباوەڕەی کە هەیانە، بەڵام زۆربەیان ئەو حوکمەیان هەیە کە سەرەتا باسمان کرد کە بریتیە لەوەی لەسەر ئیسلام نین.

هەر کەسێ لە ڕووکەشدا خۆی بە موسڵمان پیشاندا و هەڵسوکەوتی کرد ئەوا پێویستە ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ وەك موسڵمان لەگشت حوکمەکان دا، بەڵام ئەوەی لە ڕووکەشدا نە موسڵمان، نە بێ باوەڕ بوو بەڵکو نەزان بوو، ئەوا دەڵێین: ئەو کەسە نەزانە ئەگەر بنچینەی هاتنە ناو ئیسلامی لەگەڵدا بێت

(١) ئەمین ڕەیحانی دەڵێت: " هەر کەسێ لەسەر مەزهەبی ئەوان نەبێت ئەوا بە موسڵمانی دانانێن هەروەك ئاماژە بەوەدەدەن لە کاتی سەلام کردن لە یەکتری:(سەلامتان لێبێ ئەی برایان "ئیخوان" خوا موسڵمانان بژیەنێ). ئەگەر موسڵمانێکی سوننی یان شیعی سەلامیان لێ بکات ئەوا وەڵامی سەلامەکە نادەنەوە ". الريحاني، معجزة فوق الرمال ٦٤.

ئەوا موسڵمانە... ئەگەر ئەو بنچینەشی لەگەڵدا نەبێ ئەوا بێ باوەڕە، هەر کەسێ ڕووکەشی کوفر بێ ئەوا بێ باوەڕە "[1].

سەبارەت بە شیعە ئەوا وەهابیەکان ناویان دەبردن بە "الرافضة" و بە غەیرە موسڵمان و ئەهلی ئیسلامیان دەزانی، شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدوڵەتیف (بیست و چوار زانای تر) ڕوونکردنەوەیەکیان دەرکرد لە کۆتای کۆبوونەوەیەکدا کە لە مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٤٥ (١٩٢٧/١/١٧) ئەنجامدرابوو، لەو ڕوونکردنەوەیەدا هاتبوو: " .... سەبارەت بە "الرافضة" ئەوا فەتوامان بۆ ئیمام ئیبن سعود داوە کە بەیعەتیان لێ وەربگرێ لەسەر ئیسلام و ڕێیان لێبگرێ لەوەی دروشمەکانی دینە پوچەکەیان دەربخەن، پێویستە لەسەر ئیمام کە نوێنەرو جێگرەکەی لە "ئەحساء" پابەند بکات بەوەی ئەو شیعانە بێنێتە لای شێخ (ئیبن بشر) و بەیعەتی پێبدەن لەسەر دینی خواو پێغەمبەرەکەی... پابەندیان بکات بە فێربوونی (ثلاثة الاصول) _ کتێبێکی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهابە _ هەر کەسێ ئەمە جێبەجێ نەکات ئەوا پێویستە شاربەدەر بکرێ لە وڵاتی موسڵمانان دەربکرێ.... بەڵام "الرافضة"ەکانی عێراق ئەوانەی بڵاوبوونەتەوەو تێکەڵ بوونە لەگەڵ موسڵمانە دەشتەکی و لادێ نشینەکان ئەوا سەبارەت بەوانە فەتوامان داوە بۆ ئیمام کە نەهێڵێت بێنە ناو زەویی و پاوانەکانی موسڵمانان "[2].

---

(١) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ٧٩ _ ٨٠.

(٢)حافظ وهبة: جزيرة العرب في القرن العشرين، لا ٢٢٧. و أنور عبدالله: العلماء و العرش، لا ٤٧١. و التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٣٦٧ _ ٣٦٩.

لەژێر ئەو درۆشمانەی تەکفیر ئیبن سعود فەرمانی دا بە یەکێ لە سەرکردەی هێزەکانی فەیصەڵ دومیش (سەرکردەی ئیخوان) بە هێرش کردنە سەر (الجهراء) لە کومیت بە نزیکەی چوار هەزار سەربازەوە لە ساڵی ۱۳۳۹، لە پێناو (بانگ کردنی دانیشتووانی کومیت بۆ ئیسلام) [1] ئەمەش بووە هۆی شلەقان و شەڵەژانی دەروونی دانیشتووانی کومیت تەنانەت شەڵەژانی دەروونی خودی حەنبەلی و سەلەفیەکانی کومیت[2].

شتێکی دیارە کە پەیوەندی هەر بزوتنەوەیەك کە تەکفیری موسڵمانان دەکات ئەوا لەسەر توندو تیژی داگیر کردن و زاڵ بوون دادەمەزێ، هیچ ماوەیەك نابێ بۆ ڕاوێژ و ڕێزو ڕێگەدان بە هاوڵاتیان بە بەژدار بوون لە پرۆسەی سیاسی و چارەی خۆ نوسین.

---

(۱) الرشيد: عبدالعزيز، تأريخ الكويت ۲۳.

(۲) الرشيد: عبدالعزيز، تأريخ الكويت ۲۵۸.

## پەیوەندییە ناوەخۆییەکانی وەهابییەکان (تەکفیر کردنی خۆبەخۆیی)

لەبەر ئەوەی ڕەوڕەوەی تەکفیر توندو فراوان بوو ئەوا نەیتوانی هەندێ دەستەی وەهابی ئامادەبکات، تەنانەت (ئیخوان) بەوە دەستی هەڵنەگرت کە تەکفیری شیعە و تێکڕایی موسڵمانان بکات، بەڵکو دەستی کرد بە تەکفیر کردنی هەندێ لە وەهابیە لادێ و شار نشینەکان، بەتایبەتی ئەوەی نەبوو بووە ئیخوان و کۆچی نەکردبوو بۆ لایان یان بە وردی پابەندی مەرجەکانی ئەوان نەبوو بێ، وەك: پۆشینی مێزەر (عمامە) کە ناوبانگیان پێ دەرکردبوو[1].

شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمان دەڵێت: "لەسەر زمانی زۆرێ لەوان ئەو شتانە دە ووترێن خەڵکانێ دایهێناون کە سنوریان بەزاندووە، زیاد ڕۆچوون لە ئایندا و ڕێگەی غەیری بڕواادارانی گرتۆتەبەر.

وەك نمونەی قسەکانیان ئەو قسەیانە: کەسێ موسڵمان نیە کە کۆچ نەکات لە عەرەبەکان ئەگەرچی هاتبێتە ناو (دین)[2] و خۆشی بوێت و دۆستایەتی شوێنکەوتووانی بکات و ئەو شتانەی کەهی نەفامی سەرەتان فڕێ بدات، جا ئەوەی کۆچ نەکات ئەوا بە موسڵمان دانانرێ لەلایەن ئەوانەوە.

یەکێکی تر لەو شتانەیان ئەوەیە: ئەگەر کاروانی ئەوان بەلای هەندێ لەو عەرەبانەدا ڕۆیشت کە لە ڕووکەشدا موسڵمانن و دین دەناسن و هاتوونەتە

---

(١) بەهەمان شێوە بگەڕێوە بۆ: حافظ وهبة، جزيرة العرب في القرن العشرينا ٣١٢. و: لتويجري، عبد العزيز، لسراة الليل هتف الصباح ٢٤٧ و ٢٥٧.

(٢) واتە: وەهابیەت.

ناویەوەو ئەو شتانەیان فڕێداوە کە هی سەردەمی نەفامیین، ئەوا سەرەتا لەو عەرەبە موسڵمانانە دڵنیا نین و سەلامیان وەڵام نادەنەوەو ئاژەڵە سەربڕاوەکانیان ناخۆن، چونکە ئەوان کۆچیان نەکردووە بۆ لای ئەوان "[1].

(ئیخوان) هەمان ڕێ و شوێنی بزوتنەوەی وەهابیەتی سەرەتای دەگرتەبەر، کە دامەزرێنەری بزوتنەوەکە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لادێ نیشین و دەشتەکیەکانی بەگشتی تەکفیر دەکرد، ئیخوان لاسایی و تەقلیدی شێخ موحەمەدیان کردەوە لەوەی حوکمی کوفریان دا بەسەر لادێ و دەشتەکیە هاوچەرخەکانیان. بۆیە شێخ ئیبن سەحمان هەڵوێستەی کردووە لەسەر ئەم خاڵە: "مەسەلەیەك لێرەدا هەیە کە ئەو دەشتەکییە دیندارانە (ئیخوان) وەریان گرتووە لە ئەنجامی ئەوەی کە یەکێ لە دەشتەکیەکان هەندێ دەربڕینی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهابیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، وەك ئەو شوێنەی شەشەم لە ژیاننامە (السيرة) کە تیایدا هاتووە:(ئەوان هیچ شتێ لە ئیسلامیان پێ نییە). ئەوەی دەشتەکیەکە باسی کردووە کە خۆی و هەموو خەڵکی دەشتەکی بێ باوەڕن، ئەو گوێڕایەڵەی تەکفیری دەشتەکیەکان ناکات ئەویش بێ باوەڕە. و هاووێنەی ئەو دەربڕینانە. جا ئەگەر ئەو دەربڕینانە بەسەریاندا دەخوێننەوە دەڵێن: ئەوە قسەو ڕای شێخە لەسەر دەشتەکیەکان[2]" ئەوان تێکڕایی دەشتەکیەکانیان تەکفیر کردووەو گوایە ئەوان موسڵمان نەبوون و نەهاتوونەتە ناو دینەوە "[3].

---

(١) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ٩٠.

(٢) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ١٤.

(٣) ابن سحمان، منهاج أهل الحق ٨٨.

## هەڵگەڕانەوەی ئیبن سعود لە دژی (ئیخوان)

وەهابیەکان و (ئیخوان) زۆر گرنگی و بایەخیان نەدا بە سروشتی دیکتاتۆری سیستەمی سعودی نوێ، کە دامەزراوە لەسەر هێزو توانا و زاڵ بوون، ئەمە بەشێ بوو لە کەلەپوری فیکری سیاسی ئەوان، بۆیە هیچ کۆسپێکی بەدی نەکرد لە یارمەتی دان و بەهێزکردنی دەسەڵات و جەنگ کردن لە پاڵ ئیبن سعود لە دژی هۆزو گەل و حکومەت و دەستەکانی تری نا وەهابی، بەڵام سروشتی سیستەمی دیکتاتۆری و تاکڕەوی ئەو کۆسپ و تەگەرە بوو کە سیستەمەکە لەسەری هەڵگەڕایەوە لەدژیان و لە دژی وەهابیەت لەمەولا. ئەمەش خۆی بینیەوە لە خۆنەناس کردن سەبارەت بە بنەماکانی ئیسلامی وەك بنەمای دۆستایەتی (الولاء) و دوژمنایەتی (البراء)، تەنانەت پەیڕەو کردنی سیاسەتی پاشکۆیەتی و هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئیستعماری ئینگلیزی لە ناخۆشترین کات کە ئوممەتی ئیسلامی تیایدا تێدەپەڕی، دواتر هەڵگەڕاوە دژ بە بەهێزترین توانای وەهابیەت کە بریتیبوون لە (ئیخوان) کەچی لە چەسپاندن و جێگیر کردنی حوکمڕانیەکەی پشتی پێبەستن، پاشان دژیان هەڵگەڕایەوە.

لێکترازان لەلایەن هەر دوولادا دەستی پێکرد ڕاستەوخۆ دوای داگیرکرنی حیجاز ساڵی ١٩٢٥ بەشێوەیەك کە (ئیخوان) جۆرێك لە تێکگیرانی بینی لە نێوان ئەو دورشمەی کە ئیبن سعود لەژێریدا هانی ئەوانی دا (ڕزگار کردنی حیجاز لە بێ باوەڕان و هاوبەشدانەران) و ئەو سیاسەتی ئاشتەواییەی

گرتیەبەر لەگەڵ حیجازییەکان و جەختکردنەوە بۆیان: " کە خۆی نایەوێت حوکمی ڕاستەوخۆی ئەوان بکات " و پەیمان پێدانیان بەوەی ئەوان خۆیان ئیدارەو سەرپەرشتی کارەکانیان بکەن لە ڕێگەی ئەنجومەنی ڕاوێژەوە[1]، ئیبن سعود لە وتارەکەیدا لە بەرامبەر سەرکردەکانی مەککەدا وتی: " من نامەوێ تەنها بەخۆم کاروبار لە وڵاتی ئێوەدا بەڕێوە ببەم بەبێ ئێوە بەڵکو دەمەوێ لە گشت کاروبارێك دا ڕاوێژتان پێ بکەم ". داوای لە ئامادەبووان کرد کە کۆببنەوە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژی خۆماڵی (ئەهلی)، ئەمەش هەوڵێ بوو لەلایەن ئیبن سعودەوە بۆ ئاسان کردنی داگیر کردنی مەدینەی مونەوەرە[2] تەنانەت تا ئاستێ ڕۆیشت کە فیکرەی دەستاودەست پێ کردنی شوێنە پیرۆزەکانی کرد (تدويل الأماكن المقدسة)[3]،

---

(١) یاداشتێکی بڵاو کردەوە لە ڕێکەوتی ٢٢ سەفەری ١٣٤٣ _ ١٩٢٤ کە تیایدا پەیمان بە موسڵمانان و دانیشتووانی حیجاز دەدات بە تایبەتی کە حیجازو مەککە بۆ موسڵمانان بێت بە گشتی و کاروباری حەڕەمەین بە ڕاوێژ بێت لە نێوان موسڵمانا دا.وتی من بریکاری موسڵمانانم لە وەدەر نانی هاشمیەکان بۆ ئەوەی بە ئازادی چارەنووسی مەککە دیاری بکرێ. کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٥٣٦ _ ٥٣٧.

(٢) کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٥١٦.

(٣)ئەو وتەیەی ئیبن سعود کە بۆ دانیشتووانی حیجازی کرد: " مەککە موڵکی هەموو موسڵمانانە، ئیدارە کردنی و ڕێکخستنی پێویستە بەپێی ویستی جیهانی ئیسلامی بێت... ئێمە لەوێدا دەگەین بە دەستەو کۆمەڵە هاتووەکانی جیهانی ئیسلامی و دیدو بۆچوونیان لەگەڵ ئاڵوگۆڕ دەکەین لەبارەی گشت ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی ماڵی خوا دوور بێ لە ئارەزوو و هەوەسی سیاسی. حیجاز کراوە دەبێت بەڕووی هەموو ئەو تاك و کۆمەڵانەی دەیانەوێ کاری چاکە بکەن " ئەو وتەیەی ئیبن سعود لە وەڵامی بروسکەی حیزبی نیشتمانی حیجازی: " ئێمە ئارەزوومان نیە

سەرباری ئەوەی ئیبن سعود ئەو پەیمانانەی بەکاردەهێنا بۆ توووند کردنی پێگەی حوکمەکەی و خۆش کردن و ئاسان کردنی کۆسپەکانی بەردەم داگیر کردنی گشت ناوچە و شارەکانی تری حیجازی، بەڵام ئیبن سعود مەترسی (ئیخوانی) وروژاند ئەو کەسانەی کە تێکگیرانیان دەبینی لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ حیجازییەکان وەك موسڵمانان و سیفەتەکانی هاوبەشدانان و کوفر کە پێشتر دەری دەبڕی[1] و تێگەیشتن لەو بانگەوازەی ئیبن سعود دەیکرد بۆ بەستنی کۆنگرەی ئیسلامی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حەرەمەین (مەککەی پیرۆزو مەدینەی مونەوەرە) [2]، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئەوە دابەزین و چۆکدادانە بۆ بێ باوەڕ و هاوبەشدانەران[3] هەستی (ئیخوان) زیاتر توووند و تاڵ بوو کاتێ ئیبن سعود داواکاری سەرکردەکانیان فەیصەڵی دوەیش و سوڵتانی کوڕی حەمیدی بیجادی ڕەتکردەوە بەوەی کە سەرکردە ناوبراوەکان حیجازیان بە دەستمایەی جەنگ دەزانی و داوایان کرد کە یەکێکیان بکرێتە ئەمیری مەککە و ئەویتریش بکرێتە ئەمیری مەدینە[4].

---

لەوەی حیجاز بکەینە موڵکی خۆمان یان بەسەریدا زاڵ ببین، بۆیە بۆ جیهانی ئیسلامی بەجێی دەهێڵین ". کشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٥٢٥ _ ٥٢٦.

(١) كشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٦٢٠.

(٢) عەبدولعەزیزی کوڕی سعود لە کاتی داگیر کردنی حیجاز دا بۆ چەند ئامانجێکی تەکتیکی دروشمی کۆنگرەی ئیسلامی هەڵگرت و دواتر لێی پەشیمان بووەوەو ڕەتی کردەوە، هەروەك پرۆژەی تاوتوێ کردنی کۆنگرەی ئیسلامی بۆ بابەتە سیاسیەکان یان بەژداربوون لە کاروباری ناوەخۆی حیجاز ڕەت کردەوە./ كشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلام ٦١٣.

(٣) كشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٥٢٥ _ ٥٢٦.

(٤) كشك: محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٦٢٢.

دەكرێ ئیبن سعود هەوڵی دابێ بۆ ئارام كردنەوەی جیهانی ئیسلامی و چاودێری كردنی بە شێوەیەكی میان ڕەو یان ملكەچی گوشاری هاوپەیمانەكانی ئینگلیز بێت ئەوانەی كە نەیان دەویست ڕێڕەو تیۆری وەهابیە توندڕەوەكەی جێبەجێ بكات لە حیجازدا[1]. بەڵام هەڵسوكەوت ڕەفتاری ئیبن سعود لەگەڵ دانیشتووانی حیجازدا هەروەك دیارە ئەوا پاشگەزبوونەوەی پێوەدیارە لە وەهابیەت، تەنانەت خۆی دەنوێنێ لە بڕیارێكی كەسی كە ئەو جەنگاوەرانەی بە شمشێرەكانی ئەو هەرێمەیان ڕزگار كردبوو هیچ ڕۆڵێكیان تێدا نەبووە.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كامە لایەن ڕاستە، ئەوا ئەوەی سەرنج ڕاكێشە بریتیە لە چۆنیەتی دەركردنی بڕیار لە ناو بزوتنەوەی وەهابیدا و خۆسەپاندنی ئیمام و بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی گەڕانەوە بۆ دوواوە بەبێ ڕێگەدان بەوەی یەكێك نارازی بێ.

(ئیخوان) ئەو كارەی ئیبن سعودیان بەناپەسەند زانی كە ڕێی بەوان نەدا، لەسەر جیهاد بەردەوام بن دژبە "بێ باوەڕان" لە ناوچەكانی دەوروبەردا وەك:(عێراق و نوردن و كوەیت)، لە مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٢٦ز لەو شوێنەی كۆچیان بۆ دەكرد (الأرطاوية) كۆبوونەوەیەكیان گرێدا و جەختیان كردەوە لەسەر ئەوەی حەزیان لەوەیە كە جەنگ بەردەوام بێت، تەنانەت پێیان شتێكی نامۆ بوو كە چۆن ئیبن سعود بازرگانی لەگەڵ كوەیت دەكات، چونكە

(١) محمد جلال كشك دەڵێت كە (لۆرانس) هۆشدارییەكی بەریتانی ئاراستەی ئیبن سعود كرد بەو وتەیەی؛ ئەگەر ئیبن سعود وەهابیەت فڕێدەدات و پشت گوێی بخات ئەوا ئێمە پێشوازی لێدەكەین لە داگیر كردنی حیجازدا، بەڵام ئەگەر ئەو دەیەوێت هەر لەسەر وەهابیەت بمێنێتەوە، ئەوا ئێمە موسڵمانانی هیندی دێنین بۆ ئەوەی وڵاتی حەرەمەینی لێ پاك بكەنەوە، ئەگەر ئیبن سعود هەر سوربوو لەسەر وەهابیەت. السعوديون و الحل الاسلامي ٤٩٦.

دانیشتووانەکەی کومیت _ هەروەك ئیخوانەکان بۆی دەچوون _ یان بێ باوەڕن کە جەنگ لەگەڵ کردنیان پێویستە یانیش موسڵمانن دانیشتووانەکە موسڵمانن و حوکمڕان نابێ ڕێگری بکات لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیاندا[1] و ئەو ڕەخنەشیان لە ئیبن سعود گرت کە ڕێگە بە هۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوردن و عێراقی (بێ باوەڕ) دەدات ئاژەڵەکانیان بلەوەڕێنن لە وڵاتی موسڵمانان دا. هەروەك ئەو نەرمی و لێبوردەییەی ئیبن سعودیان بەخراپ زانی لە

---

(١) بابەتی سەفەر کردن بۆ وڵاتی "هاوبەشدانەران"ی کومیت یەکێك بوو لە ڕەخنەکانی (ئیخوان) کە لە ئیبن سعودیان دەگرت، تەنانەت شێخەکانیان تۆمەتبار کرد بەوەی بڕیارە بەناوبانگەکەی وەهابیان شکاندووە کە سەفەر کردن بۆ وڵاتی هاوبەشدنەران بە حەرام دادەنێت، کەچی شێخەکان بە حەڵاڵیان داناوە، بەڵام بۆ (ئیخوان)یان بە حەرام دەزانی کە سەفەر بکەن و بازرگانی بکەن لە کومیت. (ابن سحمان، منهاج أهل الحق ٨٦) ئەو تۆمەتە ترسناك بوو بۆ شێخەکانی وەهابی کە زۆر بەخێرایی وەڵامیان دایەوەو بەرگریان لەخۆ کرد و جەختیان کردەوە لەسەر "حەرام بوونی سەفەر بۆ وڵاتی هاوبەشدانەران". (هەمان سەرچاوە، لا ١٠٢) شێخ سولەیمانی کوڕی سەحمان هەوڵی داوە تۆمەتی بەحەڵاڵ دانانی سەفەر بۆ وڵاتی هاوبەشدانەران لەسەر خۆی لاببات، بەو وتەیەی: "ئەگەر مەبەستی ئەوانەی ئەو گومانانە دروست دەکەن بۆ موسڵمانان؛ سەفەر کردن بێت بۆ شاری ئەحساء پاش دەرچوونی ئیمامی دەوڵەتی بێ باوەڕی (تورکەکان) ئەوا بێ گومان شتێکی دروستە چونکە بووەتە خانەی ئیسلام، پاش ئەوەی خانەی کوفر بوو، بەهۆی جێبەجێ بوونی یاساکانی ئیسلام لەسەر دانیشتووانەکەی و زاڵ بوون و سەرکەوتنی موسڵمانان تیایدا بەسەر ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون بە ئاشکرا "رافضة"کان و جگەلەوانیش، هەروەك زانایان دواوون بەدەق لەپێشان و ئێستاش لەسەر ئەمە... ئەگەر مەستیان ئەوە بێت کە شێخەکان بە دروستی دەزانن سەفەر کردن بۆ ئەحساء و کومیت لە کاتێ کە بێ باوەڕان دەسەڵاتی ئەو شوێنانەیان لە دەست بوو، ئەوا شتێکی زانراوە: کە شێخەکان زۆر بە توندی ئەو سەفەرەیان حەرام کردووە، تەنانەت لەلایان لە گەورە گوناهەکانە و سەفەر بۆ ئەو شوێنانە بە حەڵاڵ نازانن "(هەمان سەرچاوە ١٠١ _ ١٠٢).

بەرامبەردا شیعە لە ناوچەی ڕۆژهەڵات کە بە بۆچوونی ئەوان پێویست بوو بە زەبری هێز بکرێنە موسڵمان ئەگەرنا دەریان بکەن لە وڵات.

چەند بابەتێکی لاوەکی تریان خستە بەرباس و خواس لە کۆبوونەوەکەیان دا وەك هەڵسانی عەبدولعەزیز بە ڕەوانەکردنی کوڕەکەی بۆ میسر "قەڵای کوفر". ناردنی کوڕەکەی تری بۆ لەندەن و هێنانی ئامێری تەلەفۆن و تەلەغراف بۆ حیجاز[1] بەڵام ئەو بابەتە سەرەکیەی کە خەیاڵی ئەوانی سەرقاڵ سەرقاڵ کردبوو ئەوەبووکە بۆچی ڕێگریان لێدەکرێ لەوەی جەنگ بەردەوام بێت، هەر ئەمەش بوو کە سەرکردەکەیان (فەیصەڵی دوەیش) لە پەیامێکدا بۆ عەبدولعەزیزی کوڕی سعود سەرسوڕمانی خۆی لەبارەی دەربڕیوە، هەروەك وتویەتی: " ڕێگریت لێکردم لەوەی بجەنگم لەگەڵ دەشتەکیەکان، بەوشێوەیە ئێمە موسڵمانین تا جەنگ بکەین لەگەڵ بێ باوەڕان دا و دەشتەکیش نین تا هەندێکمان بەسەر هەندێکی تردا بدەین و بژین بەو شتانەی دەبنە دەستمایە

---

(١) موفتی گەورە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدوڵەتیف و زانا هاوەڵەکانی لە پەیامێکدا ناڕەزایی خۆیان دەربڕی بۆ عەبدولعەزیز لەسەر بەکارهێنانی تەلەغراف، موفتی و هاوەڵانی لەو بارەوە ووتیان: " دانانی ئامێری بروسکە ناردن (البرقیات) لە (ریاض) و لە ناوچەکانی تری نەجد و ئەو دەرئەنجامانەی لێیەوە دروست دەبن ئەوا ئێمە بە دروستی نازانین و فەتوای ڕەوایی بەکارهێنانی نادەین و پەنادەگرین بەخوا لەوەی فەتوای ڕەوایی شتێ بدەین کە خراپەی لێ بپشکوێتەوە .... ئەوەی پاڵ بە دانەری ئەو ئامێرانەوە دەنێت بۆ دانانی لە ناوچەکانی نەجد تەنها کوفرە تا ئەو بانگەوازە ئیسلامیە هەڵوەشێنێتەوە و دووبارە پڕوپوچی باتیڵ بگەڕێنێتەوە نەجد بەشێوەیەکی گەورەتر لەوەی پێشتر هەبووە ... پێغەمبەر ~ فەرموویەتی:(دوو دین لە دوورگەی عەرەبدا کۆ نابنەوە) ". ٧ شەوال ١٣٣٩ك/ ١٩٢٠ . (التویجری، عبدالعزیز: لسراە اللیل هتف الصباح ٢٧٣).

کە هەر یەکێ لەئێمە لەوەی تری دەست دەکەوێ، ڕێگریت لەئێمە کرد لە دین و دونیاماندا "[1].

قەدەغە کردن و ڕێگری کردنی ئیبن سعود لەوەی وەهابی دەشتەکیەکان (ئیخوان) بەردەوامی بدەن بە جەنگ (یان بەپێی زاراوەی ئەوان جیهاد) ئەوا ئەوانی خستە ناو تەنگانەو کێشەیەکی گەورەوە، چونکە یان دەبێت پابەندی بڕیاری ئیبن سعود بووبان و چاوەڕێی مردنیان بکردایە لە برسان و لە بیابان دا یاخود یاخی ببن و دەربچن لە بڕیاری ئیبن سعود و بەردەوامی بدەن بە (جیهاد) سەرکەوتن و دەستخستنی دەستکەوتەکان. وە هەر ئەوەشیان کرد کاتێ لە کۆنگرەکەیاندا بڕیاریاندا کە بەردەوام بن لەسەر پرۆسە سەربازییەکانیان دژ بە هۆزە عەرەبیە "بێ باوەڕەکان"ی باکوری دوورگەی عەرەبی. ئەمەش لەکاتێ دا بوو کە ئیبن سعود هەڵدەستا _ بەپێی پەیماننامەی (دارین) ١٩١٥ و پەیماننامەی (جدة) ساڵی ١٩٢٧ _ بە پاراستنی پەیوەندی دۆستایەتی و ئاشتی لەگەڵ کوەیت و عێراق و ئوردن و بەحرەین و قەتەر و عەمان و ئەنجام نەدانی هیچ هێرشێکی سەربازی چەکدار بۆ سەر موستەعمەرەکانی بەریتانی.

وا بەدەرکەوت کە (ئیخوان) هیچ شتێ لەبارەی ئەو پەیماننامانە نازانن کە ئیبن سعود واژووی لەسەر کردووە لەگەڵ بەریتانیا، ئەو پەیماننامەیەی کە نەخشە ڕێگای جوڵانەوەو "جیهاد" دیاری دەکات. کاتێ ڕووبەڕووی ڕاستی بوونەوە ئەوا قەیرانێکی توند هاتە کایەوە لە نێوان ئەوان و ئیمامەکەیان و پێکدادان لە نێوان هەر دوو کۆمەڵدا ڕوویدا. لەبەرئەوەی سروشتی سیستەمی

---

(١) کشك، محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٦٨٠.

سیاسی سعودی دامەزرابوو لەسەر هێزو زاڵ بوون و خۆسەپاندن و هیچ جۆرێ لە ڕاوێژ و بەشداربوونی سیاسی لەخۆی ناگرێ، ئەوا بەهەر شێوەیەك بێ پێویست بوو ئەوکات (ئیخوان) ملکەچی بڕیاری ئیمامەکەیان بن، جا هەر جۆرە بڕیارێکیش بێت، لەسەر ئیمامەکەیان پێویست بوو کە گفتوگۆ یان پێچ و پەنایان لەگەڵ بکات، وەك: ڕێگە خۆشکەرێ بۆ ئەوەی قەناعەت بەوان بهێنێ سەبارەت بە بڕیارەکەی یان بەسەریاندا بسەپێنێ. بۆ ئەم مەبەستە عەبدولعەزیزی کوڕی سعود کۆبوونەوەیەکی گشتی گرێدا لە (ڕیاز) ساڵی ۱۹۳۷ و سەرکەوتوو بوو لە دەرکردنی فەتوا بە زانایانی ئایین بەوەی ماف و دەسەڵاتی دەرکردنی فەرمانی جیهاد[1] تەنها بەدەستی ئیبن سعودی ئیمام بێت

(۱) شێخ موحەممەدی کوڕ عەبدوڵەتیف و (چواردە زانای تر) لە کۆتایی کۆبوونەوەکە ئەو ڕوونکردنەوەیان دەرکردووە سەبارەت بەهەندێ داواکارییەکانی (ئیخوان) بەتایبەتی ئەو شتەی پەیوەندی بەشیعەوە هەیە، لەو ڕوونکردنەوەدا هاتووە: ".. سەبارەت بە (رافضة)ەکان ئەوا فەتوامان داوە بۆ ئیمام ئیبن سعود کە ناچاریان بکات تا بەیعەتیان لەسەر ئیسلام لێ وەربگرێ و ڕێگریان لێ بکات لەوەی دروشمەکانی دینە پوچەکەیان دەربخەن، لەسەر ئیمام پێویستە کە جێگرو نوێنەرەکەی خۆی لە ئەحساء پابەند بکات بەوەی کە ئەو شیعانە بباتە لای (ئیبن بشر) و بەیعەتی پێبدەن لەسەر دینی خواو پێغەمبەرەکەی و فڕێدانی پاڕانەوە لە پیاوچاکانی ئالوبەیت و فڕێدانی گشت بیدعەتەکانی تر وەك کۆبوونەوەیان بۆ پرسەکان و جگەلەو شتانەی ناوبراو شتانی تریش کە بریتین لە دروشمی دینە پوچەکەیان و ڕێگریان لێ بکات لە سەردان کردنی زیارەتگاکان.

بەهەمان شێوە ئەوان و جگەلەوانیش پابەند بکەن بە ئەنجام دانی پێنج نوێژە فەرزەکان لە مزەگەوتدا و بانگدەر و ئیمام و نوێنەری ئەهلی سوننەیان بۆ دابین بکرێن، پابەندیان بکەن بە فێربوون و خوێندنی (ثلاثة الأصول)، ئەگەر شوێنێکیان هەبێ بۆ ئەنجامدانی بیدعەت ئەوا ڕێگریان لێدەکرێ بەهەمان شێوە پێویستە ڕێگریان لێ بکرێ لە ئەنجامدانی بیدعەت لە مزگەوت و شوێنانی تریش دا و هەر یەکێك ئەو فەتوایانەی قبوڵ نەکرد و جێبەجێ نەرکرد ئەوا شاربەدەر دەکرێ لە وڵاتی موسڵمانان.

و لە یەکێ لە فەتواکانی زانایان دا هاتووە کە: " گەورەترین ئەو شتانەی ئیسلام فەرزو پێویستی کردووە و پێغەمبەریش ~ هێناویەتی بریتیە لە: کۆمەڵ و جەماعەت، پێغەمبەر ~ هەواڵی داوە کە: کەسێ پابەندی کۆمەڵ و جەماعەت نەبێ ئەوا موسڵمان نییە و پابەند بوون بە کۆمەڵ و جەماعەتەوە پێویستی بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری هەیە. خوای گەورە نیعمەتی کردووە بە گەورەیی و بەخشندەیی خۆی بە دانیشتووانی (نەجد) بەوەی ڕێنمویی و هیدایەتی داوون، بەتایبەتی سەرکردەکانیان لە کۆتایی ئەو سەردەمەدا کە نامۆیی ئیسلام زیادبووەو خراپە و تاوان لە وشکانی و دەریادا دەرکەوتووە، جا خوای گەورە بەختێکی چاکی بەتۆ بەخشیوە لە یارمەتی دانیان، کە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە باکور و باشوری نەجد. وە بینیمان کە ئەو شتەی کەم و کورتی و پەرتەوازەیی دەخاتە ناو موسڵمانان و دەوڵەتەکەیان بریتیە لە خۆسەپاندن بەبێ ئیمام، بەوگومانەیان کە خۆسەپاندن بنچینەی جیهادە. نەیانزانی کە حەقیقەتی جیهاد و ئەنجامدانی ئاگربەست و ئاشتەوایی لەگەڵ

---

بەهەمان جۆر (رافضة)ەکانی (قطیف)یش بەهەمان شێوە ئیمامی شێخ ئیبن بشر پێویستە بڕواتە لایان و پابەندیان بکات بەو شتانەی باسمان کرد.

(رافضة)ەکانی عێراقیش ئەوانەی بڵاوبوونەتەوەو تێکەڵ بوونە بە موسڵمانە دەشتەکیەکان ئەوا فەتوامان داوە بۆ ئیمام کە ڕێگەیان نەدات بەوەی بێنە ناو زەوی و لەوەڕگا و پاوانی موسڵمانان. سەبارەت بە جیهاد ئەوا پەیوەستە بە تێڕوانینی ئیمام و پێویستە لەسەری ڕەچاوی چاکترین بەرژەوەندی بکات بۆ ئیسلام و موسڵمانان ".

نووسراوە لە مانگی شەعبان ساڵی ١٣٤٥ = (١٩٢٧/١/١٧).

حاف وهبة: جزيرة العرب في القرن العشرين ٢٣٧. و أنور عبدالله: العلماء و العرش ٤٧١. و التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٣٦٧ _ ٣٦٩.

دوژمن و دەستەبەری کردن و ماف دان بەگشتی و جێبەجێ کردنی یاسا و حدودەکان تایبەت و پەیوەستە بە ئیمامەوەو هیچ یەکێك لە دانیشتوان پەیوەندی پێوە نییە.... کەسێ بۆ خۆی ئاڵایەك هەڵدەدات و کارێ جێبەجێ دەکات بەبێ ڕەزامەندی ئیمام و جێگرەکەی ئەوا ئەو کەسە لەوانە نییە کە جیهاد دەکەن لە پێناوی خوادا. پێویست و واجبە لەسەرت (ئەی عەبدولعەزیز) ئیسلام بپارێزی لەوەی یاری پێ بکرێت و هیچ یەکێ لە دانیشتووانی (الهجر) جیهاد نەکات بەبێ ڕەزامەندی و فەرمانی تۆ ئەگەرچی شوانی وڵاخی سواریش بێت "[1].

بەڵام (ئیخوان) فەتوای ئەو زانایانەی ڕەت کردەوە کە دەیان وت تەنها ئیمام خاوەنی دەرکردنی فەرمانی ڕاگەیاندنی جیهادە، بەوپێیە ئیخوان لە نۆفەمبەری ساڵی ١٩٢٧ز هەڵسان بە هێرش کردنە سەر پاسگە (مخفر)ی عێراقی نزیك سنوری سعودیە و هەموو تاکەکانیان کوشتن و هەندێ لە غەنیمەت و دەستمایەیان بەدەست هێنا کە بووە هۆی ئارەزووی هەموو هۆزە دەشتەکیە برسیەکانی تری جوڵاند کە داوایان لە ئیبن سعود دەکرد بە ڕێگەدان بۆ جیهاد و ڕزگار کردنی عێراق، بەڵام ئیبن سعود هەموو ئەو داواکارییانەی ڕەت کردەوە و یاخی بوونی سەرکردەی ئیخوان (فەیصەڵی دوەیشی) ڕاگەیاند و داینایە ژێر چاودێری زۆرەملێ لە ناوچەی (أرطاوية)[2].

لە بەرامبەر بەردەوامی جەنگەکانی ئیخوان و هەڵکوتانە سەر هۆزەکانی عێراقی و ئوردنی و هێرش کردنە سەر پاسگەی (بصيە)ی عێراق، ئەوا ئیبن

---

(١) التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٣٧٩.

(٢) كشك: محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٦٤١.

سعود تەنها ئەو ڕێگەیەی لەبەردەم دا ما کە بانگی سەرکردەکانی (ئیخوان) و ڕدێن سپی و شێخی هۆزەکان و خاوەن پلەو پایەو زانایانی ئایینی بکات، بۆ کۆنگرەیەك لە (ڕیاض) لە ٦ ی کانونی یەکەم ساڵی ١٩٢٨ کە زیاتر لە ٨٠٠ کەسیان ئامادەبوون، لەو کۆنگرەیەدا ئیبن سعود ئەو دەستکەوت و خزمەت و پلەوپایە و چاکە و مافی خۆی خستەڕوو کە بەسەر ئەوانی دا هەیە و ڕایگەیان کە ئەوان هیچ چاکەیەکیان نییە لە فراوان کردنی شانشینەکەی، تەنانەت هۆزەکانی دژەڕای خۆیشی تۆمەتبار کرد بەوەی هەوڵی پارچە پارچە کردنی شانشینەکەی دەدەن.

بە هەڕەشەوە پێی وتن: " وا مەزانن ئەی ئیخوان ئێوە نرخ و بایەخێکی زۆرتان لەلای ئێمە هەیە.... وامەزانن ئێوە یارمەتی ئێمەتان داوە و ئێمە پێویستمان بەئێوەیە. نرخ و بایەخی ئێوە ئەی ئیخوان لە گوێڕایەڵی خوای گەورە و دواتر لە گوێڕایەڵی ئێمەدایە و ئەگەر ئەو سنورەتان شکاند ئەوا دەچنە ڕیزی ئەوانەی خوای گەورە بە خەشم و قینی خۆی دایگرتوون. جا سوێند بەخوا، لە بیرتان نەچێت هیچ یەکێ لە ئێوە نیە مەگەر باوکی یان براکەی یاخود کوڕە مامی ئەومان سەر نەبڕیبێ و ئێوەمان تەنها بە زەبری شمشێر مکەچ کردووە. شمشێر هێشتا هەر بەدەستی ئێمەوەیە ئەی ئیخوان ئەگەر ڕەچاوی مافەکانی خەڵکی نەکەن. سوێند بەخوا بەو سنور شکاندنەتان هیچ نرخێکتان نییە لەلای ئێمە. ئێوە لەلای ئێمە وەك خۆڵ وان... ئێوە بەخۆشی ملکەچی فەرمانی ئێمە نەبوون بەڵکو بە زۆرەملێ و سوێند بەخوا من بەشمشێر لەگەڵتان هەڵسوکەوت دەکەم کاتێ سنورەکانی خوای گەورە دەشکێنن " و بە ڕاشکاوی پێی وتن: " شانشینی خۆم دامەزراندووە بە

یارمەتی خوای گەورە پاشان بە هێزی بازووەکانم... پێم گەیشتووە کە زۆرێ لە ئێوە ڕازی نین لە من و حکومەتەکەم، بەڵام من لەو کەسانە نیم کە بە گوشارو زەبرو زەنگ و هێز واز لە تەختی حوکمڕانی دێنن... "[1].

پاش مشتومڕێکی زۆر پاشا پێی گوتن: _ چیتان دەوێت؟ دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بەوان کرد و وتی: " من ئامادەم کە بێمە خوار لە کورسی حوکمڕانی و وازبێنم لە هەموو دەسەڵاتەکانی خۆم بۆ هەر کەسێ کە ئێوە لە جێگای من هەڵی دەبژێرن ". بانگی کردن " حوکمڕانی و ئیمامێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن کە کاری ئەوان بەپێی ڕەزامەندی خۆیان و نەخشەی ئەوان کار بکات " دواتر هەر داڕوخان و پەشێوییەك دروست بێت ئەوا سەرزەنشت و توانجەکە بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە نەوەك ئیمامە هەڵبژێردراوەکە[2].

وادیارە کە دەست لەکار کێشانەوەکە زیاتر شتێکی شانۆگەری و نمایشکاری بووە نەوەك دەست لەکار کێشانەوەیەکی ڕاستەقینە، بەڵکو مەبەست لێی بەدەست هێنانی پشتیوانی ئامادەبووانە بۆ سیاسەتەکەی خۆی و بەناپەسەند دانانی هەڵوێستی سەرکردەکانی (ئیخوانە)[3]. لەو کاتەی کە ئەوە دادەنرێ بە قەیرانێکی قوڵ و توند لەهەمبەر پەیوەندی ئیبن سعود و هێزی وەهابی

---

(١) القطاني: فهد: صراع الأجنحة في العائلة السعودية ٢٧٨.

(٢) عبدالله، أنور: العلماء والعرش ٢٦١ _ ٢٦٣.

(٣) ئەمەش لەبەر ئەوەی ئیبن سعود پێشتر بە ئیخوانی وتبو لە بەرواری ١٩٢٨/١٠/١٩: " شانشینی خۆم دامەزراندووە بە یارمەتی خوای گەورە پاشان بە هێزی بازووەکانم... پێم گەیشتووە کە زۆرێ لە ئێوە ڕازی نین لە من و حکومەتەکەم، بەڵان من لەو کەسانە نیم کە بە گوشارو زەبرو زەنگ و هێز واز لە تەختی حوکمڕانی دێنن... " . القطاني: فهد: صراع الأجنحة في العائلة السعودية ٢٧٨.

(ئیخوان) و سەرنەکەوتنی ئیبن سعود بۆ گونجاندنی سیاسەتەکانی و دروشمەکانی (ئیخوان)ی وەهابی. بۆیە کۆبوونەوەکە تەواو بوو بە کشانەوەی (ئیخوان) و بەردەوام بوونیان لەسەر هەڵوێستە یاخییەکەیان و ڕایانگەیاند کە پێویستە گشتیان ئامادە بکرێن، سوربوونی خۆیان ڕاگەیاند لەسەر هێرش کردن بۆ سەر عێراق جا ئیبن سعود ڕازی بێت یان نا.

پاشان هێرشیان کردە سەر هۆزی (مالك)ی عێراقی لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢١ یەنایەری ١٩٢٩ز و کوشت و بڕو تاڵانێکی زۆریان کرد[١].

بەڵام ئیبن سعود بڕیاری ئەوانی زۆر بەتووندی ڕەتکردەوە، تەنانەت دەستی کرد بە بەندکردنی هەندێ لە سەرکردەکانیان، فەرمانیشی دەرکرد کە ئەوەی بەتاڵانیان هێناوە لە جەنگەکانیان دا ئەوا بیگێڕنەوە بۆ لادێیە عێراقییەکان، ئەم کارەی ئیبن سعود بە دڵی (ئیخوان) نەبوو[٢] و هەڵسان بە کۆمەڵێ پڕوپاگەندەی فراوان دژبە ئیبن سعود، بەوەی کە ڕازی بوونی ئیبن سعود بە هەبوونی پازگە لەسەر سنورەکانی عێراق بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مافی وڵاتەکەی فرۆشتوە بە بەریتانیەکان[٣] و " ئیمامەکەیان بووتە ئامرازێ لە دەستی ئینگلیزەکان[٤] تەنانەت ئەو هەستەشیان بۆ دروست بوو کە " ئیبن سعود دونیای دەوێت و دۆستایەتی ئەوانە دەکات کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن "[٥].

---

(١) کشك، محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٦٤٣.

(٢) ديكسون: الكويت و جاراتها ٢٩٥/١.

(٣) ديكسون: الكويت و جاراتها ٢٩٦/١.

(٤) ديكسون: الكويت و جاراتها ٣٠٧/١.

(٥) کشك، محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٦٤٥_٦٤٧.

له بڕیارەکەی ئیبن سعود کە داوای دەکرد بە گەڕاندنەوەی دەستمایەکانی جەنگ ئەوا تێکگیرانێکی ئاشکرایان دەبینی لەگەڵ بنەماکانی وەهابیەت، بەڕاشکاوانەش بە ئیبن سعودیان وت: " تۆ وەك ئیمام بانگەشەت دەکرد بۆ جیهاد دژ بە بێ باوەڕو هاوبەشدانەرەکان، چەندین جار ڕات گەیاندووە و دووپاتت کردۆتەوە کە عێراق وەك دەوڵەتێکی شیعی دەبێت بڕوخێنرێت و هەرچی لە دانیشتووانەکەی بسەنرێت حەڵاڵە، چەندین جار فەرمایشتی قورئانی پیرۆزت دووپات کردۆتەوە کە هەر کارێ بڕواداران پێی هەڵدەستن دژبە بێ باوەڕو هاوبەشدانەران ئەوا پێویستە پاداشت بدرێن لەسەری، ئێستاش بە فەرمانی ئینگلیزە بێ باوەڕەکان داوا لەئێمەی سوارچاکی خۆت دەکەی کە هەڵبژێردراو و شمشێری ئیسلامین بە گەڕاندنەوەی ئەو شتانەی بردوومانە چونکە تۆ ئەو کارەی ئێمە بە هەل دەزانیت، جا یان تۆ دەجاڵێکی دووڕووی خۆت خۆشدەوێ و بەدوای بەرژەوەندی خۆتەوەی یاخود قورئانی پیرۆز پەرتوکێکی ناڕاستە "[1].

وەك چارەسەرێکی ئەو فەیرانە داوایان کرد کە شەریعەت ببێتە دادوەر تا سەرەدەریەك لە مەسەلەکەدا بکەن، ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی ترس لە دڵی عەبدولعەزیزی کوڕی سعود، چونکە دەیزانی کە لە ڕاستی دا خۆی دەرچووە لە بنەماکانی وەهابیەت ئەو بنەمایانەی کە هەمیشە هاندەری ئەوەن کە بەردەوامی بدرێ بە جیهاد دژبە " بێ باوەڕان و هاوبەشدانەران " خوێن و ماڵ سەروەتیان حەڵاڵ دەکات. بەڕاستی ئیبن سعود لە کێشەیەکی گەورەدا بوو جا یان ئەوەتا دان دەنێ بۆ سەربازەکانی کە ئەو دروشمە وەهابیانەی خۆی

---

(١) دیکسون: الکویت و جاراتها ٣٦٤/١.

تەنها چاوبەستن و شتێکی کاتی بووە بە مەبەستی قۆستنەوەی هەلەکە بووە یاخود ئیبن سعود وەڵامی داواکاری ئەوان دەداتەوەو لەگەڵ ئەواندا دەڕوات. لەبەر ئەوەی هاوپەیمانی ئیبن سعود لەگەڵ بەریتانیا بەهێزتر بوو لە پابەندبوونی بە دروشمەکانی وەهابیەت، ئەوا پێویست بوو لەسەری کە ڕایەخی وەهابیەت بپێچێتەوەو زاڵ بێت بەسەر (ئیخوان) دا و هەموو گفتوگۆیەك ڕەت بکاتەوە. سروشتی سیاسی سعودی خۆسەپێنە ڕەهاکە یارمەتی دەری ئیبن سعود بوو، بۆیە پەیامێکی نووسی بۆ شێخ (عەبدوڵای کوڕی عەبدولعەزیزی عەنقری) کە وەك ڕۆڵی ناوبژی کاری دەبینی لەنێوان ئیبن سعود و (ئیخوان)ی یاخی بوو، لە بەرواری ١٦ شەوالی ١٣٤٧ (١٩٢٨) لەو پەیامەدا ئیبن سعود هەموو جۆرە ئاشتبوونەوەیەکی ڕەت کردەوەو داوای لێ کردن کە ملکەچ بن و خۆیان بەدەستەوە بدەن: " .. من ئەوە بەجێدەگەیەنم کە خوای گەورە سەبارەت بەوان فەرزی کردووە لەسەر من و تۆش دانت پێدا ناوە. ئەوەی خوای گەورە لەسەر منی فەرز کردووە لە مافی حوکمڕانی بریتیە لەوەی کە دەبێ گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریم بکرێ و ململانێم لەگەڵ نەکرێ، ئەوەی خوای گەورە فەرزی کردووە کە دەبێت مافەکانی موسڵمانان پێیان بدرێت لە ماڵ و سامان و خزمەتکارو ئەوەی ستەمی لێ کراوە و شتی تریش کە خوای گەورە حەڕامی کردووە لەسەر موسڵمانان... قبوڵ کردنی شت لە زانایانی موسڵمانان و نەجوڵانەوە پێچەوانەی قسەی ئەوان و جێبەجێ کردنی ئامۆژگارییەکانیان و خۆ هەڵ نەقوڕتاندن لە کاروباری حوکمڕانی و کاروباری موسڵمانان کە دەبێتە هۆی تێکدانی نێوان موسڵمانان و موسڵمانان دژبە حوکمڕان دەووروژێنێ، پەیوەندیان ئاڵۆز دەکات، جگەلەوەی باسیش کرا لە

گشت شتەکانی تردا کە شەریعەت پێی ڕازی نییە و ئەوانیش مافیان تێدا نییە، جا ئەگەر ئیخوان بەو مەرجانە ڕەزامەنیان دەربڕی ئەوا منیش لێیان ڕازی دەبم و خوێن و ماڵ و شەرەفیان دەپارێزم لەپێناوی خوادا... تەنها کاردەکەم بەپێی شەریعەت "[1].

ئالێرەدا پیاوانی ئایینی وەهابی ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە پشتیوانی کردنی دەسەڵاتی ئیبن سعود و سەپاندنی گوێڕپەڵی کردن بەسەر (ئیخوان) دا و ڕەت کردنەوەی بنەمای ناڕازی بوون یان بەژداربوون لە کاروباری سیاسی، شێخ عەبدولعەزیز عەنقەرری پەیامێکی ڕەوانەکرد بۆ گشت (ئیخوان)، لەو پەیامەدا هاتووە: " زانراوە لاتان کە: خوای گەورە نیعمەتی کرد بە دانیشتووانی نەجد بەهۆی بانگەوازی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب و ئالی سعودیش لەو بانگەوازەدا یارمەتی شێخ موحەمەدیان داو ئەو بانگەوازە ئیسلامیەیان سەرخست، هەر کاتێ ئەو بانگەوازە لاواز بوو ئەوا خوای گەورە کەسێ لەوان دەنێرێ بۆ ئەوەی زیندوو و نوێی بکاتەوە. لە گەورەترین ئەو کەسانەی هەڵسان بە زیندوو کردنەوەی ئەو بانگەوازە لەو سەردەمەدا: ئیمام عەبدولعەزیزە، لەکاتێ کە ئارەزو پەرست و بیدعەت زۆر بووەو زۆربەی خەڵکی سەر زەوی تووشی هاوبەشدانان بوونە. بۆیە ئیبن سعود مافی بەسەر ئێمەو ئێوەو گشت موسڵماناندا هەیە کە پێویستە لەبەرچاو بگیرێت، جا گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بۆ حوکمڕانان لە گەورەترین جۆرەکانی بەندایەتیە بۆ خوا و دژایەتی و ململانێ کردن لەگەڵیان دا لەسەر حوکمڕانی و پەرتەوازە کردنی ڕیزی موسڵمانان لە گەورەترین جۆرەکانی تاوان و

---

(١) التويجري، عبدالعزيز، لسراة الليل هتف الصباح ٢١٣.

خراپەیە لەسەر زەوی، پێغەمبەر ~ فەرمانی داوە بە ملکەچ بوون بۆ حوکمڕانان و ڕێگری کردووە لە دژ وەستان و فەرمان شکاندنیان و فەرموویەتی:(گوێڕایەڵ و فەرمابەرداری ئەمیرەکەت بە ئەگەر ماڵی تۆی برد و لە پشتی دایت)، کاتێ پێغەمبەر ~ باسی حوکمڕان و ئەمیرە خراپەکارەکانی کرد ئەوا هەندێ لە هاوەڵان وتیان: ئایا جەنگیان لەگەڵ نەکەین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نا، تا نوێژ لەناوتاندا بەرپا دەکات. کەچی سوپاس بۆ خوا ئیمامەکەتان پابەندی شەریعەتی بێ هاوتایە و تووندو تۆڵە لە سەرخستنی دیندا؟ دروست نییە بۆ هیچ یەکێك دژی بڕیارێکی بوەستێتەوە و پشت لەو حوکمڕانیەی بکات کە خوای گەورە پێی بەخشیوە "[1].

هەشت لە گەورە زانایان[2] ڕەتیان کردەوە کە دەرگای ڕەخنە و نارەزایی سیاسی بکرێتەوە لەناوەوەی بزوتنەوەی وەهابیەت دا و ئەو زانایانە چوونە پاڵ ئیبن سعود لە ململانێکەیدا لەگەڵ (ئیخوان) دا، جا وتیان: " ئەگەر دەرگای ڕەخنەو توانج گرتن لە حوکمڕانی و خاوەن دەسەڵات کرایەوە بە چەند هۆیەك کە پێی ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و ڕەخنە لێگرتنی پێویست ناکات، بەڵکو سیستەمەکە بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان بێنێتە کایە و ڕێگەی خراپەکان بگرێ، بە کرانەوەی دەرگای ڕەخنە ئەوا دەرگای خراپەو تاوان دەکرێتەوەو فیتنە بەرپا دەبێت کە هەر ئەمەشە ئامانجی بێ

---

(١) التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٣٢٩.

(٢) ئەو زاناینە بریتی بوون لەمانە: شێخ عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵەتیف و حەسەنی کوڕی حوسەین و سەعدی کوڕی حەمدی کوڕی عەتیق و سولەیمانی کوڕی سەحمان و صاڵحی کوڕی عەبدولعەزیز و عەبدوڵلای کوڕی حەسەن و عەبدوڕەحمانی کوڕی سالم و عەبدوڵای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەتیق.

باوەڕان کە بریتیە لە پەرت کردنی ڕیزی موسڵمانان و دوژمنان تەنها لەو ڕێگەیەوە دەتوانن دەست بوەشێنن لە دین.

ئێمە لە نامۆیی داین، هەروەك ئیبنو قەیم کە لە سەدەی حەوتەمی ئیسلام بوو وتی: ئێمە لەو سەردەمەماندا نامۆترین لە سەردەمی پێغەمبەر ~ کاتێ بە عومەری کوڕی عەنبەسەی فەرموو: کێ لەگەڵت دایە؟ ئەویش وتی: کەسێکی ئازاد و کۆیلەو بەندەیەك. جا چ دەڵێی سەبارەت بەو سەردەمەی خۆمان؟ نامۆیی زیاتر بووەو بەرچاوڕوونی کەم بووەو هێز لاواز بووەو کەسی هەرچی و پەرچی دەدوێت لە کاروباری گشتی خەڵك و بووە بە دەم ڕاستیان، بەرچاو ڕوونی کەم بوو لە دینی خوای گەورە، زانینی ئەوەی کە دروستە و ئەوەی کە قەدەغە کراوە لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە خوای گەورە کاروباری موسڵمانانی پێ سپاردووە "[1].

پەیوەندی ئیبن سعود لەگەڵ (ئیخوان) لەسەر ڕاوێژ و ڕەزامەندی و هەڵبژاردن دانەمەزرابوو، بەڵکو _ هەروەك دیارە _ لەسەر بنەمای هێزو توندوتیژی دامەزرابوو، ئیبن سعود لەبارەی ئەو تێڕەوانینەی دەڵێت: " خێڵەکیەکان لەو شمشێرە ناگەن. ئەگەرنا ئەوان لەسەر پشتی حکومەت سوار دەبن و ڕێشمەی دەگرن و وڵاتیش لە لێواری ڕووخاندایە... شمشێر ناودار بکەن ئەوا ئەو خێڵەکیانە دەترسێن و ئەدەب وەردەگرن "[2].

---

(١) التويجري، عبدالعزيز، لسراة الليل هتف الصباح ٢٨٧ _ ٢٩٣.

(٢) القطاني، فهد، صراع الأجنحة في العائلة السعودية ٣٧٨، له، أمين الريحاني، ملوك العرب ٥٥٥.

## زاڵ بوون بەسەر بزوتنەوەی وەهابی لە ڕووی فیکری و دینی

لە هەنگاوێکی گرنگدا لە پێناو زاڵ بوون بەسەر (ئیخوان) دا ئەوا عەبدولعەزیزی کوڕی سعود هەڵسا بە سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر بزوتنەوەی وەهابی لە ڕووی فیکری و دینی، ئەمەش بە پابەند کردنی جوڵانەوەی زانا ناڕازیەکان و سەپاندنی دەسەڵاتی زانایانی پاشکۆو پشتگیرانی خۆی بەسەر ئەواندا، بۆ ئەم مەبەستە چووە (الأرطاوية) و ئیمامی مزگەوتەکەی لابرد کە ناڕازی بوو، چەندین کەسی گوێڕایەڵی[1] ئیخوانی تەمبێ کرد و سزادا و فەرمانێکی دەرکرد کە قەدەغەی کرد لە ناوچەی (الهجر) پێشوازی لە هیچ کەسێ بکرێت جگەلە کادیری فەرمی. وازی لەو کەسانەی تر هێنا کە لەلای ئەوان بوون[2] و پەیامێکی ڕەوانەکرد بۆ دانیشتووانی (قوسەیم) تیایدا هاتووە: " هەواڵمان پێ گەیشتووە لە بارەی کەسانێ کە بانگەشەی ئەوە دەکەن شوێنکەوتووی (شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب)ن کەچی چەند کارێك دەکەن دژی بۆچوونەکانی شێخ موحەممەدن، ئەویش بریتیە لەوەی بەبێ ئەوەی زانیاریان هەبێت فەتوا دەردەکەن و حوکمی تەکفیر و گومڕایی دەردەکەن، نەوەك هەر ئەمە بەڵکو بە نەزانی و پێچەوانەی بەڵگە ئەم کارانە دەکەن و دەقەکان تەئویل دەکەن کە ئەم تەئویلە هەڵناگرن، تێدەکۆشن لە پێناو تێکدانی یەکڕیزی موسڵمانان و دەدوێن لە جیاتی کەسانێ کە زانایانی

---

(١) التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٢٥٤.

(٢) التويجري: لسراة الليل ٣٩٨.

موسڵمانان بە شایەنی نازانن یارمەتی بدرێن... بەویستی خوا ئێمە پشتیوانی ئەو کەسەین کە بانگەوازی دەکات بۆ ئەو شتانەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بانگەوازی بۆ کردووە، هەڵدەستین بەو ئەرکەی کە باپیرانمان پێی هەڵساون کە پشتی شێخ موحەممەدیان گرت. هەر کەسێ بە زیاد ڕەوی یان بە کەم ڕەوی پێچەوانەی ئەمە جوڵایەوە ئەوسا تەنها با سەرکۆنەو لۆمەی خۆی بکات. سوێند بەخوا و سوێند بەخوا بەشێوەیەك ئەو کەسانەی ئاژاوەچین تەمبێ و بە ئەدەب دەکەم کە سەرەتا و کۆتایی خەڵکی ئەدەبی لێ وەربگرن، هەر کەسێ ئاگادار کرایەوە ئەوا پاساوی نەماوەو بەڵگەی لەسەر بەرپا کراوە "[1].

پاشان ئیبن سعود پەیامێکی گشتی نارد بۆ تێکڕای (ئیخوان) و بە توندی هەڕەشەی لێکردن و پێی وتن: " ئێوە ئەی براکانمان نەزانینی زیادتان لەگەڵە... ئەگەر مەبەستان گەڕانە بەدوای زاڵ بوون و پایەبەرزی بە زەویدا ئەوا هیچ هێزو توانایەك نیە مەگەر بەویستی خوای گەورە نەبێت. ئەویش بریتیە لەوەی ئێمە ڕێگریمان لێکردن لە نزیك بوونەوە لە هەندێ لەو کەسانەی کە بانگەشەکارن و دێنە لاتان و سەرتان لێ تێکدەدەن، دەکرێ هەندێکیان ئێوە لە دین دەربهێنن و بکەونە ناو خراپەیەکی گەورەتر لەوەی پێشتر لەسەری بوون لە زیادەڕەوی و توند ڕەوی، لێکدانەوەی ئایەت و بەستنەوەی بەشتێ کە خوای گەورە بۆ ئەوەی دانەبەزاندووە، بە ڕاستی ئەمە شتێکی زۆر گەورەیە. جا ئەوانەی دێنە لاتان وەك ئەوانەن کە لە فەرمووددا هاتووە: لەوانەیە گەلانێ بێن و ڕفتان لە نوێژی خۆتان ببێتەوە لە چاو نوێژی

---

(١) التويجري: لسراة الليل ٣٨٨.

ئەوان و پەرستشی خۆتان پێ هیچ نەبێ لە ئاست پەرستشی ئەوان، کەچی لە دین دەردەچن هەروەك تیر لەکەوانەکەی دەردەچێت، جا ئەوانە بکوژن لە هەر شوێنێ بن. لە ڕاستی دا: هەندێ لەو خۆ بەخشانە وەك ئەوانەن کە لە فەرموودەکەدا هاتوون و سوپاس بۆ خوا ئێمە سەبارەت بە دینی خۆمان لە گومان دا نین... بەڵام ئەو کەسەی کە وا دەزانێت تەنها ئەو لەسەر دینە یان ئەو بۆچوونانەی خۆی پێی گەیشتووە تەنها ئەوە دینە و تەنها کەسانێ لاساییکەرەوەو موقەلیدن کە گومانیان هەبێ و زیاد ڕۆچوو بێت جا ئێمە پەنا دەگرین لەو کەسە و بەڕاستی ئەو لە ئەستۆی ئێمەو موسڵماناندا نیە، تەنانەت دینداری دەکەین بەوەی جیهاد کردن لەگەڵ ئەو کەسەدا.

داواتان لێ دەکەین کە خۆتان دوور بگرن لە سێ شت: یەکەم: پرسیار مەکەن و فەرمانی هیچ زانست خوازێ جێبەجێ نەکەن مەگەر دوای پرسیار کردن بێ لە ئێمە و ئێمەش ئەوەی بۆتان شیاو و چاکە بۆ دین و دونیاتان پێتان دەدەین، لەگەڵ ئێوە ئەو شتە دەردەخەین کە لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان دا بێت. یاخود بگەڕێنەوە بۆ یەکێ لەوانەی زانایانی ئێمە پێی ڕازین و ئێمەش بزانین کە ئەمیندارەو دڵسۆزە بۆ ئیسلام و موسڵمانان کە بریتین لە: باوکمان شێخی ڕێزدار عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵەتیف و شێخ سەعدی کوڕی عەتیق و شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدوڵەتیف و شێخ عەبدوڵڵا عەنقری و شێخ عەبدوڵای کوڕی سەلیم و شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی سالم. جا ناوبراوان هەر فەتوایەکیان بۆ ئێوەدا ئەوابەویستی خوا ئەوە حەقیقەت ڕاستە و ڕازی بوون بەهەر کەسێ لە زانست خوازان ئەوا با هاوشان لەگەڵتاندا بن تا لێیان فێری دین ببن، من شتێ بەدروست دەزانم کە ئەو زانا ناوبراوانە

به دروستی دەزانن. هەر کەسێ بە زانستخوازێ ڕازی نەبوو یان پرسیاری کرد جگەلە زانا ناوبراوەکان یاخود بە دروست دەزانن کە زانستخوازەکانی تر لەو مەسەلانەدا بدوێن ئەوا بەڕاستی من بەریم لەو کەسە و سەلامەتیش نابێت لەسەر زەنشت کردن.

ئەو مرۆڤەی مەبەستی گوێڕایەڵی پەروەردگارە ئا ئەوە دەروازەی موسڵمانانەو لەو دەروازەیە با بێتە ژوورەوە و شتەکانی تر با فەرامۆش بکات، بەڵام ئەو مرۆڤەی کە پێچەوانەی ئەمە دەجوڵێتەوە یان ئەو سنورانە دەشکێنێ کە باسمان کردن ئەوا دەزانێ کە ئێمە بەویستی خوا سزایەکی وای دەدەین کە خەیاڵی بۆ نەچێ و هیچ ڕێزو حورمەتێکی لەلای ئێمە نابێت، هەر کەسێ تاوانی کرد با هەر خۆی تاوانبار کات "(١).

لە پەیامێکی تردا: " هەر کەسێ شتێکی لێ تێك چوو ئەوا با بیباتە لای زانست خوازەکەی لای ئێوە کە بەرپرسە بە فەرمانی حوکمڕان و ڕەزامەندی شێخەکان، ئێمە بەویستی خوا هیواداریین شتێکی پێچەوانەی ئەو بڕیارەمان ئەنجام نەدەن و مەبەستیشتان دەستخستنی ڕەزامەندی خوایە، لەبەر ئەوەی بەزەیی و میهرەبانین لەگەڵتاندا ئەوا پێمان خۆش بوو کە ئاگاداری ئەوانە بکەینەوە کە پێچەوانە ڕەفتار و گوفتار دەکەن، هەر کەسێ بە گوفتار یان ڕەفتار پێچەوانەی جوڵایەوە ئەوا ئێمەو موسڵمانان لێی بەرین و با لە زەبرو زەنگ و سزا بێ باك نەبێ، هەر کەسێ ئاگادار کرایەوە ئەوا پاساوی نەماوەو بەڵگەی لەسەر بەرپا کراوە "(٢).

---

(١) التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٤٧٦.

(٢) التويجري، عبدالعزيز: لسراة الليل هتف الصباح ٥٢٤.

لەگەڵ ئەمەش دا ئەوا عەبدولعەزیز نەیتوانی بەتەواوی زاڵ بێت بەسەر (ئیخوان) دا و دەمیان ببەستێت و دەنگە بیستراوەکەیان کپ بکات. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەو پشتی دەبەست بە سیستەمی خۆسەپێن کە ڕاوێژ و گەل و ئەندامانی حیزبی وەهابی هیچ ڕۆڵیان نییە تیایدا، ئەوا ئیبن سعود پەنای بردە بەر شمشێر کە شانیشینەکەی لەسەری دامەزرابوو. پشتی بەست بە فەتوای پیاوانی ئایینی وەهابی کە دەریان کرد دژ بە (ئیخوان) تا بە: " یاخی بوو و خەواریج و زیاد ڕۆچوویان " دابنێن و بیانخەنە دەرەوەی چوارچێوەی (موسڵمانان) و جەنگەکانیان لە سیفەتی جیهاد ڕووت بکەنەوەو و تۆمەتباریان بکەن بە دەمارگیری و داخراوی[1] ئەمەش وەك ڕێ خۆشکەرێ بۆ ئەنجامدانی هێرشێکی فراوان بۆ سەریان لە ساڵی ١٩٣٠.

بەڵام شمشێری ئیبن سعود لەو کاتدا زۆر بەهێزتر نەبوو لە شمشێری (ئیخوان)، بەتایبەت کاتێ (ئیخوان) پەنایان بردە بەر کومیت و عێراق و نزیك بوو سیستەمەکەی ئیبن سعود بڕوخێنن، ئەگەر بەریتانیا نەهاتبایە ناویەوەو لە پاڵ ئیبن سعود نەوەستابایە، کە بەڕاستی بەریتانیا ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی لە ڕزگار کردنی تەختی ئیبن سعود لە ڕووخان[2]، بەریتانیا ڕێگری کرد

(١) ئیبن سعود پەیامێکی نووسی بۆ ڕاوێژکارەکەی (حافظ وهبة) تۆمەتباری ئیخوان دەکات بەوەی بەوەی زیاد ڕۆچوو و توندڕەون لە دیندا و لە خۆباییین. ئەوان دوو دەستەن: یەکێکیان خۆیان دوور دەگرن لە نەزانی، ئەوەی تریشیان هەندێ نامانجی خەراپیان هەن و دین وەك بەڵگە بۆ خۆیان بەکار دێنن. کشك: محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٦٦٠.

(٢) نوێنەری نیشتەجێی بەریتانیا (هارۆلد دیکسۆن) لە کومیت دەڵێت: زاڵبوونی ئیبن سعود بەسەر بارودۆخە ناهەموارەکەدا چاکەکەی بۆ بەریتانیا دەگەڕێتەوە، چونکە ئەگەر بریتانیا کۆششی نەکردبایە لە مانەوەی کومیت و عێراق بەبێ لایەنی و کەنارگیری ئەگەر هێزێکی زۆری

له حوكمڕانی کویت که بچێته پاڵ (ئیخوان) و پێشکەوتووترین چەکی پێشکەش بە ئیبن سعود کرد، تەنانەت فڕۆکەکانی ڕەوانەکرد بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر خێوەتگای (ئیخوان) و سەرکردەکەیان (فەیصەڵی دومیش)ی دەستگیر کرد کە پەنای بردبووە بەر کویت و دایە دەستی ئیبن سعود[1].

(ئیخوان) تووشی شلەقان و شڵەژانێکی زۆر گەورە بوون کاتێ پیاوانی ئایینی وەهابی پشتیوانی ئیبن سعودیان کرد و فەتوایان دژ بە (ئیخوان) دەرکرد، سەرباری ئەوەی کە هەڵوێستی (ئیخوان) نزیکتر بوو لە لۆژیك و مەنتیقی وەهابی کەچی ئیبن سعود زۆر دوور بوو لێی؛ ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە شێخەکانیان تۆمەتبار بکەن بە نەرمی نواندن لە دیندا و شاردنەوەی ڕاستی و لە گۆڕنانی میللەتی ئیبراهیم[2] و ئیبن سعودیشیان تۆمەتبار کرد بەوەی ئەوانی بەکارهێناوە بۆ مەبەستە تایبەتیەکانی و فراوان کردنی شانشینەکەی و دواتر پشت کردن لەوان و هەڵکوتانە سەریان. لەبەر ئەوە هەستیان بە ئازارو پەشیمانی کرد، چونکە وەك وڵاخی سواری بەکارهێنراون، بۆیە هیچی تر ویستی دڵسۆزیان نەما یان گەرم و گوڕ بوون لە ناو بزوتنەوەی وەهابیەت. هەموو خەمیان بریتی بوو لەوەی کە فەرامۆشیان بکەن[3] و ئەوانیش هەتا مێژەری ئیخوانی فڕێبدەن[1].

---

دانەنابایە سەر سنوری باشوری کویت کە دواتر بووە هۆی ملپێ کەچ کردنی شۆڕش گێڕەکان، ئەگەر ئەو ڕۆڵەی بەریتانیا نەبووایە ئەوا ئیبن سعود نەیدەتوانی شۆڕشەکە سەرکوت بکات بەڵکو خۆی ماڵی سعودی ڕووبەڕووی ترسناکترین دەرمنجام دەبوونەوە " الكويت و جاراتها ١/٣٤٢.

(١) كشك: محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامي ٦٣٣ _ ٦٣٦.

(٢) وهبة: حافظ: جزيرة العرب في القرن العشرين ٣٦٢.

(٣) ديكسون: الكويت و جاراتها ١/٣٤٣.

دوای زاڵبوون بەسەر (ئیخوان) و ڕێکخستنە سەربازییەکەی دا، ئەوا وەهابیەت هیچ بوونێکی حەقیقی نەما لە نەجد، ئەگەر چی خۆی دەبینیەوە لە تەیاری (ئالی شەیخ) کە هەندێ ئەرکی پێویستی جێبەجێ دەکرد بۆ سیستەمی سعودی لە پێناو زاڵ بوون بەسەر ئیخوان دا. بۆیە بزوتنەوەی وەهابیەت لە بزوتنەوەیەکی عەقیدەیی دامەزرۆوە بۆ ڕزگار کردنی جیهانی ئیسلامی "هاوبەشدانەر" و بڵاو کردنەوەی یەکتاناسی تیایدا بووە دامەزراوەیەکی دینی سەر بە دەوڵەتی ئالی سعود.

---

(١) دیکسون، الکویت و جاراتها ٣٤٤/١.

## پەیوەندی ئیبن سعود لەگەڵ پیاوانی ئایینی

هەروەك ئیبن سعود سەرەتا (ئیخوانی) بەکارهێنا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵاتدا دواتر هەڵی کوتایە سەر خودی (ئیخوان)، ئەوا ئیبن سعود هەڵسا بە بەکارهێنانی پیاوانی ئایینی لە پرۆسەی لێدانی (ئیخوان) دا و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا. بەهەمان شێوە ئیبن سعود ئەو زانایانەی بەکارهێنا بۆ بەهێز کردن و پێدانی شەرعیەت بە سیستەمەکەی و دواتر لێدانیان لە رووی سیاسیەوە بەتایبەتی دوای گۆڕانی تەرازووی هێز لە بەرژەوەندی ئیبن سعود دا، بەشێوەیەك زانایانی دوور خستەوە لە کاریگەری دروست کردن لەسەر ژیانی سیاسی یان بەشداربوون لە حوکمڕانی و ڕەفتار کردن بە یاسای فەرمان بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە یاخود نارەزایی دەربڕین لەبەرامبەر دەسەڵاتە ڕەهاکە کە بەدەستی خۆیان بنیادیان نابوو. سەرەڕای ئەوەی ئیبن سعود بۆ ماوەیەك سوربوو لەسەر بانگهێشت کردنی هەفتانەی هەندێ لە زانایان و کۆبوونەوە لەگەڵیان و گوێ گرتن بۆ دیدو تێڕوانینەکانیان، بەڵام پرۆسەی ڕاوێژەکە کەسی و ئارەزومەندانە و نهێنی بوو، چونکە ئیبن سعود ئەو زانایانەی دەستنیشان دەکرد کە دەیویست ڕاوێژیان پێ بکات و هەر خۆیشی بڕیاری دەدا لەبارەی هەر شتێ کە دەیویشت. ئەو پرۆسەیە لە چوارچێوەی دەستوری روون و ئاشکرایی ناسراودا نەبوو و هیچ شێواز و ڕێگەیەك نەبوو بۆ سەپاندنی ڕای دروست یان ئەوەی یەکدەنگی

لەسەرە. ئیبن سعود کۆبوونەوەکانی زۆر بەنهێنی ئەنجام دەدا[1] و ڕێگەی نەدەدا هیچ یەکێك بزانێ کە چ لەو کۆبوونەوانەدا دەگوزەرا و زانایان چ تێبینی و ڕەخنەیەکیان پێشکەش کردووە، ئەو بنەمایانەش چین وا لە ئیبن سعود دەکەن کە قبوڵی ڕای ئەو زانا تایبەتیانە بکات و گوێ نەدات بە تێڕوانینی زاناکانی تر. ئالێرەوە دەرەنجامی ئەو کۆبوونەوانە نەزۆك بوو و کاریگەری نەبوو لەسەر سیاسەتەکانی عەبدولعەزیز لە هیچ ئاراستەیەکەوە، بەڵکو دەکرێ بووترێ ئەو کۆبوونەوەو ڕاوێژ پێکردنە تەنها داپۆشینی کاروبارو جوڵانەوەکانی بوو یان هەوڵێ بوو بۆ چاوبەستنی زانایان و قەناعەت پێکردنیان بەوەی ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە بەڕێوەبردانی وڵاتدا.

بەهۆی ڕێکوپێك نەبوونی پەیوەندی لەنێوان زانایان و ئیبن سعود بەڵکو کارتێکردنی حەزی کەسی لەو پەیوەندییە، ئەوا زانایان ئەو هێزەیان ون کرد کە گوشار دروست دەکات و هەڵ دەڕەخسێنێت بۆ سەپاندنی ڕاو پێشنیارەکانیان یان پابەند کردنی پادشا و دەسەڵاتی جێبەجێکاری بەو پێشنیارانەی خۆیان. لە ماوەی مێژووی شا عەبدولعەزیز دا نەبووە کە گوێی گرتبێت یان بەویستی زانایان هەڵسوکەوتی بکات تەنها لە چەند حاڵەتێکی کەم و شکلی لاوەکی دا نەبێت، ئەمەش کاتێ زانایان ناڕەزاییان دەربڕی سەبارەت بەهەوڵی شا عەبدولعەزیز بۆ ئاهەنگ گێڕان بە جەژنی تەخت (عەرش) ساڵی ١٩٣٠ز و ١٩٥٠ز، چونکە زانایان ئەو کارەیان بە بیدعە دانا و

(١) ئیبن سعود بە زانایانی دەووت: " هەر کەسێ شتێکی هەڵەی لە من بینی با بۆمی ڕوون کاتەوەو ڕێنومابیم بکات بۆ ڕێگەی ڕاست، هەروەك عومەری کوڕی خەتتاب بەو کەسەی وت کە ویستی ئامۆژگاری بکات: (با ئەمە لەنێوان من و تۆ بێ)".

پەشیمان بوونەوەو تەوبە بەپێویست دەزانن لەسەر بکەرەکەی، بۆیە شا لەو خواستە دابەزی و ئاهەنگەکەی ئەنجام نەدا[1].

سەرباری ئەوەی کە پیاوانی ئایینی وەهابی هەندێ جار دەچوونە ململانێیەکی توندەوە لەگەڵ ئالی سعود لەسەر سەرچاوە جەماوەرییە سەرەکیەکانی تری دەسەڵات،، بەڵام زانایان لەوە لاوازتر بوون کە بۆچوونەکانیان بە زەبری هێز بسەپێنن لە میانەی نەبوونی دامەزراوەی دەستوری یان یاسایی یاخود بنەما جەماوریی یان حیزبیەکان کە ئەو رێگەیەیان پێ بدات.

(1) كشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٧٨. أنور عبدالله: العلماء و العرش ٢٥٩ و ٢٦١. و الزركلي، شبه الجزيرة العربية ٧٤٤. فەیەصڵی کوڕی عەبدولعەزیزیش هەمان شتی کرد لە ساڵی ١٩٦٥.

## پەیوەندی ئبن سعود لەگەڵ جەماوەردا

ئیبن سعود دەوڵەتەکەی دامەزراند لەسەر هێزو توانا خۆسەپاندن و ئالێرەوە مۆرکێکی کەسی بۆ سیستەمەکەی زیادکرد بەو مانایەی خۆی ڕزگار کەر و جەنگاوەر و خاوەنی دەسەڵات و وڵات و بەندەکانە، هەروەك بە ڕاشکاوی وتی: " حوکمڕانی و شارەکان و زەویەکانی هی خوان دواتر بۆ منن "[1]، بۆیە دامەزراوەی دەستوری و دەزگای گشتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەسەڵات لە وڵاتدا دانەمەزراند، چ جای دابەش کردنی لە نێوان ناوەندە فرە هێزەکان یاخود ڕێگەدان بە جەماوەر یان ئەو وەهابیانەی کە مابوونەوە بە بەکارهێنانی مافی خۆیان لە بەشدار بوون لەلایەنی سیاسی دا.

ئەو ڕێگەیەی کە لەسایەی دا گەیشتن بە دەسەڵات کاریگەری دروست کرد لەسەر بنچینەی سیستەمی سعودی و سروشتی پەیوەندییەکانی لەگەڵ جەماوەردا، لەبەر ئەوەی گەیشتن بە دەسەڵات بە زەبری هێزی چەکداری و داگیر کردنی سەربازی بوو ئەوا پەیوەندی سیستەمەکە لەگەڵ هاونیشتمانان دا لەسەر بنەمای هێز بوو، لەبەر ئەوەش تیۆری دینی کە بەکارهێنرابوو بۆ بنیاد نانی سیستەمەکە تیۆری (وەهابیەت) بوو کە گشت خەڵکی تەکفیر دەکرد، پەیوەندی سیستەمی سعودی لەگەڵ تاکەکانی خەڵکدا دامەزرابوو لەسەر گومان و دوور خستنەوەو بەشدار پێ نەکردنی سیاسیانە. ئەم پەیوەندییە نەرێنییە (السلبية) ڕەنگی دایەوە _ وەك بینیمان _ هەتا لەسەر تاکەکانی بزوتنەوەی

---

(١) التويجري: عبد العزيو: لسراة الليل هتف الصباح ٤٦٦.

وەهابی ئەوانەی کە دواتر ڕووبەڕووی پرۆسەی سەرکوت کردن و کپ کردن و دوورخستنەوە بوونەوە لە ژیانی سیاسی.

سەرەڕای هاتنە کایەی دەوڵەتی سعودییەی سێیەم لە کەش و هەوای بزوتنەوەی دەستوری و دیموکراسی کە تێکڕای جیهانی ئیسلامی ئەو کاتی گرتبووەوە، تەنانەت سەری کێشا بۆ دانانی دەستور لە هەر دوو دەوڵەتی عوسمانی و ئیرانی ساڵی ١٩٠٦ و ١٩٠٨ و چاودێری شا عەبدولعەزیز بۆ هەواڵەکانی ئەو بزوتنەوە دەستوریانە و پەیمان بەستن بە دانانی سیستەمی ڕاوێژ[١]، بەڵام ئیبن سعود دەوڵەتەکەی دامەزراند لەسەر بنەمای خۆسەپاندنی تاکی ڕەها، هەموو دەسەڵاتەکانی دەستوری یاسادانان و دادوەری و جێبەجێ کاری[٢] لە دەستی خۆی دا کۆیکردنەوە، کەچی خۆیشی ئەو جۆرە پەیوەندیەی لە نێوان حوکمڕان و ئوممەت و ئەوەی کاری پێدەکرا لە ڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمانی بەجۆرێك بە کۆیلەکردنی دادەنا کە بەدژی یەکتاناسی[٣] دەزانی

---

(١) دوای چوونە ناو مەککەی پیرۆزەوە ساڵی ١٣٤٣ شا عەبدولعەزیز جەختی کردەوە بۆ دانیشتووانی حیجاز کە سیستەمی حوکمڕانی ئەو لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەت دادەمەزرێت و بەڕێوەبردنی کاروبار بەڕاوێژ دەبێت لە نێوان موسڵمانان دا. ابن باز، أحمد عبدالله: النظام السیاسي و الدستوري للمكة العربیة السعودیة ٦٧.

(٢) دانیشتووانی حیجاز بەیعەتیاندا بە ئیبن سعود ڕۆژی ٢٥ جەمادی دووەم ١٣٤٤ (١٠ یەنایەری ١٩٢٦) بەوەی کە پاشای حیجازە بەو مەرجەی کە حیجاز بۆ حیجازییەکان بێت و خۆیشیان هەڵسن بە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان، مەککەش ببێتە پایتەخت بۆ دانیشتووانی حیجاز. کشك، محمد جلال: السعودیون و الحل الاسلامی ٥٣٢.

(٣) کاتێ پێشوازی کرد لە ئەمیر وەحیدەدینی کوڕەزای سوڵتان عەبدولحەمید لە (ڕیاز) لە ڕێکەوتی ٩ ذي الحجة ١٣٤٩ك _ ١٩٣١ لەو کاتەدا پێی وت: " زۆرربەی ئەوانەی ئێمە جەنگاوین لەگەڵیاندا باپیرانی ئەم پیاوەن و ئەوانیش تەنها لەسەر ئەوەی جەنگیان لەگەڵ ئێمە کرد چونکە

بەڵام بەکار هێنانی ئەم شێوازە بۆ خۆی لەگەڵ ژێردەستەکانی بە شتێکی ئاسایی زانی[1].

شتێکی سروشتی بوو کە دەسەڵات لەلایەن خانەوادەی دەسەڵاتدارەوە قۆرغ بکرێ بەشێوەیەکی ڕەها و دان نەنێ بە مافی گەل لە دەسەڵات دا یان وەك سەرچاوەك بۆ دەسەڵات. بەشێوەیەك کە ماوەو کەلێنێ نەما بۆ گفتوگۆ کردن یان موشتومڕ یان پرسیار کردن لەسەر "ماف"ی ئالی سعود لە پاشایەتی دا. تەنانەت ماوە نەما بۆ دووان لەسەر دەسەڵاتی پاشا یان چونیەتی خستنە سەرکارو لەکار لابردنی بەڵکو پێویست بوو گشتیان بۆ ئەم واقیعە ملکەچ و گوێڕایەڵ بن. لەبەر ئەوەی پرۆسەی زاڵ بوون بەسەر گشت ناوچە جیاوازەکانی سعودییە لە ڕێگەی داگیر کردنی سەربازی بووە، ئەوا هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڵاتی دا بەشێوەیەکی بەکۆیلە کردن و فیز ئامێز و لە خۆباییانە بوو، کە ئەمەش خۆی دەبینیەوە لە زیادکردنی مۆرکی خانەوادەی (سعودی) خاوەن

---

ئێمە ئامادە نەبووین کە بە سوڵتان بڵێین ئێمە کۆیلەی ئەمیری بڕوادارانین، نا.... نا.... ئێمە تەنها بەندەی خوای پاك و بەرزین ". کشك، محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامی ٤٣٥.

(١) نووسەری ئەمساوی موسڵمان (موحەمەد ئەسەد) کە یاوەری ئیبن سعودی کردووە دەڵێت: " ئیبن سعود مەبەست و ئامانجەکانی عەرەب و موسڵمانەکانی نەهێنا دی، کاتێ کە هێزی لە زیادبووندا بوو و دەرکەوت کە ئیبن سعود زیاتر نەبوو لە پاشایەك کە ئامانجی بەدیهێنانی چەند شتانێکە کە جیا نەبوو لە ئامانجەکانی زۆرێك لە حوکمڕانی خاوەن دەسەڵاتی ڕەهابوون بەر لە ڕۆژهەڵات.... ئەو هیچ کارێکی نەکرد بەمەبەستی بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووی دادپەروەر. کاتێ پرسیاری لێ کرا بۆچی هەوڵی نەداوە کە دەوڵەتەکەی دابمەزرێنێت بەوەی کەمتر مورکی کەسی پێوە بێت تا کوڕەکانی بتوانن بنەمای حکومەتێکی ڕێکوپێك بەمیرات بگرن، لە وەڵامدا ووتی: " شانیشینەکەی خۆمم بە شمشێرو تێکۆشانی خۆم دامەزراندووە با کوڕەکانیشم تێبکۆشن بۆ خۆیان لەدوای من ". کشك، محمد جلال: السعوديون و الحل الاسلامی ٦٨.

دەسەڵات بەسەر نیشتمان و دانیشتووانی نەجد و ئەحساء و حائل و عەسیر و حیجاز، پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی خۆسەپێنی ڕەها لەلایەن سیستەمی سعودیە و دانانی بەرهەمی نیشتمانی و وڵات و بەندەکان بە موڵکی کەسی[1].

(١) نزیکە کە مێژووناسان یەکدەنگ بن لەسەر ئەوەی کە عەبدولعەزیزی کوڕی سعود شانشینی عەرەبی سعودی بە دەسەڵاتی کەسی خۆی بەڕێوەی دەبرد و کارەکانی هەڵدەسوڕاند وەك ئەوەی کارێکە لە کارەکانی ماڵەوەی، تا کۆچی دوایی کرد ساڵی ١٩٥٣ز. وەك نموونەیەك لەم بارییەوە، مێژووناسان ئاماژە دەکەن بۆ ئەو ئاڵودە بوونەی پاشا لەگەڵ بەرهەمە زەبەلاحە نەتەوەییەکە کە پاشا وەك داهاتێکی کەسی بۆی دەڕوانی و جیاوازی نەدەکرد لەنێوان بەرهەمی نەتەوەیی و سەروەت و سامانی کەسی خۆی. یەکەم بودجە سعودییە پێشکەشی کرد لە ساڵی ١٩٥٨ _ ١٩٥٩ ئەوا لە ١٧٪ تایبەت کردبوو بۆ تەخت و عەرش بۆ ئەوەی پاشا بەهەوەسی کەسی خۆیی خەرجی بکات سەرباری ئەوەی کە ١٩٪ ی بودجە دانرابوو لە ژێر بەندی (خەرجیەکانی تر) تا بەپێی بۆچوونی پاشا خەرج کرێت./ أنور عبدالله، العلماء و العرش ٩٤. و كشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٧٢.

ئەمیر وەلیدی کوڕی تەلال بۆ ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز دووا لە ٢٠٠١/١١/٣٠ و وتی کە ئەمیرە سعودییەکان کاتێ لە دایك دەبن ئەوا بڕە پارەیەکی ساڵانەی بۆ دانراوە کە ١٨٠ هەزار دۆلارە.

## سەد ساڵ لە پەیماندانی دیموکراسی نەزۆک

سەرباری ئەمە ئەوا سیستەمی سعودی جگەلە دروشمە ئیسلامیەکانی و بڵاوبوونەوەی هەستی دیموکراسی لە جیهاندا، ئەوا هەستی دەکرد بە کەم و کورتیەکی گەورەو فەیرانێکی توونـد لە پەیوەندی نێوان سیستەمەکە و دانیشتوانەکە کە ئارەزوومەندی ئازادی و دادپەروەری و ڕاێژو بەشداربوون لەلایەنی سیاسین. بۆیە دەیویست بڕوات لەگەڵ ئەو هەستانە و مۆرك و کاڵایەکی دیموکراسی بپۆشێت. بۆ ئەم مەبەستە شا عەبدولعەزیزی کوڕی سعود وتی: " هەندێ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئازادی لە شتەکانی ئەوروپایە، کەچی لە ڕاستی دا قورئانی پیرۆز ئازادی تەواوی هێناوە بۆ خەڵکی لە گشت مافەکانیان دا، برایەتی و یەکسانی ڕەهای هێناوە کە هیچ ئوممەتێك خەونیشی پێیەوە نەبینیوە ". و " گومانمان نیە کە خوای گەورە زانایە بەوەی چ لە دڵیاندا دەگوزەرێت و هەندێکیان دوژمنی هەندێکی ترن هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ﴾ الحشر: ١٤. واتە: (هەر چەندە وا دەزانیت یەکپارچەن، بەڵام لە ڕاستیدا دڵەکانیان دوورن لەیەکەوە). ئەوا لەڕێی ڕاوێژەوە گەیشتن بە پلەی بەرز لە دونیادا و ئێمەش وەك موسڵمان فەرمانمان پێکراوە ڕاوێژ بکەین و ڕاوێژیش بنەمای هەیە ئەویش بریتیەلە ئامۆژگاری کردن بۆ پابەند بوون بە ڕاستی ". و " بەڵام کارایی کردن و ڕێگا بڕین بەبێ ڕاوێژ ئەوا دەبێتە هۆی کەوتنەوەی کەم و کورتی حوکم کردنی هەواو هەوەسی دەروون و نەفس "[١].

---

(١) کشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٣٧ _ ٣٨.

لەبەرئەوەی سیستەمی سعودی هەستی بەوەکرد ئەگەر تەنها پشت ببەستێت بە هێز ئەوا دەبێتەی هۆی ئەوەی کە مافی ئەوە بدات ئەوانی تر پەنابەرنە بەر هێزو کار بکەن لە پێناو لەناوبردنی سیستەمەکە، بۆیە لەوانەیە هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی شەرعیەتی دەستوری لە میانەی بانگەشە کردن بەوەی کاردەکات بە شەریعەتی ئیسلامی و بەیعەت لە خەڵکەکە وەربگرێ و هەندێ دیاردەی ڕاوێژ یان دیموکراسی دابمەزرێنێ یاخود پەیمان بدات بە دامەزراندنی.

## ڕاویژ بۆ دانیشتووانی حیجاز

ئیبن سعود بەشێك لەو پەیمانە دیموکراسیانەی پێشکەش بە دانیشتووانە ترساوەکەی حیجاز کرد، کە ترسابوون لە توندو تیژی وەهابی، ئەمەش لەکاتی پرۆسەی ڕامالینەکە بوو، یاداشتێکی دەرکرد لە بەرواری ٢٢ سەفەری ١٣٤٣ _ ١٩٢٤ کە تیایدا پەیمان بە موسلمانان دەدات بەتایبەتی دانیشتووانی حیجاز، بەوەی کە حیجاز و مەککە بۆ گشت موسلمانان بێت و کاروباری دوو حەرەمە پیرۆزەکە بە ڕاوێژ بێت لە نێوان موسلماناندا. دەلێت: " من بریکاری موسلمانانم لە وەدەرنانی هاشمییەکان لە حیجاز تا بە ئازادی چارەی حیجاز دیاری بکەن "[1]. دواتر یاداشتێکی تری دەرکرد لە ٢٢ دێسەمبەری ١٩٢٥ _ ١٣٤٤ تیایدا جەخت دەکاتەوە: بۆ داهاتووی ولات پێویستە کۆنگرەیەکی ئیسلامی دیاری بکات کە لەو کۆنگرەیەدا گشت موسلمانان تیایدا بەشدار بن بۆ ئەوەی بڕواننە چارەنووس و بەرژەوەندی حیجاز. وتی: " بروسکەو پەیامان ناردووە بۆ گشت ناوچەکان تا نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ بەستنی کۆنگرەی ئیسلامی گشتی کە بڕیار دەدات لەبارەی پێکهاتەی حکومەت کە بەگونجاوی دەبینن بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە لەو ولاتە پاکەدا "[2] بەلام ئیبن سعود پاشگەز بویەوە لە فیکرەی کۆنگرەی ئیسلامی دوای داگیر کردنی مەککە و خۆی ناساند

---

(١) کشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٥٢٦ _ ٥٢٨.

(٢) کشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٥٢٨.

وەك پاشای حیجاز[1] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام بانگەشەی دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاوێژی دەکرد کە لە دانیشتوانی حیجاز پێکهاتبێت بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتی خۆیان، لە وتارەکەی دا لەبەردەم سەرکردەکانی مەککەدا وتی: " من نامەوێ تەنها خۆم هەموو کاروبارەکان بەڕێوە ببەم لە وڵاتەکەتاندا بەبێ ئەوەی ئێوە تیایدا بەشدار بن بەڵکو پێویستیم بە ڕاوێژی ئێوە هەیە لە گشت کاروبارەکاندا "، داوای کرد لە ئامادەبووان کە کۆببنەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسەی دەیانەوێت ببێتە نوێنەریان لە ئەنجومەنی ڕاوێژی ئەهلی دا. پاشان لە کاتی کردنەوەی ئەنجومەنی ڕاوێژ کە دامەزرابوو بەرلەوەی (جدة) بگیرێت و بڕوخێت وتی: " فەرمانم کردووە کە هیچ سیستەمێ لەو وڵاتە دانەمەزرێ و کاری پێ نەکرێ تا بۆ ئەنجومەنەکەتان دەخرێتەڕوو کە نوێنەری گشتین و بەو پەڕی ئازادییەوە ڕای خۆتان دەربڕن "[2].

بەڵام ئەو پەیمانە دیموکراسیە خێرا بەباداچوو و نەما و دەرکەوت کە تەنها بانگەشەیەکی تەکتیکی بووە لەپێناو خەیاڵ خۆش کردنی دانیشتووانی حیجاز و ڕێگە خۆشکردن بۆ داگیر کردنی وڵاتیان، بەشێوەیەك کە عەبدولعەزیز هیچ یەکێك لەو پەیمانانەی جێبەجێ نەکرد، لەوەی کە دانیشتووانی حیجاز چارەنووسیان بە ئازادی دیار بکەن و کاروباری دوو حەرەمە پیرۆزەکە بە ڕاوێژ بێ لە نێوان موسڵمانان. کۆنگرەکەی لەدوای داگیر کردنی مەککە ڕەتکردەوەو ڕێگەی نەدا بە نوێنەرە ڕەوانەکراوەکان کە

---

(١) كشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٦٩.

(٢) كشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٣٩.

بۆچوونیان دەربڕن سەبارەت بە چارەنووسی حیجاز و دیاریکردنی پەیکەری حکومەت لە وڵاتی پاکی خوای گەورە. عەبدولعەزیز خۆی وەك پاشای حیجاز ناساند. سەرباری ئەوەی کە دوای داگیر کردنی مەککە داوای لە سەرکردەکانی کردبوو بۆ ڕێکخستنی خشتەی ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوێژ و ئەوان کۆبوونەوە لەسەر ئەمە و سێزدە کەسیان هەڵبژارد بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەیبی بەڵام ئیبن سعود ڕێگەی نەدا بەو ئەنجومەنە کۆببێتەوە تەنانەت ئەگەر بۆ جارێکیش بێت.

لە جیاتی ئەمە شا عەبدولعەزیز ساڵی ١٣٤٤ك هەڵسا بە پێکهێنانی (ئەنجومەنی ئەهلی)ی ڕاوێژکاری نوێ بە چەند ئەندامێکی دیاری کراو لەلایەن خۆیەوە و کارو ئەرکی ئەوانی دیاریکرد لە چوارچێوەی کاری شارەوانی و ڕۆشنبیری و بازرگانی و جێبەجێ کاری تەنها بۆ ناوچەی حیجاز، لەگەڵ خۆ دوور خستنەوەیان لە سیاسەتی دەرەوەی وڵات. و کوڕەکەی ئەمیر فەیصەڵی کردە سەرۆکی حوکمەت و مەرجەع بۆ بەڕێوبەرایەتیە فەرمیەکان لە ژێر ناونیشانی (نوێنەری گشتی بۆ شای خاوەن شکۆ لە حیجاز)[1] لە بەرواری ١٣٤٤/٦/٢٨.

دوای ئەمە بە ساڵێك عەبدولعەزیز هەڵسا بە پێکهێنانی ئەنجومەنێکی تر بەناوی (ئەنجومەنی ڕاوێژ) بە سەرۆکایەتی جێگری پاشا: ئەمیر فەیصەڵ و بە ئەندام بوونی ١٢ کەسی دیاریکراو. لە بەرواری ١٣٤٥/٥/٢١ك (١٩٢٦ز) (زانیاریارییە سەرەکیەکان بۆ حیجاز) دەرکرد بۆ ئەوەی ببێتە دەستوری دەوڵەتی حیجاز لە چوارچێوەی دەوڵەتی سعودیەدا، لە ماددەی دووەمی دا

---

(١) ابن باز، أحمد عبدالله: النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٧٢.

هاتووه كه دەوڵەتی عەرەبی حیجازی دەوڵەتێكی پاشایەتی ڕاوێژكاری ئیسلامی سەربەخۆیە لە ناوەو دەرەوەدا. ماددەی چوارەمی جەخت دەكاتەوە لەسەر پێكهێنانی ئەنجومەنی ڕاوێژ لە مەككە و مەدینە و (جدة). لە ٩ موحەڕەمی ١٣٤٦ دا ئیبن سعود نوسراوێكی (مەڕسومێكی) پاشایەتی دەركرد كە پەیوەست بوو بە سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ و جەخت دەكاتەوە لەسەر ئەوەی كە ئەنجومەن پێك دێت لە هەشت ئەندام و نیوەیان حكومەت هەڵیان دەبژێرێت بە ڕاوێژ لەگەڵ خەڵكی چاك و ئەزموون دیدە و نیوەی تریش حكومەت خۆی هەڵیان دەبژێرێت بەپێی زانیارییەكانی، ئەم ئەنجومەنەش بە سەرۆكایەتی ئەمیر فەیصەڵ دەبێت (جێگری گشتی)، پاشا بۆی هەیە كە ئەنجومەنی ڕاوێژ هەڵوەشێنێتەوەو ئەندامانی بگۆڕێت یان لا ببات. لە ساڵی ١٣٤٧ ئەنجومەنێكی نوێی ڕاوێژی پێكهێنا لەگەڵ گۆڕانێكی كەم لە ژمارەی ئەندامان كە ئەو گۆڕانە پەیوەستە بە ویستی پاشاوە. بەوشێوەیە چەند ئەنجومەنێكی تری ڕاوێژی پێكهێنا لە حیجاز لە هەر دوو ساڵێكدا تا ساڵی ١٣٧٢ بەڵام زیاتر بە حكومەتی دیاریكراو دەچوون نەوەك ئەنجومەنی ڕاوێژ.

## پەیماندانی دیموکراسی نەزۆک

لەسەر ئاستی شانشینی عەرەبیەی سعودیە ئەوا شا عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٩٣٢ نوسراوێکی فەرمی (مەرسومێکی) دەرکرد بە سپاردنی ئەنجومەنی نوێنەران بۆ دانانی سیستەمێکی بنەڕتی (واتە دەستوری) بۆ شانشینەکە و سیستەمی بە میرات گرتنی تەخت و عەرش و سیستەمی پێکهێنانی حکومەت و دەرکردنی فەرمان تیایدا. وە نوسراوەکە پێکهێنانی ئەنجومەنی نوێنەرانی[1] لە خۆی دەگرت و ئەمەش بوو کە دەربڕی هەستی سیستەمەکە بوو بەوەی پێویستی هەبوو بە پێکهێنانی بنەمایەکی نوێ بۆ شەرعیەتی دەستوری وەك جێگرەوە بۆ بنەمای هێزو خۆسەپاندن و زاڵ بوون. بەڵام ئەو نووسراوە نەچووە دۆخی جێبەجێ کردن و نەکرا بە واقیع. بەوشێوەیە سیستەمی سعودی بەردەوام بوو لەسەر سروشتە خۆسەپێنەرە ڕەهاکەی.

کاتێك شا عەبدولعەزیز کۆچی دوایی کرد، کوڕە گەورەکەی سعود شوێنی گرتەوەو وەك حاکمێکی ڕەها هەڵسوکەوتی کرد، کە بووە هۆی دروست بوونی قەیران لە ناو خانەوادەی خاوەن دەسەڵاتدا، ئەمەش بووە هۆی هاتنە کایەی دژایەتی لە نێوانیان دا، بەشێوەیەك کە کوڕەکانی شا عەبدولعەزیز (فواز و بدر و عەبدولحسن و سەعد) بەسەر کردایەتی ئەمیر تەلال لە ساڵی ١٩٥٨

---

(١) د. ئەحمەد ئیبن باز دەڵێت: ئەنجومەنی ڕاوێژ لە خولی خۆیدا لە ساڵی ١٣٥٥ك دا دانی نا بەڕەشنووشی پرۆژەی بنچینەیی بۆ شانیشین و بەرزیان کردەوە بۆ پاشا بۆ بڕیار لەسەردانی. بەڵام چەقبەستویی ئابوری و ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی دووەم بوونە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی حکومەت بەرنامەکەی جێبەجێ بکات.../ ابن باز، أحمد عبدالله: النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٩٦.

جیابوونەوە لە سعود و داوایان کرد بە دانانی دەستورێك کە ئازادی و مافی هاوڵاتیان تیایدا پارێزراو بێت و ئەنجومەنی ڕاوێژ لە ژێر سایەی سیستەمی پاشایەتی[1]، شا سعود فەیصەڵی براکەی بە سەرۆکی وەزیران دەستنیشان کرد و و سیستەمێکی دانا بۆ وەزیرەکان کە تیایدا دەسەڵاتی یاسادانان بەوان دەبەخشێت. و ڕای گەیاند کە دەستورێك دادەنێت بۆ وڵات و لیژنەیەکی حکومی پێکهێنا بۆ داڕشتنی[2] بەڵام ڕۆژ وساڵ تێپەڕین بەبێ ئەوەی وڵات دەستورە ببینێت کە شا سعود پەیمانی داڕشتنی دابوو.

کاتێ ئەمیر فەیصەڵ بۆ جاری دووەم سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتە دەست، ئەوا لە بەرواری ۱۳۸۲/٦/۳ ڕایگەیاند کە حکومەت بەرنامەیەکی چاکسازی داناوە و وتی: " کاتی ئەوە هاتووە سیستەمێکی بنەڕەتی دابڕێژین بۆ حوکمڕانی کە سەرچاوە بگرێت لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خواو ژیاننامەی خەلیفەکانی ڕاشیدین، کە هەموو بنەاما بنەڕەتیەکانی حوکمڕانی بە ڕوونی بخاتەڕوو هەر لە پەیوەندی حوکمڕان و هاوڵاتیان و تەنانەت گشت دەسەڵاتە جیا جیاکانی دەوڵەت و پەیوەندی نێوانیان ڕێك بخات و جەخت بکاتەوە بە دەق لەسەر مافە سەرەکیەکانی هاوەڵاتی وەك مافی ڕا دەربڕین لە چوارچێوەی عەقیدەی ئیسلامی و سیستەمی گشتی. سیستەمی ڕاوێژی ئیسلامی پێویستە زیندوو بکرێتەوە بۆ ئەوەی ئەندامانی (حل و العقد) بەژداربن لە بنیاتنانی دەوڵەت و چاودێری کردنی کاروبارەکانی دەسەڵات "[3] بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە تەنها وەك مەرەکەبی سەر کاغەز مایەوەو

---

(١) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ٩٢.

(٢) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ٩٤.

(٣) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ٢٣٧. بگەڕێوە بۆ: ابن باز، أحمد عبدالله: النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٩٧.

وەفادار نەبوو بەو پەیمانەی لەو کاتدا.

بەهۆی نەبوونی دەستورێکی ڕوون و ئاشکرا کە پەیوەندی نێوان پاشا و سەرۆك وەزیران ڕێك بخات، لەبەرئەوەی نزیك بوو کە سیستەمی سعودی لە ناوەخۆیدا بتەقێتەوەو ئالۆدەی جەنگێکی ناوەخۆیی (ئەهلی) ببێتەوە، ئەمەش کاتێ شا عەبدولعەزیز فەیصەڵی براکەی بە جێگری خۆی دانا لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ دەرەوەی وڵات بەمەبەستی چارەسەر، بەڵام برای جێگرەکەی ڕەتی کردەوە کە ڕێگە بدات شا دووبارە بێتەوە سەر تەخت و دەسەڵات، دوای گەڕانەوەی بۆ نیشتمان دەستی کرد بە بەکارهێنانی زمانی دیموکراسی نوێ، بەشێوەیەك بە شا سعودی وت: " ئەو دەسەڵاتانە ئەمانەت و سپاردەن ئوممەت بەمنی داوە وەك ئەمینداریێ لەسەری و شتێ نییە کە سەوداگەری (مساومە)ی پێ بکرێ، هەروەك من ناتوانم لەو دەسەڵاتەدا لابچم تەنها ئەو کاتە نەبێ کە ئوممەتی خاوەن ماف داوام لێ بکات ". ئەمیر فەیصەڵ بەردەوام بوو لە ململانێ لەگەڵ براکەی شا سعود، تا توانی لە هەموو دەسەڵاتەکانی دایبماڵێت بە پشتیوانی پیاوانی ئایینی و بەتایبەتی ئالی شەیخ کە لە ١٦ی شەعبانی ١٣٨٣ك فەتوایەکیان دەرکرد کە تیایدا جەخت دەکەنەوە لەسەر مافی فەیسەڵ لە بەڕێوەبردنی گشت کاروبارەکانی دەوڵت لە کاتی ئامادە نەبوون و نامادەبوونی شا سعود[١] دواتر ئەمیر فەیصەڵ هەڵسا بە کودەتا کردن بەسەر براکەی سعود دا و لە ساڵی ١٩٦٤ لایبرد لەسەر تەخت و دەسەڵات[٢].

(١) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ١١٢ _ ١١٣.

(٢) عبدالله، أنور: العلماء و العرش ٤٣، پاشکۆی ژمارە ٤.

## ئەنجومەنێ بۆ دەستەی (حل و العقد)

قەیرانی دەستوری کە لەنێوان شا سعود و جێگرەکەی فەیصەڵدا هەبوو بووە هۆی دروست بوونی ئەنجومەنێکی نا فەرمی و ڕانەگەیەنراو و هەڵنەبژێردراو لەلایەن لایەنەکان ئەو ئەنجومەنە ناسرا بە (ئەنجومەنی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان) کە لە ٦٨ ئەمیر پێك هاتبوو جگەلە ئەندام بوونی ١٢ کەس لە زانا گەورەکانی ئایین، ئەو ئەنجومەنە بوو هەڵسا بە دەرکرنی بڕیاری لابردنی شا سعود[1].

ئەو ڕێگەیە دۆزرایەوە کە لەمیانەیدا شا سعود لەسەر کار لابرا ئەویش بریتی بوو لە بێ سەروبەری دەستوری ترسناك، بەشێوەیەك کە پرۆسەی گۆڕانکاری هاتە کایە بەپشت بەستن بە هاوکێشەکانی هێز لە ناو خانەوادەی حوکمڕان دا و بەهۆی نەبوونی دەستورێکی ڕوون کە دەسەڵات و بەرپرسیارێتیەکانی شا دیاری بکات و نەخشەی پەیوەندی نێوان ئەو و ئەمیرەکان و وەزیرەکان و پیاوانی ئایین و گشت دەستەکانی تری گەل بکێشێت،

(١) ئەو ئەنجومەنە ئێستا پێك دێت لە نزیکەی سەد ئەمیر کە لە ئالی عەبدوڕەحمانی ئالی سعودن و هەندێ لە نوێنەرە لاوەکیە پاشکۆکانی خانەوەدەی حوکمڕان لەخۆ دەگرێت، جگەلەوەی کە پەنجای تر ئەندامن لە خانەوادە ئەرستۆقراتیەکان ئەوانەی پەیوەستن بە ئالی سعودەوە بەشێوەیەکی توندەوە وەك جەلوی و سەدیری و سەنیان و خانەوادەی شێخ. هەندێ زانای دیار و گەورە ئەمیری کاریگەیش هەن. بەدەر دەکەوێت کە پێوەری ئەندام بوون لە دەستەی "هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان" پەیوەستە بە ڕەچەڵەك و تەمەن و پێگەیشتووی و ڕابەرایەتی کردن بەپێی نەریتی دەشتەکی. یماني، مي: هويات متغيرة ٦٧.

تەنانەت ئەو لایەنە دیاری بکات کە خاوەنی شەرعیەتە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و شا لەسەر کار لادەبات.

دوای ئەوەی فەیصەڵ هاتە سەر تەختی پاشایەتی، یەکسەر هەڵسا بە ئەنجام دانی هەندێ گۆڕانکاری لە سیستەمی ئەنجومەنی وەزیران، وەك: " ماددەی حەوتەم: ئەنجومەنی وەزیران دەستەیەکی یاساییە[1]، ئەنجومەنی وەزیران خۆی سەرۆکایەتی دەکات و بڕیارەکانی کۆتایی و یەکلایی دەبنەوە پاش ڕەزامەندی شای خاوەن شکۆ"[2]، و بەهۆی هەست کردنی شا بە نەبوونی سیستەمێکی شەرعی دەستوری، لەبەرئەوە پەیمانی بە هاوڵاتیان دا بە دانانی دەستورێك کە تیایدا پێکهێنانی ئەنجومەنی ڕاوێژ و مافە بنەڕتیەکانی هاوڵاتیان لە خۆ بگرێت[3].

بەڵام شا فەیصەڵ لە ساڵی ١٩٧٥ کوژرا بەر لەوەی هیچ هەنگاوێ بنێ بەرەو ئەو ئاراستەیە.

لەو کاتدا شا فەهد ئەمیری ڕاسپێرراو و سەرۆکی وەزیران بوو ڕایگەیاند لەهەمبەر باوەڕ بوونی بە دیموکراسی ئیسلامی و وتی: " ڕاوێژ یەکێکە لە بنەما حەقیقیەکانی دیموکراسی ". پەیمانی دا کە لە ماوەیەکی نزیکدا سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ پێك دەهێنرێ[4].

---

(١) واتە: دەستەی یاسادانانە، بەپێی چەمکی سعودی

(٢) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ١٤٢.

(٣) الياسيني، ايمن: الاسلام و العرش ١٦٦.

(٤) ڕۆژنامەی هەفتانەی عەرەبی بەرواری ١٩٧٥/٥/١٢.

بەڵام سیستەمی سعود بەبێ گۆڕانکاری بەردەوام بوو تا بزوتنەوەی (جوهەیمانی عوتەیبی) لە حەرەمی مەککی دا لە ساڵی ١٩٧٩ز رووید، بۆیە شا خالید بابەتی راوێژی بیر هاتەوەو و فەرمانی کرد بە پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ ئامادە کردنی پرۆژە یاسای دەستور[١].

دوای شا خالید شا فەهد گەڕایەوە تا لە ساڵی ١٩٨٤ ڕاشکاوانە دەری بڕی بۆ رۆژنامەی (صندای تایمز) کە سورە لەسەر دامەزراندنی ئەنجومەنی راوێژ لە ماوەی سێ یان چوار مانگ و هەموو ئەندامانی ڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەتەوە دەستنیشان دەکرێن و دوای دوو ساڵ مافی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی نیوەی ئەندامانی دەداتە گەل لە ڕێگەی ئەنجومەنی ناوچەکانی، لە قۆناغێکی تردا پرۆسەی هەڵبژاردنی هەندێ یان زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان لە ڕێی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ دەبێت لەلایەن هاوڵاتیانەوە ئەنجومەنەکە دەبێتە پەرلەمانێك وەك گشت پەرلەمانەکانی تری جیهان. ئەو پەرلەمانە دەبێتە ئامرازێك بۆ را دەربڕین و هۆکارێ بۆ چاودێری کردنی سیاسەتە جێبەجێ کارییەکانی دەوڵەت و گرەنتیەکیشە بۆ گەل تا بەژدار بن لە حوکمڕانی[٢].

---

(١) الياسيني، ليمن، الاسلام و العرش ٢٠٣.

(٢) القحطاني، فهد: صراع الأجنحة ٢٣٤.

## سێ دامەزراوەکە حوکمی ڕەها تێک دەشکێنێت

چەند مانگ و ساڵانێ تێپەڕین، هیچ شتێ وەك چاکسازی ئەنجام نەدرا تا ڕوودانی گەردەلولەکە کە بریتیە لە جەنگی کەنداوی دووەم ساڵی ١٩٩١ و ئەو ڕووداوانەی دوای ئەوە هاتنە کایە لە ناو سعودیەدا و دروست بوونی ئۆپۆزۆسیۆن، کە خۆی دەبینیەوە لە پێشکەش کردنی یاداشتنامەی ئامۆژگاری لەلایەن هاوڵاتیان بۆ حکومەت، جا شا فەهد لە بەرواری ١٩٩٢/٣/١ هەڵسا بە ڕاگەیاندنی سێ دامەزراوە:(سیستەمی بنرەتی حوکمرانی و سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ و سیستەمی ناوچەیی یان هەرێمەکان). پێکهێنانی ئەنجومەنی ڕاوێژ کە پێك دەهات لە ٦٠ ئەندامی دیاریکراو.

زۆربەی بنەما بنەڕەتیەکان جەختیان دەکردەوە لەسەر پێدانی دەسەڵاتی فراوان بە پاشا، بەشێوەیەك کە پاشا دەبووە خولگەی سەرەکی و کۆتایی بۆ ژیانی سیاسی و دەبووە خاوەنی ڕۆڵی ڕەها لە ئەنجامی:

١_ هەڵبژاردن و لابردنی جێگرەوەی ڕاسپێرراو (ولی العهد) (ماددەی: ٥).

٢_ سەرۆکایەتی کردنی هەر دەسەڵاتی: جێبەجێ کاری و یاسادانان و دادوەری. (ماددەی: ٤٤).

٣_ دانان و لابردنی دادوەران و جێبەجێ کردنی حوکمە یاساییەکان (ماددەی: ٥٠ و ماددەی: ٥٢).

٤_ سەرۆکایەتی کردنی ئەنجومەنی وەزیران و دانان و لابردنی وەزیرەکان و هەڵوەشاندنەوەو پێکهێنانی وەزارەتەکان (ماددەی: ٥٦ و ٥٧).

٥_ دانان و لابردنی ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوێژ و هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکە و دیاری کردنی جێگرەوەکەی (٦٨).
٦_ دانانی دامەزراوەو ئەنجامدانی هاوپەیمانی و پێکهاتنە نێو دەوڵەتیەکان و دانانی پەلەو پۆستەکان و چاکسازی کردن تیایاندا و ڕەتکردنەوەی (ماددەی: ٧٠).
٧_ ئامادەکردن و دیاریکردنی بودجەی گشتی دەوڵەت (ماددەی: ٧٦).
٨_ بەخشین لە سەروەتی گشتی لە دەرەوەی بودجەی دیاریکراوی دەوڵەت (ماددەی: ٧٣).
٩_ چاکسازی و گۆڕان کاری ئەنجام دان لە سیستەمی بنەڕەتی (ماددەی: ٨٣).
١٠_ یەکلایی کردنەوەی ڕاجیایی لە نێوان ئەنجومەنی ڕاوێژ و ئەنجومەنی وەزیران (ماددەی ١٧ سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ).
١١_ دیاری کردنی ئەمیری ناوچەکان و جێگرەکانیان و پارێزگاری پارێزگاکان و ئەندامانی ئەنجومەنی ناوچەکان و لادانیان (ماددەی: ٤ و ١٠ و ١٦ و ٢٠، سیستەمی ناوچەکان).

لەو کاتەی کە سیستەمی بنەڕەتی ئەو دەسەڵاتە فراوانانەی دا بە پاشا ئەوا هیچ کاتێ ئاماژەی نەکردووە بۆ ئەرکەکانی پاشا و ڕێگەی نەداوە کە پاشا ملکەچ بکات بۆ هیچ سیستەمێکی لێ پرسینەوەو بەدواداچوون. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پاشا تەنها بێت لە ناو ژیانی سیاسی دا و پارێزگاری کرد لە شێوازی سیستەمی پاشایەتی ڕەها کە بە فیعلی هەبوو لەوەتەی دامەزراندنی سیستەمی سعودی لە سەرەتای سەدەی بیستەم.

سیستەمەکە ڕێگەی لەسەر کار لابردنی پاشای ڕوون نەکردەوە کاتێ کە پاشا لاواز بێت یان تواناى بەڕێوەبردن کاری نەبێ یاخود لە ڕێگە لابدات، تەنانەت لەلایەن خانەوادەی خاوەن دەسەڵات و ئەنجومەنی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (حل و العقد)، کەچی پێویست بوو لەسەر سیستەمی نوێ کە ڕێگەی لە کار لابردنی دیاری بکات و ئەو لایەنەش دیاری بکات کە پێی هەڵدەستێت وەك ئەوەی ئەو کارە بداتە دەستی ئەنجومەنی ڕاوێژ هەروەك ئەم حاڵەتە پەیڕەو دەکرێ لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهاندا یان ئەو کارە بدرێتە دەست ئەنجومەنی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان (الحل و العقد) یاخود بدرێتە دەست خانەوادەی خاوەن دەسەڵات. بەڵام سیستەمی بنەڕەتی قسەکردن لەسەر ئەو بابەتە زیندوویەی فەرامۆش کرد و بەجێی هێشت بۆ هاوکێشەکانی هێز لە داهاتوودا.

لەگەڵ ئەوەی سیستەمی بنەڕەتی لە ماددەی هەشتەم دا ئاماژەی کردووە بۆ ئەوەی کە حوکم لە سەر بنەمای ڕاوێژ دەبێت و سیستەمێکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستەی دەرکرد، بەڵام ئەو ئەنجومەنەی کە قسەی لەسەر کرابوو ئەوا ئەنجومەنێکی دیاریکراو و دەسنیشان کراو بوو نەوەك هەڵبژێرراو. سیستەمەکە مافی یاسادانانی نەدا بە ئەنجومەنەکە بەڵکو مافی پێشکەش کردنی یاساکانی پێدا و بەس. هەروەك لە ماددەی حەڤدەهەم هاتووە لە سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژدا و دەڵێت: " بڕیارەکانی ئەنجومەنی ڕاوێژ بەرز دەکرێنەوە بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و ئەویش دەیخاتە بەردەمی ئەنجومەنی وەزیران بۆ تاوتوێ کردنی، جا ئەگەر تێڕوانینەکانی هەر دوو ئەنجومەنەکە یەکیان گرت و وەك یەك بوون لەسەری

ئەوا دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی پاشا ئەوا دەردەکرێت، جا ئەگەر تێڕوانینەکان جیابوون ئەوا پاشا ئەوەی پێی باش بوو بڕیاری لەسەر دەدات"[1].

سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ گرەنتی هیچ پاراستن (حصانة)یەکی سیاسی نادات بە ئەندامانی ئەنجومەنەکە، بەڵکو وەك گشت پیشەوایانی خزمەت گوزاری مەدەنی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت، کە ئەمەش ڕێگە دەدات بە دەسەڵات کە بڕیاری لێپێچینەوەی کارگێڕی بدات دژی هەر یەکێکیان، تەنانەت دادوەر لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات و سزایان بدات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەنجومەنەکە ئازادی و سەربەخۆیی و توانای ڕووبەڕو بوونەوەی دەسەڵاتی جێبەجێکاری و لێ پێچینەوەی لە دەست دەدات[2].

لەو کاتەی سیستەمی حوکمڕانی داوا لە هاوڵاتیان دەکات کە بەیعەت بدەن بە پاشا لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لە ناخۆشی و خۆشی و لە هەبوونی و نەبوونی دا (ماددەی: ٩)، بانگەشەش دەکات کە منداڵەکان

---

(١) ابن باز، احمد عبدالله: النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٣٢٢.

(٢) د. ئەحمەدی ئیبن باز دەڵێت: ماددەی شەشەم لە سیستەمی ئەنجومەنی ڕاوێژ جەخت لەوە دەکاتەوە کە: " ئەگەر ئەندامێکی ئەنجومەن کەم و کورتی و بێ سەروبەری کەوتە ناو کارەکانیەوە ئەوا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرێت و دادگایی دەکرێت بەپێی بنەما و ئەو ڕێوشوێنەی پاشا دەری دەکات ". فەرمانی پاشایی دەرکار کە بنەماکانی لێکۆڵینەوەو دادگایی ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوێژ لە خۆی دەگرێت، ئەو سێ سزایەی بۆ داناوە: أ_ سەرزەنشتی دەکرێت بە نووسین. ب_ بڕین و پێنەدانی پاداشتی مانگێك. ج_ پەخستنی لە ئەندامێتی. لەگەڵ ڕێگەدان بە بەرزکردنەوەی سکاڵای گشتی و تایبەتی دژ بە ئەندامەکە. / النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٢٢٨.

پەروەردە بکەن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی پاشا (ماددەی نۆیەم) ئەوا هیچ مافێك نادات بە ئوممەت لە هەڵبژاردنی پاشا و لابردنی، هەروەك خۆی دوور دەگرێت لەوەی بە ڕاشکاوانە دان بنێت بە مافە سیاسیەکانی هاوڵاتیان، بەتایبەتی ئازادی عەقیدەیی و بیروڕا و، مافی بەشدار بوونیان لە پرۆسەی سیاسی لە ڕێی پێکهێنانی حیزب و سەندیکاکان[1].

لەبەرامبەردا سیستەمی بنەڕەتی دەقی دانەوە لەسەر بەستنەوەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە دەوڵەتەوە و پابەندبوونیان بە سیاسەتەکانی دەوڵەت (ماددەی: ٣٩). ئەمەش مانای وایە کە مافی هاوڵاتیان زەوت بکرێت لەوەی ڕای خۆیان دەربڕن لەهەمبەر ئەو شتانەی کە کۆك نین لەگەڵ سیاسەتەکانی حکومەتدا.

سیستەمی بنەڕەتی جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە گەل هیچ ڕۆڵێکی نییە لە گۆڕینی ماددەیەك لە ماددەکانی سیستەمەکە، بەڵکو چۆن ماددەکە داڕێژراوە ئەوا هەمان سەرچاوە هەڵی دەوەشێنێتەوە بەویستی پاشایەتی، هەروەك ئەمە بەڕاشکاوی لە ماددەی (٨٣) دا هاتووە.

لە سیستەمی بنەڕەتی دا بەدەق جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە حوکم کردندا پشت دەبەسترێت بە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر هەروەك لە ماددەی (١، ٥، ٦، ٧) و ماددەکانی تردا هاتووە، بەڵام دەقەکانی ڕوون

---

(١) چەندین نوسراوی پاشایەتی دەرچوون لە ساڵی ١٩٦٥ کە بە ناڕەواو حەڕامی دەزانی کە حیزب و ڕێکخراوی سیاسی پێك بهێنرێن و خۆپیشاندان بکرێت و کار ڕابگیرێت، تەنانەت لایەنگیری هەر حیزبێ یان بانگەوازی کردن بۆی بە تاوان دادەنرا بەرامبەر بە دەوڵەت، دەقیش هاتووە لەسەر ئەوەی هەر کەسێ ئەو تاوانانەی باس و وەسفیان کرا ئەنجامی دا ئەوا سزاکەی یان بەندینخانەیە یان شاربەدەر کردنە یاخود لەسێ دارەدانە.

نەکردۆتەوە کە سیستەمەکە پشت دەبەستێ بە سروشتی میرات گری و کورت هەڵهێنانی حوکم لە خانەوادەی سعودیدا، هەروەك لە ماددەی (٥) هاتووە.

لەگەڵ ئەمەشدا شا فەهد وەسفی سیستەمە بنەڕەتی و سیستەمە نوێیەکەی ئەنجومەنی ڕاوێژی کرد بەوەی لەسەر بنچینەی ئیسلام پێکدێت و فەرمایشتی خوای پاك و بەرز جێبەجێ دەکات:﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُم ﴾ الشورى: ٣٨. واتە: (کاروباریان هەردەم بە مشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە). کار دەکرێت بۆ گەشە پێدانی سیستەمەکە " و پێشتر لە زۆر حاڵەتی تردا باسمان کردووە کە وڵات لە کۆنەوە ئەنجومەنی ڕاوێژی تێدا دامەزراوە، لەو ماوەیە درێژەدا پرۆسەی ڕاوێژ بە جۆری جیا جیا بەردەوام بووە، هەروەك چۆن حوکمڕانانی شانیشین لێراهاتوون لەسەر ڕاوێژ کردن بە زانایان و خاوەن بۆچوونەکان، لە کاتی پێویست دا... لە ڕەحمەت و میهرەبانی خواوەیە بۆ خەڵکی: کە خوای گەورە لە شەریعەتەکەیدا یەك شێوەی ڕاوێژی بۆ جێبەجێ کردن دیاری نەکردووە، بەڵکو ڕاوێژو چونیەتیەکەی بۆ ئیجتهادی موسڵمانانی بەجێهێشتووە لە گشت کات و سەردەمێکدا "[1].

(١) آل السعود، فیصل: رسائل أئمة التوحيد ١٧٨ _ ١٧٩ و پاشا ڕاستی وتوە کە خوای گەورە لە شەریعەتەکەیدا شێوازێکی تایبەتی دیاری نەکردووە بۆ ڕاوێژ، تەنانەت زانایانی موسڵمانانیش لە مێژە ڕاجیاییان هەیە لەسەر پابەند بوونی حوکمڕان پێی یان پابەند نەبوونی، بەڵام کێشەکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە حوکمڕانان مافی هاوڵاتیان و مافی شەرعناسانیان داگیر کردووە لە کۆشش کردن و هەوڵدان بۆ سەپاندنی ڕاو بۆچوونەکانیان بە زەبری هێز و، ڕەتکردنەوەی پرۆژەی ڕاوێژی ڕاستەقینە کە گشت موسڵمانان کۆ دەکاتەوە، سەربای گومان هەبوون بە ناسنامەی موسڵمانان و تۆمەتبار کردنیان بە بێ باوەڕی و هاوبەشدانان و کورت هەڵهێنانی سیفەتی (یەکتاناسی و ئیسلام) لە کۆمەڵەیەکی بچوکی خەڵکیدا.

بەهەر حاڵ سیستەمی بنەڕەتی کە شا فەهد پێشکەشی کرد بوو سەرکەوتوو نەبوو لە جێبەجێ کردنی داواکارییەکانی هاوڵاتیان بۆ هێنانە کایەی دیموکراسی، بەتایبەتی لەلایەنی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوێژ[1] و ئەمەش بە بەخشین و دیاری دیاریکراو دەچوو کە دەکرا لێی پاشگەز ببێتەوە لەهەر کاتێکدا[2]، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە سیستەمی سعودی بڕوای وایە کە مافی قۆرخ کردنی دەسەڵاتی هەیە کە بە زەبری شمشێر بەدەستی هێناوەو دان نەنێت بە مافی گەل لە دەسەڵات دا یا بوونی بەسەرچاوە بۆ دەسەڵات. بۆیە هەموو فیکرەیەك پەراوێز خراو و دوورخرایەوە لە هەمبەر سیستەمی سیاسی کە گەل لە ڕێی ڕاپرسی گشتی یان لە ڕێی ئەنجومەنی ڕاوێژی هەڵبژێردراو مشتومڕو دەنگی لەسەر بدات. تا ئێستاش سیستەمی سعودی ئەنجامدانی هەموو جۆرە هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی یان سەرۆکایەتی یاخود وەرگرتنی ڕای گەل لە دیاریکردنی پاشای داهاتوو

---

(١) ئەمیر وەلیدی کوڕی طەلال دوای ڕووداوەکانی ١١سێپتێمبەری ٢٠٠١ لە گفتوگۆیەك دا لەگەڵ ڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز بانگەشەی کرد بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژی سعودی، هەروەك ئاماژەی کرد بۆ " ئەوەی چەند ئەو پرۆژەیە زووتر جێبەجێ بکرێت ئەوا باشترە بۆ شانیشین. وە ئەگەر ڕێگە درا بە خەڵکی تا گفتوگۆ بکەن بە ئازادی و بەژداربن بە ڕێژەیەکی گەورە لە پرۆسەی سیاسی دا، ئەوا لە باوەش گرتنی ئەوان ئاسن دەبێت و دەکرێت بکرێنە بەشێ لە پرۆسەکە ". وەلید وتی فیکرەی گۆڕان و چوونی پلەبەندی بەرەو دیموکراسیەتی دیاریکراوە کە گفتوگۆی ئاشکرا ئەنجام دەدرێ لەناو خانەوادەی خاوەن دەسەڵات، سەرباری ئەوەی کە مشتومڕ ناکرێ لەسەر ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی سعودی وەك ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنەکان، کە لە ژێر چاودێری دەوڵەت دان یاخود موڵکی دەوڵەتن.

(٢) د. ئەحمەد ئیبن باز دەڵێت: " شێوازی گەشە سەندنی سیستەمی سیاسی حوکمڕانی زیاتر بە شێوازی خەڵات و بەخشین دەچوو ". / النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية ٩٨.

ڕەتکردۆتەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای هێزو زاڵ بوون و خۆسەپاندن بەردەوامە، لەگەڵ وەرگرتنی بەیعەت لە خەڵکی بەشێوەیەکی ڕووخسارییە کە کاریگەری نییە لە پێشخستن و دواخستنی هیچ شتێکدا.

پێویست ناکات کە بڵێین فیکرەی سیاسی وەهابی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر هەمان سیستەمی سعودی سیستەمی سیاسی خۆی بنیاد دەنێت، یەکدەگرێ لەگەڵ سیستەمی سعود لە پێدانی دەسەڵاتی ڕەها بەسیستەمەکە لەسەر حیسابی گەل کە سیستەمەکە گومانی لە ناسنامەی موسڵمانێتی زۆرێ لە تاك و تەیارو دەستەو کۆمەڵەو حیزبەکانی گەل هەیە. هەموو جۆرە دەستێوەردانێك لە پەیکەری بنەڕەتی ڕەت دەکاتەوە کە لە میانەیدا دەسەڵاتەکان دابەش کراون لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو دەسەڵاتە لەدەستی بڕوات کە بەدەستی هێناوە بەهۆی داگیر کردن و تێکشکاندن و زاڵ بوون.

## پێکهێنانی دامەزراوەی ئایینی وەهابی

ئەزموونی (ئیخوان) ئەوەی سەلماند کە فیکری وەهابی تەکفیری دەکرێ ببێتە چەکێك بە دەستی حوکمڕان دژی گەل، دەشکرێ ببێتە چەکێك بەدەستی گەل یان چینێك (وەك بزوتنەوەی وەهابیەت) لە دژی حوکمڕاندا، بەتایبەتی ئەگەر حوکمڕان لە شەریعەتی ئیسلامی لایدا و "هەڵگەڕاوە" و "یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان و یەکتاناسی ئەنجامدا "، مەگەر زاڵ ببێت بەسەر فیکرەکە و بە زەبری هێز لغاو و کۆنتڕۆڵی بکات. سەرباری ئەوەی ئیبن سعود چووە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ (ئیخوان) و زۆر نەمابوو تەخت و عەرشی خۆی لە دەست بدا، سەرەڕای ئەوەی وەهابیەت سەرچاوەیەکی بێ زارکەر بوو بۆ ئیبن سعود، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن سعود بڕیاری دا کە پاك و پوختی بکاتەوەو ڕەتی بکاتەوە بە تەواوی، چونکە بزوتنەوەکە بەردەوام چەکێکی گرنگ بوو دژ بە کۆمەڵانی دانیشتووان ئەوانەی کە جیا جیابوون و داوای دیموکراسیان دەکرد یاخود داوایان دەکرد کە بەژداربن لە دروست کردنی بڕیاری سیاسی، لەبەرئەوەش کە بزوتنەوەکە گومانی هەبوو لە ناسنامەی موسڵمانێتی ئەو کۆمەڵانە و داوای دەکرد بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی ڕەها دەربڕن بۆ حوکمڕان. ئیبن سعود متمانەی بەخۆ بوو کە دەتوانێ زاڵ ببێت بەسەر بزوتنەوەی وەهابیەت و دەتوانی سوودی لێ ببینێت بۆ ئامانجە سیاسیەکانی و دامەزراندنی سیستەمێکی خۆسەپێنەری ڕەها.

لەگەڵ ئەوەی وەهابیەت لاسایی کردنەوەو تەقلیدی ڕەت دەکردەوەو بانگەشەی کردنەوەی کۆشش و ئیجتهادی دەکرد و گەڕانەوە بۆ فراوانی ئیسلام و خۆنەبەستنەوە بە سەرچاوەکانی توێژەرەوە (موفەسیر) و کۆششکار (مجتهدین)ە کۆنە بیر تەسکەکان، جا ئیبن سعود مەترسی لەوەدا بینی کە دەرگا واڵا بکرێت بۆ هەر کەسێ کە دمیەوێت تەفسیری ئیسلام یاخود تەفسیری وەهابیەت یان هەتا تەفسیری دەقی وتەکانی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بکات و جێبەجێی بکات لە واقیعدا و زانی کە ئەم دەرگایە بکرێتەوە ئەوا فیتنەو ئاشوبی بۆ دروست دەبێت، بۆیە هەڵسا بە بنیادنانی دامەزراوەی وەهابیەت یاخود دانانی دامەزراوەیەکی ئایینی وەك "مەرجەعیەتی ئایینی شیعی" یان "فاتیکان" یاخود "لیژنەی ناوەندی لە حیزبی شیوعی لینینی". بەڵام لەگەڵ جیاوازییەکی زۆر کە بریتیە لە دامەزراندنی دامەزراوەی ئایینی وەهابیەت لەلایەن چینی باڵاوە نەوەك هەڵبژاردنی لەلایەن بنکەی جەماوەرەوە. ئیبن سعود ڕاسپاردە یەکلاکەرەوەکانی خۆی دەرکرد کە پێویستە گشت کەسێ شوێنی دامەزراوە ئایینیەکە بکەوێت کە دایمەزراندووە یان بە شێوە دەربڕینێکی وردتر پابەند بێت بە ڕێڕەوی قوتابخانەی ئالی شەیخ لە تەفسیر کردنی وەهابیەت و ئیسلام و قەدەغە کردنی هەر چالاکیەکی فیکری ئیسلامی ئازاد لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە ئەگەر وەهابیش بێت.

هەر لەمیانەی ئەمەدا عەبدولعەزیزی کوڕی سعود پەیامێکی ئاراستەی گشت زانایان کرد، کە تیایدا هاتووە: " .... لە ئێوە ناترسێ (ترسی لەئێوە نییە) سەرەتا هاتنە کایەی ئەو بانگەوازە و پشتیوانی کرانی لەلایەن خوای گەورە، دواتر هۆکارەکانی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب و پێشینانمان

_ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _ و ئەو دەردە سەرییەی بەسەر موسڵمانان دا هاتووە لە ئەنجامی ڕاجیاییان لەگەڵ حوکمڕانەکانیان، جا هەر کە کاروبارەکە ڕاجیایی تێکەوت و هەڵوەشانەوەی ئایینی خواو کوژانەوەی نوری پەروەردگار نزیك بوویەوە ئەوا خوای گەورە ڕێگری لێ دەکات بەوەی لە دوو بارهەڵگرەکە[1] کەسێ دەردەخات کە ئایین پایەدار بکات ...

پاشان دوای ئەمە تێدەگەن: کە هۆکارەکانی خراپەو تاوان کاری زۆرن و ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی فرە بۆچوون و ڕا لەلایەن هەندێ لە خەڵکی، یەکێ بەدوای سەرپێچیەوەیە و یەکێکی تر دەیەوێت سەرکردایەتی بەدەست بێنێت و کەسێکی تر نەزانە بە دوای ڕاستیدا وێڵە بەڵام ڕێگای لێ ون بووەو شوێنی هەوەسی خۆی کەوتووە، جا ئەمانە گشتیان پێچەوانەی شەرعن... دەزانن کە لەوەتەی خوای گەورە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابی دەرخست لە ڕۆژگارێکی چاکتر لە سەردەمی ئێمە و لەناو پیاوانێ چاکتر لە پاوانی ئێمە و زانایانێ باشتر لە زانایانمان ئەوا خوای گەورە ئاراستەی کرد بۆ ڕاستی و ئەو بانگەوازەی بەهۆی ئەو پایەدار کرد و ئەو کاروبارەی پێ نوێ کردەوەو خەڵکی بەهۆی ئەوەوە لە گومڕایی ڕزگار کرد، جا بانگەوازەکە بۆ بیرتیژو زاناکان ڕوون بوو و لەلایەن زۆرێ لە خەڵکی شاراوە بوو... باب و باپیرانمان و زانایانی موسڵمانان ئەو بنچینەو لق و پۆپانەی کە شێخ هێنابووی پێی ڕازی بوون و قبوڵیان کرد و پێویستە لەسەر ئێمە و ئێوە بەویستی خوا شوێنی ئەوە بکەوین کە ئەوان شوێنی کەوتوون. لە ئێوە ناترسم بەهۆی حاڵی ئەو سەردەمە و زۆری زانستخوازان و پرسیار کەران و کەم بوونی

---

(١) مەبەستی ئالی شەیخ و ئالی سعودە.

بیرتیژی و تێگەیشتن، لەئێوە ناترسم لە ڕاجیایی زانایان لە بابەتە لاوەکیەکان...

ئێستا کاروبارەکان وەك ئەوە دەبێت کە پێشتر شێخەکان باسیان کردووە، جا هەر کەسێ فەتوای دەرکرد و قسەی کرد بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدوەهاب و کوڕەکانی: عەبدوڵلا و عەبدوڕەحمان و عەبدوڵلەتیف و عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵەتیف، ئەوا ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە لە دین و دونیایی دا، چونکە ئێمە دەزانین کە تەنها کەسانێ پێچەوانەی بۆچوونی شێخ و کوڕەکانی دەجوڵێنەوە، کە مەبەستیان چاندنی تۆی خراپە و تاوانە لەلایەن موسڵمانان.

ئێوە هەمووتان _ زانایانی موسڵمانان _ پابەندبن بەمەوە و هەڵسن دژبەوەی کە کەم یان زۆر دژی ئەمەی باسکرا هەڵسوکەوت دەکات جا ئەوەی تواناتان بەسەریدا هەبوو تەمبێی بکەن و ئەوەی تواناتان بەسەردا نەشکا ئەوا بۆلای ئێمەی بنێرن. ئەگەر کەسێکیش هەبوو ڕاجیاواز بوو بەڵام بەڵگەشی پێبوو لە قورئان و سوننەتدا ئەوا پێویستە ئازار نەدرێ تا ڕووبەڕووی زانایانی موسڵمانان نەکرێ و حەقیقەتەکەی دەزانین، بەڵام ئەوەی بەبێ بەڵگە پێچەوانە هەڵسوکەوت دەکات ئەوا ئێمە و موسڵمانان لێی بەرین و لامان شاراوە نییە کە لە مەترسیدایە "[1].

ئیبن سعود ناوچەی (الهجر)ی قەدەغە کردبوو لەوەی پێشوازی بکات لە زاناکانی تر ئەگەر وەهابیش بێت مەگەر ئەو زانایە لەناو دامەزراوەی ئایینی سەر بەدەسەڵات بێت[2] و فەتوادان یان ڕاڤە و تەفسیر کردنی قورئانی قەدەغە

---

(١) التويجري، عبدالعزيز، لسراة الليل هتف الصباح ٥٢٠.

(٢)التويجري، لسراة الليل ٣٩٨.

کرد یاخود تەنها ڕێگە بە تەئویلی دەقەکانی دەدا تەنها لە چوارچێوە دامەزراوە ئایینیەکە، هەرەشی لەوانە کرد کە پێچەوانەی ئەو بڕیارانەی دەجوڵێنەوە بەوەی سزایەکی توونڕیان دەدات[1] و (ئیخوان)ی ئاگادار کردەوە کە هەندێکیان هەوڵی ئەوەدەدەن کە ئیخوان ببەنە دەرەوەی ئایینەکە و ڕێگری لێ کردن لە پرسیار کردن لە زانایان تەنها ئەوانە نەبێت کە دەسەڵات دیاریان دەکات وەك: شێخ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵەتیف، شێخ سەعد عەتیق، شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدوڵەتیف، شێخ عەبدوڵڵا عەنقەڕی، شێخ عەبدوڵڵای کوڕی سەلیم، شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی سالم. پێی وتن: "هەر کەسێ زانستخوازێکی لەلا بوو بەڵام پرسیاری لێ نەکرد یان پرسیاری لە کەسێ کرد جگە لە زانا ناوبراوەکان یان لە یەکێ لە زانستخوازەکانی تر ئەوا من لێی بەریم و دووریش نابێت لەسەر زەنشت "[2].

ئا بەو شێوەیە دامەزراوەی ئایینی وەهابی دروست بوو بەپێی ویستی حوکمڕان، لە خاڵ و دەسپێکی ئەوەی کە گوێڕایەڵی ڕەها بۆ ئیمام پێویستە، ئەو دامەزراوەیە لە ویستی ئوممەت یاخود بزوتنەوەی وەهابی جەماوەری گەڵاڵە نەبوو، حوکمڕانانی ئالی سعود لێڕاهاتن لەسەر هەڵبژاردنی پیاوێك لە خانەوادەی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بۆ سەرۆکایەتی کردنی دامەزراوەکانی ئایینی و خوێندن و دادوەری، تەنانەت کورت هەڵهێنانی فەتوا لەو خانەوادەدا وەك جێبەجێ کردنێکی ئەو هاوپەیمانیە ستراتیژییەی نێوان (ئالی سعود و ئالی شێخ). هەر لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی سعودییەی

---

(١) التويجري، لسراة الليل ٣٨٨.

(٢) التويجري، لسراة الليل ٤٧٦.

یەکەم تا ئەمڕۆ[1]. هیچ کەسێ لەو بەرنامەیەدا لاینەداوە تەنها شا فەیصەڵی کوڕی عەبدولعەزیز نەبێت کاتێ دوای مردنی شێخ موحەممەد ئیبراهیم هەڵسا بە دانانی دەستەی گەورەی زانایان کە ۱۷ زانا بوون بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدوڵڵا ئیبن باز، کاتێ شێخ ئیبن باز مرد لە ساڵ ۱۹۹۸ ئەوا شا فەهد گەڕایەوە بۆ سەر بنچینە کۆنەکەی و شێخ عەبدولعەزیزی ئالی شەیخی دیاری کرد وەك موفتی گەورە، سەرباری بوونی زانای گەورە و شارەزاتر لەو، بەڵام شا فەهد ئەمەی کرد وەك پابەند بوونی بە لاسایی کردنەوەی سعودی کۆن کە بریتیە لە کورت هەڵهێنانی سەرۆکایەتی ئایینی لە ئالی شێخدا[2].

---

(۱) شێخ موحەممەدی کوڕی ئەو کوڕانەی بەدوای خۆیدا بەجێهێشتن، عەبدوڵا (کە مەرجەع و پێشەوای گەورەی دینی بوو لەسەردەمی عەبدولعەزیز و سعود و عەبدوڵڵادا) و حەسەن ئەویش عەبدوڵای لەدوای خۆی بەجێهێش (کە بووە مەرجەع و پێشەوای گەورەی دینی بۆ دەوڵەتی سعودیەی دووەم، لەسەردەمانی تورکی کوڕی عەبدوڵا و فەیصەڵی کوڕی تورکی) ئەمەش عەبدوڵەتیفی لەدوای خۆی جێهێشت (کە بووە مەرجەعی دینی بۆ فەیصەڵ)، ئەمەش عەبدوڵڵای بەجێهێشت (کە بووە مەرجەعی دەوڵەتی سعودیەی سێیەم لە ساڵی ۱۹۰۲ تا کۆچی دوایی کرد ۱۹۲۱)، ئەوەش موحەممەدی کوڕی عەبدوڵەتیفی ئالی شێخی بەجێهێشت کە بووە مەرجەع بۆ دەوڵەت لە ساڵی ۱۹۲۲ تا ۱۹۳۲ دواتر شێخ موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی خانەوادەی شێخی بەجێهێشت کە بووە مەرجەعی هەرە بەرز بۆ ماوەی چل ساڵ لە ساڵی ۱۹۳۲ تا ۱۹۶۹ز.

ئەو شێخە (موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم _ و _) هەژدە پلە و پۆستی هەبوون کە بریتی بوون لە پۆستی دینی و دادوەری و خوێندن و کارگێڕی و فەتوادان و سەرۆکایەتی کۆلیژەکان و پەیمانگا دینیەکان تا سەرۆکایەتی هەرە بەرزی دادوەری، کوڕەکانی ئیبراهیم و عەبدولعەزیز و براکانی عەبدولەلیك و عەبدوڵەتیف و کوڕە مامی شێخ عومەر حەسەن و شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولعەزیز و شێخ حەسەنی کوڕی عەبدوڵڵای ئالی شەیخ یارمەتیان دەدا. انور عبدالله، العلماء و العرش ٣٤٦.

(۲) ژمارەی ئەمیرەکانی ئالی سعود دەگاتە نزیکەی ٦٠٠٠ پیاو، بەهەمان شێوە ژمارەی پیاوانی ئالی شێخیش هەمان ڕێژە دەبن، هەردوو خانەوادەی ناوبراو بەیەکەوە دەستەی حوکمڕان پێکدەهێنن و

## پاشکۆ بوون بۆ دەسەڵاتی سیاسی

لەبەرئەوەی حوکمڕان زانایان دادەنێتە پۆستەکان و هەر ئەویشە پێشوازی دەکات لەوەی دەیەوێت و ئەوەش دەردەکات کە دەخوازێت، هەر حوکمڕانە پارەو کەل و پەل و شتیان پێ دەدات، لەبەر ئەوەی ئەوان بڕوایان وابووە کە لە هەر حاڵێکدا بێت ئەوا گوێڕایەڵی بۆی پێویست و واجبە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئازادی لەدەست بدەن لە چالاکی فیکری و ئیجتهاددا، تەنانەت ئەو زانایانە وەك فەرمانبەرانێك لێهاتن کە مووچە و ڕێنمایی لە حکومەت وەردەگرن و ئەو ئەرکانەیان جێبەجێ دەکرد کە پێیان دەسپێردرا، بۆیە ئەو سەربەخۆییە دیاریکراوەیان لە دەستدا کە هەیانبوو پێشتر وای لێهات کە چالاکی و کاروباری گشتیان خزمەتی بە حوکمڕان دەکرد. ئەوەیان لە دەست دا کە ڕابەرایەتی و ئاراستەی دەسەڵاتی سیاسی بکەن یا ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان بسەپێنن بەسەریدا و ناچاری بکەن لەوەی ڕێزی دیدو تێڕوانینەکانیان بگرێت.

لەبەر ئەوەی زانا وەهابیەکان (و لەسەرویانەوە ئالی شێخ) کە چەتری شەرعیەتی تەخت و عەرشی سعودیان پێکدەهێنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زانایانە بوونە تەنها کۆمەڵێك و گۆشاری لاوەکی و پەراوێز ئامێزیان هەیە کاتێ هێز دەخاتەگەر لەسەر هەندێ چالاکی حکومەت، خاوەنی ڕۆڵێکی

---

ئەوان بەیەکەوە بەستراونەتەوە لە ڕێگەی پەیوەندی ژنهێنان و ڕەچەڵەکەوە. یمانی، مي، هويات متغيرة ٦٦ _ ٦٧.

سەربەخۆی بەهێز نەبوون. بەشێوەیەك كە لەسەریان پێویست كرابوو كە ڕۆڵی خۆیان بگێڕن بەپێی پێداویستی و ئامانجە سیاسیەكانی شا ئیبن سعود. ئەگەر ڕایەكی پێچەوانەشیان هەبووبا، ئەوا پێویست بوو بە نهێنی ئاراستەی شا كرابا وەك داواكارییەكی كەسی كە پابەندكەر نییە[1].

ئەمەش ڕەنگی دایەوە لە ساڵانی سی و چلەكان، كاتێ شا عەبدولعەزیز دەرگاكانی شانیشنەكەی كردەوە بە ڕووی ئەمریكیەكان "ی بێ باوەڕ" و ڕێگەی پێدان كە بنكە و كۆگای سەربازی دابمەزرێنێت لە (الظهران)، ئەمە بووە هۆی توڕەبوونی پیاوانی ئایینی وەهابی زۆر بەتووندی، بۆیە هەندێكیان ناڕەزاییان بە ئاشكرایی دەربڕی، بەڵام نەیانتوانی هیچ لە سیاسەتەكە بگۆڕن. موفتی گەورە شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدوڵەتیف پەیامێكی ئاراستەی شا عەبدولعەزیز كرد و تیایدا ئەوەی خستۆتەڕوو كە دژی كرانەوەیە بەڕووی ئەمریكادا، هەروەك تیایدا وتویەتی: " ئەوەی پێویستە لەو كارەدا ئامۆژگاری كردنتانە، چونكە خوای گەورە ئەمە بەپەرستش بۆ ئێمە حیساب دەكات و تەنانەت پێویستیشی كردووە لەسەر ئێمە و فرت و فێڵ و بێ دەنگ بوونی لێمان حەرام كردووە بەڵكو پێویستی كردووە حەق و ڕاستی ڕوون بكەینەوە، خوای گەورە بەخششی لەگەڵ ئێوە كردووە بەو دەسەڵات و حوكمڕانیە ئیسلامیە دینیە كە لەسەری پێگەیشتوون و لە سایەیدا گوزەرانتان كردووە

---

(١) عەبدولعەزیزی كوڕی سعود هەفتانە بانگهێشتی هەندێ زانای دەكرد و لەگەڵیان كۆ دەبوونەوە بۆ گوێگرتن لە بیرو بۆچوونیان بەشێوەیەكی نهێنی. پێشی دەووتن: " هەر كەسێ شتێكی نابەجێی بینی ئەوا با بۆمی ڕوون كاتەوەو ڕێنماییم بكات بۆ ڕێگەی ڕاست، بەڵام با بەوشێوەیە بێت وەك ئیمامی عومەر بەو كەسەی وت كە دەیەویست ئامۆژگاری بكات:(با لەنێوانی من و تۆدا بێت)".

بەوەی شوێنی کەوتوون، بەڵام ئەی خۆشەویست... پێویستە لەسەرت ئەو دەسەڵاتە بپارێزی لەو شتانەی کە دەبنە هۆی داڕوخان و لەناوچوونی... گەڕان و سوڕانەوەی ئەو کەسە بیانیانە لە وڵاتی موسڵمانان دا بەو پاساوەی کە بۆ دۆزینەوەی (کانزا) و شتی تر هاتوون... ئەگەر کانزاش دەربخەن و بدۆزنەوە ئەوا وڵات پارێزراو نییە لە خراپە و تاوانیان... بۆ خاتری خوا ئەی ئیمامی موسڵمانان پارێزگاری بکە لەو دەسەڵاتە و بیپارێزە بە نهێنی و ئاشکرا چونکە خوای گەورە بانگت دەکات و لێت دەپرسێتەوە لەبارەی خەڵکی ژێردەستەکەت....

بەهەمان شێوە گەڕان و سوڕانەوەی ئەو خەڵکانە لە (نەجد) ئەوا دەروونی هەموو ئەوانە ئازار دەگرێت کە بە دڵەکەی بۆنی ئیمانی کردبێت. شتێکی جێماوە لە پێشینەکانتان _ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _ ئیمام فەیصەڵ و ئیمامەکانی بانگەواز بەرلە فەیصەڵیش ئەگەر کەسێکی بیانی چووبایە لای ئەوا خۆی لێیان دەپاراست و لە هەموو شوێنێ خزمەتکاری بۆ دادەنان تا کەسش نەچێتە لایان و نەگەڕێن و نەسوڕێنەوە لە وڵاتدا.

٢٢/ربیع الاول/ ١٣٥٥ _ ١٩٣٦ "[1].

بەڵام شێخ موحەمەد هیچ ڕێگە و ئامرازێکی بەدەستەوە نەبوو بۆ ئەوەی سیاسەتی پاشا بگۆڕێت، ئەگەر ڕاو بۆچوونێکیشی دەربڕیبا بۆ پاشا ئەوا لە خانەی ڕاوێژی ناپابەندکەر تێنەدەپەڕی. لەوانەیە حاڵی شێخ موحەمەد زۆر باشتر بێت لە حاڵی ئیمامی مزگەوتی (ریاض) کاتێ هەستی کرد بەوەی شا عەبدولعەزیز لە پشتیەوە نوێژ دەکات و هەڵەکەی قۆستەوە بۆ ئەوەی

(١) التویجري، عبدالعزیز، لسراة اللیل هتف الصباح ٣٧٨،

ڕەخنەیەکی نهێنی ناراستەی بکات و ئەو پەیوەندیەی هەیتی لەگەڵ ئەمەریکیەکان دەربخات، بۆ ئەم مەبەستە لە نوێژەکەیدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾[1] البقرە: ١٢٠. ئیمامەکە نوێژەکەی تەواو نەکرد ڕاستەوخۆ پاشا هێرشی کردەسەر و دەستی لە گەردەنی ئاڵاند و گووشی و بەدەنگێکی بەرزەوە هاواری دەکرد و دەیووت:﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ (١) لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٣) وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ (٤) وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ (٦) ﴾[2] الکافرون: ١_٦.[3]

سەبارەت بە شێخ عەبدولعەزیزی ئیبن باز ئەوا زۆرنەمابوو کە ملی خۆی ببەخشێت وەك نرخی وتەیەکی کە دژ بە پەیوەندی شا عەبدولعەزیزو

(١) واتە: (هەرگیز جولەکەو گاورەکان لە تۆ (ئەی موحەممەد _ صلى الله عليه وسلم _، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بەتەواوی شوێن ئایین و بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ بەڕاستی هەر بەرنامەی خوایە (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموو لایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستت پێ گەیشتووە، ئەوە بزانە کە لەلایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیار و یارمەتیەکت دەستناکەوێت). (وەرگێڕ).

(٢) واتە: ("ئەی موحەممەد ~" بڵێ: ئەی کۆمەڵی بێ باوەڕو خوانەناسان. من هەرگیز ئەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن نایپەرستم "چونکە من خواپەرستم". ئێوەش دیارە ئەوەی من دەیپەرستم نایپەرستن "چونکە بت پەرستن". ئەوەی ئێوە پەرستووتانە من هیچ کات نایپەرستم. ئێوەش، ئەو زاتەی من دەیپەرستم نایپەرستن. "کەواتە" دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم). (وەرگێڕ).

(٣) کشك، محمد جلال، السعودیون و الحل الاسلامي ٤٢٩.

ئەمریکیەکانی دەربڕی، ئەمەش کاتێ بوو کە ئیبن باز دادوەر و وتاردەر بوو لە (الخرج) ساڵی ١٣٦٤ك (١٩٤٤)، ئیبن باز ڕای خۆی دەربڕی لە وتارەکەیدا لەبەرامبەر خەڵکی دا و وتی: " بەڕاستی پاشا خیانەت و ناپاکی کرد لەگەڵ سپاردەو ئەمانەتەکەی و نیشتمانی فرۆشتە بیانیەکان، من بەچاوی خۆم بینی کە ئەمریکیەکان زەویان داگیر دەکرد لە (الخرج) و شتیان تێدا دەچاند و کرێکارە سعودییەکانیان ڕام و دەستەمۆ دەکرد و ڕێگاو بانیان دەکردەوە و ئاوە پوخت و دەگمەنەکەیان بەکار دەهێنا بەکەیفی خۆیان... ئایا پاشا مافی ئەوەی هەیە وڵاتمان و میراتی باب و باپیرانمان بفرۆشێتە هاوبەشدانەران؟ ".

پاشا بەدوای ئیبن بازی نارد و بانگهێشتی کرد و پێشوازی لێکرد بە ئامادەبوونی ئەمیرەکان و پیاوانی دەستوپێوەندی کۆشك و پاسەوانەکان و زانایان و ئەندامانی دادگای شەرعی باڵا، پاشا پێ وت:

_ ئەگەر لە شتێك ڕازی نیت ئەوا پێم بڵێ بە ئاشکرا (واتە: لەبەردەمی مندا)، چونکە ئیسلام داوادەکات کە ڕووبەڕووی حوکمڕان ببیتەوە نەوەك لە پشت پەردەو لە پشتەملەوە تۆمەتباری بکەیت.

شێخ ڕاوەستا لە بەردەم هەر هەمووان وتی: بەڕاستی پاشا نیشتمان و هاوڵاتیان دەفرۆشێتە بێ باوەڕان و ئەمەش پێچەوانەی ئەرکەکانیەتی وەك حوکمڕانێکی موسڵمان و پارێزەری دوو حەرەمە پیرۆزەکە و (مەشعەر)ەکان.

پاشان پاشا پێی وت: ئایا هەموو ئەو شتەی لاتە دەرتبڕی و وتت؟ وتی بەڵی، لەو کاتەدا پاشا لە سەر تەخت و عەرشەکەی هاتە خوارەوەو و چووەپێش بۆ لای و پێی وت:

_ من ئێستا تەنها موسڵمانێکم دەمەوێت شەرع ببێتە دادوەر لە نێوانمان دا، من عەبدولعەزیزم داوا لە دادوەران و زانایان دەکەم کە کێشەی نێوانمان یەکلا بکەنەوەو چارەسەری بکەن. و پاشا ڕووی کردە زانایان و وتی:

_ فەتوام بۆ بدەن... ئایا پێغەمبەر کەسی ناموسڵمانی بەکارهێناوە لە ئەهلی کیتاب و هاوبەشدانەران؟

دواتر پاشا دەستی کرد بە خستنەڕووی ئەو حاڵەتانە کە لە ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتوون، زانایان بەیەکدەنگی وەڵامیان دایەوە کە پاشا لە قسەکانی دا ڕاست دەڵێت. پاشا دووبارە پرسیاری کرد: ئایا من دەرچووم لە شەرع ئەگەر شوێنی سوننەتی پێغەمبەری خوا بکەوم، ئەزموونديدەی بیانی بەکاربێنم بۆ کارکردن بۆ خزمەتی خۆم و لەژێر ڕێنماییەکانی خۆم بۆ زیاد کردنی کەرستەکانی وڵات، ئەو بیانیانە بۆ بەرژەوەندی ئێمە کانزا و نەوت و ئاو و کەرستە بەفەرو بەرەکەتدارەکان دەردەهێنن کە خوای گەورە بە وڵاتی ئێمەی بەخشیووە؟

زانایان وەڵامیان دایەوە: کە پاشا هەڵەی نەکردووە.

پاشا لە شێخی پرسی: ئایا ڕازی بوويت؟

شێخ وتی: من ملکەچی بڕیاری زانایانم، بەڵام گوشاد نەبووەو ئۆقرەی نەگرتوە لەم بابەتەدا.

پاشا وتی: من شەرعم کرد بە دادوەر، زانایانی شەرعناسیش بڕیاریاندا کە من ڕاستم و تۆش هەڵەی... ئەگەر داوای لێبوردن نەکەی لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا ئەوا سەرت دەپەڕێنم.

شێخ لە ژێر چاودێری پاسەوانان دا دانرا. و مەجلیسەکە بڵاوەی کرد[1].

ئەمە مەسەلەی پشت بەستن نەبوو بە خاوەن ئەزموونەکانی بیانی، بەڵکو مەسەلەی پاشکۆیەتی و هاوپەیمانی ستراتیژی بوو لەگەڵ خۆرئاواو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەتایبەتی، بۆیە بوویە هۆی دروست بوونی نارەزایی لەلایەن زانا وەهابیەکان بەر لەخەڵکی تر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوا ئەنجومەنێکی ڕاوێژ نەبوو کە لە میانەیدا زانایان بتوانن لێپێچینەوە بکەن لەگەڵ حوکمڕاندا بەشێوەیەکی یاسایی یاخود سیاسەتێکی دیاریکراوی بەسەردا بسەپێنن، دواتریش پەیوەندی زانایان لەگەڵ حوکمڕان دا پەیوەندییەکی کەسی و ئارەزوو مەندانە بوو، بۆیە زانایان ئەو هێزەیان نەبوو کە گوشاری پێ بکەن و بیکەنە هۆی سەپاندنی دید و تێڕاونینەکانیان یاخود پاشا و دەسەڵاتی جێبەجێ کاری پابەند بکەن بەوەی پێشنیاری دەکەن، بەم هۆیە ناچار بوون کە لە ناو دەسەڵاتی شەریعەتی ئیسلامی وەك دەسەڵاتێکی ڕیزپەڕ ئالی سعود قبوڵ بکەن[2].

---

(١) کشك، محمد جلال، السعوديون و الحل الاسلامي ٦٤_٦٥.

(٢)لە ماوەی مێژووی شا عەبدولعەزیز دا نەبووە کە گوێی گرتبێت یان بەویستی زانایان هەڵسوکەوتی بکات تەنها لە چەند حاڵەتێکی کەم و ڕووکەشی و لاوەکی دا نەبێت، ئەمەش کاتێ زانایان نارەزاییان دەربڕی سەبارەت بەهەوڵی شا عەبدولعەزیز بۆ ئاهەنگ گێڕان بۆ جەژنی تەخت (عەرش) ساڵی ١٩٣٠ز و ١٩٥٠ز، چونکە زانایان ئەو کارەیان بە بیدعە دانا و پەشیمان بوونەوەو تەوبە بەپێویست دەزانن لەسەر بکەرەکەی، بۆیە شا لەو خواستە دابەزی و ئاهەنگەکەی ئەنجام نەدا. کشك، السعوديون و الحل الاسلامي ٧٨. و أنور عبدالله، العلماء و العرش: ٢٥٩ و ٢٦١. و الزركلي، شبه الجزيرة العربية ٧٤٤. فەیەصڵی کوڕی عەبدولعەزیزیش هەمان شتی کرد لە ساڵی ١٩٦٥. پیاوانی ئایینی ڕەزامەندیان دەربڕی لەسەر جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی بەسەر خەڵکی دا جگەلە خانەوادەی دەسەڵاتدار، بەشێوەیە کە لەوەتەی ڕووداوی ئەمیر ناصری کوڕی

---

عەبدولعەزیز ئەمیری (ریاز) لە چلەکانەوە هیچ حوکمێکی شەرعیان بەسەردا جێبەجێ نەکراوە، ئەمیری ناصرِ ئاهەنگی گێڕا لە ماڵەکەی دا کە عەرەق و مەیی تیایدا خورایەوە لە مانگی حوزەیران ساڵی ١٩٤٧ حەوت کەس مردن بە هۆی ژەهری کحولی، بۆیە پیاوانی ئایین داوایان کرد یاسای شەرعی بەسەر ئەمیرە گەنجەکەدا جێبەجێ بکرێت، بەڵام پاشا لەگەڵ پیاوانی ئایین گەیشت بە ڕێکەوتن و چارەسەرێ کە بریتی بوو لە لابردنی ئەمیر ناصر لە پۆستی ئەمیرایەتی (ریاز) یاخود هیچ پۆستێکی فەرمی پێی نەدرێت لە ناو دوڵەتدا یاخود نەکرێتە پادشا و نەیەتە سەر تەخت لە داهاتوودا، پاشا داوای لە زانایانی کرد کە کوڕەکانی ڕەوانەی دادگا نەکەن وەك خەڵکی لە پێناو پاراستنی پلەوپایەو هەیبەت و گەورەیی و ناوبانگی خانەوادەی دەسەڵاتدار. وابەدەر دەکەوێت کە زانایان ڕازی بوون لەسەر ئەوەی پاشا خۆی کاروبارو کێشەو گیرو گرفتەکانی خانەوادەو خزمە نزیکەکانی چارەسەر بکات یاخود زاایانیان ڕازی بوون کە خانەوادەی دەسەڵاتدار هەڵاوێرن و بە ڕیزپەڕ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن لە کاتی جێبەجێ کردنی یاساکانی شەرعەتی ئیسلامی و جێبەجێ کردنی سزاکان، شتێکی تریش کە بەڵگەیە لەسەر ئاسان و سادە هەڵسوکەوت کردنیان ئەوەیە کە کاتێ ئەمیر مشاری کوڕی عەبدولعەزیز دەستدرێژی کردە سەر ژنی جێگری باڵوێزی بەریتانی و ژنەکەی ناوبراوی کوشت ساڵی ١٩٥١ و خۆیشی پەنهان کرد لە ماڵی براکەی فەیسەڵدا هەتا کۆچی دوایی باوکی لە ساڵی ١٩٥٣، بەهەمان شێوە ئەمیر موحەمەدی کوڕی عەبدولعەزیز هەڵسا بە کوشتنی کوڕەزاکەی کە هەڵاتبوو لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا، بەڵام کوشتنەکە پێچەوانەی دەقە شەرعیەکان بوو دەقەکان فەرمان دەکەن کە زیناکاری ئافرەت و کوڕی شوو نەکردوو تەنها جەڵدیان لێبدرێت، چونکە ئەمیری هەڵاتوو لەگەڵ خۆشەویستەکەی دا ئەو کات ژنی نەهێنا بوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر دووکیان کوژران بە ئاشکرایی و بەپێی ڕێوشوێنی نەفامی (شۆردنی بێ ئابڕو: غسل العار) زانایانیش بێ دەنگ بوون لە بەرامبەر ئەم حوکمە ستەمکارییەدا وەك پابەندبوونێ بە هاوپەیمانی مێژووی نێوان ئالی سعود و ئالی شێخ لە هەمبەر جێبەجی کردنی شەریعەتی ئیسلامی. (عبدالله، انور: العلماء والعرش ٢٧٠ و ٢٩٥ _ ٢٩٧).

## کەنارگرتن لە سیاسەت

زانایانی ئەندام لە دامەزراوەی ئایینی وەهابیدا بەشدار نەدەبوون لە ژیانی سیاسی تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە سیستەمەکە داوای لێ دەکات بۆ پاراستنی یاخود بەرگری لێ کردنی، نەریتیش وابووە کە حوکمڕان لە کات و بارودۆخی ناخۆشدا ڕۆڵێکی دیار و بەرچاویان پێدەدات کاتێ پێویستی دەبێت بە شەڕعیەتی ئایینی و پەراوێزیشیان دەخات کاتێ کاری پێ نامێنن یان هەڵوێستی لەگەڵ هەڵوێستی ئەوان تێکدەگیرێت. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە سروشتی ملکەچی و پاشکۆیەتیان بەسەردا زاڵ بوو، کشانەوە لە سیاسەت و کاروباریان بۆ حوکمڕان بەجێهێشت تا بەکەیفی خۆی هەڵسوکەوت بکات، لە ئەنجامی دەست پێکردن بەو قسەیە:(سیاسەتدارییە کە سیاسەت نەکەیت) و (مادام شەڕعی خوا جێبەجێ دەکرێ و پاشا پارێزگاری دەکات لە پێج بنەماکانی ئیسلام و زانایان جێبەجێکاری ئاینن بەبێ ناچارکردن و خەم ساردی نواندن ئەوا پێویست نییە ئیمامی موسڵمانان لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت تا فیتنەو ئاژاوە هەڵ نەگیرسێت)[1].

---

(١) شێخ ئیبن باز پاساوی هێناوە بۆ یارمەتی وەرگرتنی شانیشنی عەرەبی سعود بە هێزەکانی بیانی (ئەمریکی و بەریتانی و جگەلەوانیش) بۆ جەنگ کردن لە دژی عێراق و لەو بارەوە شێخی ناوبراو وتی: " ئەوەی کە حکومەتی سعودیە پێی هەڵسا لەبەر ئەو ڕووداوانە بوون کە هاتنە کایە لە ئەنجامی ستەمکاری سەرۆکی دەوڵەتی عێراق لە بەرامبەر دەوڵەتی کومیتی، بۆیە یارمەتی وەرگرتنی دەوڵەتی سعودیە بە هێزە موسڵمان و نا موسڵمانەکان بۆ ڕێگرتن لە ستەمی دوژمنان و بەرگری کردن لە وڵات ئەوا ئەو کارە شتێکی دروستە و ناچاریی ئەو شتە پێویست دەکات، لەو

سەرباری ئەوەی پیاوانی ئاینی وەهابی شوێنێکی زۆر فراوانیان داگیر کردووە لە ناو ڕیزەکانی گەلدا، لە میانەی ئیمامەتی نوێژو وتاری هەینی و نوێژی بە کۆمەڵ یازدە هەزار مزگەوت لە شانیشینی عەرەبی سعودیدا و فەرمانگەکانی دادوەری و قوتابخانەی ئاینی و تەنانەت تواناداریان لەسەر کۆکردنەوەی جەماوەر دژی دەسەڵاتی ئالی سعود یان سیاسەتە خۆسەپێنەرە لادەرەکان، ئەگەر ویستیان لەسەر بێت، بەڵام پیاوانی ئاینی وەهابی بەردەوام دۆستایەتیان لەگەڵ ڕژێمەکە پاراستووە. چەند ماوە بەسەر سعودیەدا تێپەڕیون کە دەیان توانی ڕۆڵێکی گەورە بگێڕن لە چاکسازی کردن لە سیستەم و ڕژێمەکەدا و گۆڕانکاری ڕیشەیی بکەن، بەڵام چوونە پاڵ ڕیزی ڕژێمەکە و بەهێزەوە بەرگریان لێکرد، هەر لە سەرەتای دەستپێکی ڕوداوی یاخی بوونی (ئیخوان) لە ساڵانی بیستەکان لە سەدەی ڕابردوو. ڕووداوی داگیر کردنی

---

کارەیدا دەوڵەتی سعودیە پاساوی هەیە و تەنانەت سوپاس کراوە لەسەر دەست پێشخەریەکەی ".
(ڕۆژنامەی "إقرا"، ژمارە ٧٧٩ لە بەرواری ١٩٩٠/٨/٢٣) بەهەمان شێوە ئەنجومەنی دەستەی گەورە زانایان یاداشتێکیان دەرکرد کە پشتیوانی (حوکمڕان) دەکەن لەوەی بڕیاری داوە هێزە بیانیەکان بەکاربێنێت. (عبدالله، أنور: العلماء والعرش ٣٩٢).

زانا گەورەکانی ئاینی لە سعودییە هەڵوێستیان بێ دەنگی نواندن بوو لە هەمبەر لێدانی هێزەکانی تالیبان لە ئەفغانستان، بەیارمەتی هێزەکانی هاوپەیمانی ساڵی ٢٠٠١، پاش ئەوەی ئوسامە بین لادن پەنای برد بۆ ئەفغانستان و دەست پێکردنی هێرش بۆ سەر تاوەری بازرگانی ئەمریکی و وەزارەتی بەرگری ئەمریکی لە ١١ ئەیلولی هەمان ساڵ، کەچی تەنها شێخ حەمودی کوڕی عەقلانی شوعەیبی ناڕازی بوو و ئیدانەی هێرشەکەی سەر ئەفغانستان و تالیبانی کرد و پشتگیری کردنی هێرشی ئەمریکی بۆ سەر ئەفغانستانی بە هەڵگەڕانەوەو کوفری دانا، ئەمەش وای لە حکومەتی سعودییەی عەرەبی کرد کە دەری بکات لە دەستەی گەورە زانایان و داواشی لێکرد دەست لە فەتوادان هەڵ بگرێت.

حەرەمی مەککەی پیرۆز لە کۆتایی حەفتاکان[1]. جەنگی کەنداو لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکان و کۆتایی هاتنی بە کێشە و ڕووداوی بن لادن و هێرشی

(١) شێخ ئیبن باز یاداشتێکی گرنگی دەرکرد کە دوودڵی زۆرێك لە سەربازانی هێزە چەکدارەکانی نەهێشت کە مەبەستیان بوو ڕووبەڕووی جوهەیمانی عوتەیبی ببنەوە کاتێ مزگەوتی حەرامیا داگیر کردبوو لە ساڵی ١٩٧٩، لەو یاداشتەدا هاتبوو: " چۆن بۆ ئەو دروستە یاخی ببێت لە دەوڵەتی جێگیر کە یەکدەنگ و ڕازین بە کەسێك و بەیعەتی شەرعیان پێداوە، جا بە یاخی بوونەکەی دەیەوێت ڕیز و کۆمەڵی موسڵمانان پەرتەوازە بکات؟ و پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام) فەرموویەتی:(من أتاكم و أمركم جميع يريد ان يشق عصاكم أو يفرق جماعتكم فاضربوا عنقه كائنا من كانة) موسليم تەخریجی کردووە. واتە: هەر کاتێ ئێوە کۆك بوون لەسەر کەسێ و یەکێك هات ویستی ڕیزو کۆمەڵی ئێوە پەرتەوازە بکات ئەوا لە گەردەنی بدەن هەر کێ بێت. کاتێ پێغەمبەر ~ بەیعەتی لەگەڵ هاوەڵانی گرێدا لەسەر ئەوە بوو کە: (ململانێ لەگەڵ کاربەدەستان مەکەن مەگەر کوفرێکی ئاشکرایان لێ ببینن و بەڵگەتان پێبێ لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە) و ئەم دەوڵەتە سوپاس بۆ خوا هیچ شتێکی وای نەکردووە کە لێ یاخی بوون پێویست بکات. لەو کاتەدا بەڵگەی هێنایەوە بە فەرموودەی:(هەر کەسێ ئەمیرەکەی بینی کە تاوان دەکات ئەوا با پێی ناخۆش بێت کە تاوان دەکات و سەرپێچی خوا دەکات، بەڵام با بەهیچ شێوەیەك لە گوێڕایەڵی دا دەرنەچێت، چونکە ئەوەی لە گوێڕایەڵ دەربچێت و لە جەماعەت جیاببێتەوە ئەوا بە نەفامی دەمرێت) و بۆیە ئەو دەستەیە (واتەی: جوهەیمان هاوەڵانی _ و _) دەچنە ژێر واتای ئەم فەرمایشتەی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ:﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا أُولَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ البقرة: ١١٤. واتە: (جا کێ لەوە تاوانبارترو ستەمکارترە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوەی ناوی پیرۆزی ئەوی تیادا ببرێت و باسی ئایینی ئەوی تیادا بکرێت و هەوڵبدات بۆ وێران کردنیان، ئەوانە بۆیان نییە بچنە مزگەتەکانەوە مەگەر ترسی خوایان لە دڵ دابێت، ئەوا تەنها سوکی و ڕیسوایی بەشیانە لە دونیادا و لە قیامەتیشدا سزای گەورەیان بۆ هەیە). شێخ بەڵگەی بە فەرموودەیەکی تریش هێناوەتەوە:(هەر کەسێ چەك دژی ئێمە هەڵبگرێت لە ئێمە نییە) ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە (ئیخوان) بە تاوانبار دابنێن لەبەر ئەوەی گولەبارانی پیاوانی ئاسائیشیان کردبوو

ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان و بزوتنەوەی تاڵیبان لە ساڵی ٢٠٠١، بنکەکانی وەهابیەت لەهەمبەر گشت ئەو کێشانەوە هەڵوێستی جیاوازیان لەگەڵ ڕژێمی سعودیەدا هەبوو، جا زانایان دەیانتوانی کە جەماوەر دژی ڕژێم هانبدەن یان وا لە جەماوەر بکەن هەمان هەڵوێستی دەسەڵاتیان هەبێت، بەڵام زانایان ئەوەیان هەڵبژارد کە پشتی هەڵوێستی فەرمی بگرن و دژەکەی تاوانبار بکەن، ئەمەش بووە هۆی کورت بوونەوەی ئەرکی زانایانی ئایینی بەوەی ڕۆڵی خزمەتکاری ڕژێم و دەوری هۆشبەری ئوممەت[1] بگێڕن[2].

---

ئەوانەی دەیانەویست موسڵمانان بپارێزن لە خراپەی ئەوان ". گۆڤاری (البحوث الاسلامية، السعوديه) ژمارەی یەکە لە بەرگی دووەم بە ناونیشانی: (ڕووداوی مزگەوتی حەرام و پرسی مەهدی چاوەڕوان کراو).

(١) من ڕاو بۆچوونم لەگەڵ دانەردا نییە کە بە ڕەهایی تۆمەتباری زانایان بکرێ یاخود بە گشتی زانایان تاوانبار بکرێن کە خزمەتکاری ڕژێمەکانن، لەوە دانەر ڕاستی پێکاوە کە هەمیشە هەندێك زانایانی دەستوپێوەندی کۆشك و حوکمڕانەکان خزمەتکاری بەرژەوەندیەکانی پادشاکانیانن و هۆشبەری ئوممەتن بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە بەردەوام زانایانێك هەن خزمەتکاری ئوممەتن نەك ڕژێم و ڕۆڵی هۆشیار کەرەوەی ئوممەت دەگێڕن و سەرمەشقن بۆ چاکسازی و گۆڕانکاری ڕووەو چاکتر و باشتر و نمونەی ئەم زانایانەش زۆرن و پێویست بە ناوهێنانیشیان ناکات. (وەرگێڕ).

(٢) موفتی گشتی شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز لە وتارێکی دا بانگەشەی کرد کاتێ ئەو وتارەی پێشکەشی کرد لە ئاهەنگی کۆتایی پێنجەم خولی شەرعی بانگخوازان کە فەرمانبەری نوسینگەی بانگەوازن لە شانشینی سعودییەدا، کە لە ژێر چاودێری وەزارەتی کاروباری ئیسلامی و ئەوقاف و بانگەواز و ڕێنمایی دا بەوشێوە دەچوون لە پێناو سەرکوت کردنی ئۆپۆزسیۆن و دەنگی کەسانی ناڕازی لەسەر ئاستی ڕاگەیاندنیش، تەنانەت ناوی لە وانە نا کە ڕەخنە لە ڕژێمی سعودی دەگرن بەوەی بانگەشەکاری تێکدان و گومڕایی، هۆشداری دا وتی: " ئاگادارتان دەکەمەوە لەوانەی بانگەشەکاری ڕووخان و گومڕایین وەك (مەسعەری) و هاوڕێنەکانی ئەوانەی یارمەتی دەری ئەون

له پرۆسەی تێکدان و نانەوەی گەندەڵی و گومڕاکردنی خەڵکی، بەڕاستی ئەمە خراپە و ئاشوبێکی گەورەیە... پێویستە دەست بگیرێت بەسەر ئەو بڵاوکراوانە و خەڵکی لێی ئاگادار بکرێتەوە و لەناو ببرێن ئەگەر هەر شتێکیش بێت " لە جیاتی ئەوەی ڕەخنە ئاراستەی حوکمڕان بکات ئەوا داوای کرد کە یارمەتیان بدرێت لە چاکەکاری دا و نزای ڕێنمایی و سەرکەوتنیان بۆ لە خوا بکرێت تا خوای گەورە یارمەتیان بدات لە چاکەدا و ڕێنماییان بکات و دەستو پێوەندەکانی چاك بکات و سەرکەوتوویان بکات بۆ بەرپاکردنی حەق. و وتی: " ... چاکەکار بەوشێوەیە دەبێت... بۆیان دەپارێتەوە بە چاکە و سوپاسیان دەکات لەسەر چاکە، سوپاسی دەکات لەسەر ئەو چاکەیەی کردوویانە و داوایان لێدەکرێت بۆ ئەوەی بەردەوام و چەسپاوبن و دەستوپێوەندیان چاك بکەن و خۆیان دوور بگرن لە خەڵکی خراپ، داوای لابردنی خراپە دەکات بە قسەی جوان و شێوازی باش و ئامۆژگاری کردنی حوکمڕان و زانایان لەگەڵ ئەوەی نزای سەرکەوتنیان بۆ دەکات، پێیان دەڵێت: ئامۆژگاری یەکتری بکەن لەسەر ئەمە، خەڵکی ڕێنمایی بکەن خوا پاداشتتان بداتەوە بە چاکە و خوا سەرکەوتووتان بکات. ئامۆژگاری بەوشێوەیە دەبێت.. بە قسەی جوان، بە نەرمی، نزای سەرکەوتنیان بۆ دەکات، نزای سەرەنجامی چاکیان و تێگەیشتن لە دین و چاکبوونی دەستوپێوەندیان بۆ دەکات ". دووبارە جەختی کردەوە لەسەر ئامۆژگارییەکانی: " پێویستە لەسەر هاوڵاتیان یارمەتی دەوڵەت بدەن و سوپاسی بکەن لەسەر ئەو چاکەیەی دەیکەن. پێویستە یارمەتی دەوڵەت بدرێت لە چاك کردنی ئەو بارودۆخانەی دێنە کایە کە کەم و کورتی لێدەکەوێتەوە ئەم یارمەتی دانەش بەشێوازی باش و قسەی جوان دەبێت نەوەك بە ناوزڕاندن و باسکردنی کەم و کورتیەکان لە لاپەڕەی ڕۆژنامەکان و لەسەر مینبەرەکان، بەڵکو بە ئامۆژگاری و بە پەیام نووسین و ئاگادار کردنەوەی لایەنی پەیوەندی دار لەوەی کە شاراوەیە تا کێشەکە چارەسەر دەبێت و چاکە جێگای دەگرێتەوە تا نیعمەتەکان جێگیر ببن و ناخۆشیەکان لادەچن ". (مجموع فتوی و مقالات ابن باز _ بەشی حەوتەم).

هۆشداری دا لەهەمبەر ئەو فاکس و کاسێتە "پیسانە"ی کە بانگەشە دەکەن بۆ پەرتەوازەیی و ڕاجیایی و تانەو توانج دان لە حوکمڕان و زانایان، لەوبارەیەوە وتی: ئەم شتانە لە خراپە و تاوانە گەورەکانە. ئەوانەی ئۆپۆزۆسیۆنن تۆمەتباری کردن بەوەی " زۆرێ لە پەڕاوی زیانبەخشی گومڕاکەریان ناردووە کە کۆمەڵ پەرتەوازە دەکەن، کەسانی وەك موحەمەد مەسعەری و ئەوانەی لەگەڵی دان، ئەوانە ڤین لە دڵن و نەزانن دین و ئەمانەتەکەیان فرۆشتووە بۆ شەیتان و لەپێناو

لە بەرامبەردا ڕژێمی سعودی سەروەت پارەیەکی زۆر و گەورە دەدات بە دامەزراوەی ئایینی بۆ بنیادنانی قوتابخانە و مزگەوت و پڕۆژە کە ئامانج لەوەش بریتیە لە دەوڵەمەند کردنی دامەزراوەکەیە لە ڕووی پارەوە و هەژار کردنیەتی لە ڕووی فیکری و ملکەچ کردنی ڕوحە ئازادەکەیەتی. کاتێك یەکێك دەست پێشخەری دەکرد بۆ یاخی بوون لە حوکمڕان ئەوا هەر بەخێرایی لەسەر کار لادەبرا و یاخود لە ئەندامێتی دەستەی گەورەی زانایان لادەبرا[1].

---

شەیتان " ئیبن باز فەرمانی کرد کە ئەو پەڕاوانە لە ناو ببرێن، چونکە خراپەو فیتنەن و بانگەشەش دەکەن بۆ فیتنە " و وتی: ئامۆژگاری بەوە دەبێت کە دەسخۆشی بکەیت لەوەی ئەو چاکانە کراوە و هانی لایەنی پەیوەندی دار بدەیت کە بارودۆخەکان چارە بکات و ئاگاداری بکەیتەوە لە فیتنە و خراپە. (گۆڤاری: الدعوة، ژمارەی دەرچووی لە ڕۆژی پێنج شەممە ١٩/١٢/١٤١٥ك).

(١) هەروەك ڕژێمی سعودی ئەو هەڵوێستەی نواند لە بەرامبەر شێخ عەبدوڵڵای کوڕی قەعود و شێخ حەمودی کوڕی عەقلانی شوعەیبی و جگەلەوانەش ئەوانەی ناڕازای بوون لەهەمبەر پشت بەستن بە بیانیەکان بۆ بەرگری کردن لە شانیشنینەکە، لەکاتی جەنگی کەنداوی دووەم لە ساڵی ١٩٩١.

دامەزراوەی ئایینی وەهابی هەڵسا بە پشتیوانی کردنی دیکتاتۆری و تاکڕەوی ئالی سعود لە دەسپێکی فیکری سیاسی وەهابی سەلەفی کە پێداگیری دەکات لەسەر گوێڕایەڵی ڕەها بۆ حوکمڕان لەگشت بارودۆخەکاندا و لە خاڵی هەست کردن بە کەمینە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی کۆمەڵە و دەستە و حیزبەکانی تر کە زۆربەی جەماوەری سعودی پێك دێنن و فیکرەی وەهابی و خانەوادەی سعود ڕەت دەکەنەوە.

لەلایەك کە وەهابیەت ڕاوێژو دیموکراسی ڕەت دەکاتەوە لە بەرنەوەی دان نانێت بە بوونی (ئومەتی ئیسلامی) فراوان و گەورە، چونکە بڕوای وایە کە "گشت موسڵمانان بێ باوەڕ و هاوبەشدانەرن" یان بەلایەنی کەمەوە بەپێی تەفسیری نوێی وەهابی "لادەرو سەرگەردانن". وەهابیەت "دەستە و کۆمەڵەی ڕزگار بوو، کە لەسەر ڕێوشوێنی پێشینە چاکەکان دەچن" پێکدێنن و بەژداربوونی ئوممەت لە بواری سیاسی دا ڕەت دەکاتەوە بەبەڵگەی ئەوەی خەڵکی نەزانن و ئیسلام ناناسن[1].

لەبەر ئەوەی پرۆسەی ڕاوێژ یاخود دیموکراسی لەسەر بنەمای زۆرینە و فرەیی سیاسی بنیاد دەنرێت، ئەوا پیاوانی ئایینی وەهابی ئەو بنەمایەیان زۆر بە توندی ڕەت کردەوە و بە پێچەوانەی ئایینیان دانا، پەنا بردنە بەر حوکمی زۆرینەیان ڕەت کردەوە کە کاری پێدەکرێ لە ژیانی دیموکراسی دا، لە

---

(١) النحوي: الشورى لا الديموقراطية ٤٠.

دەستپێکەوە: " جەماعەت خەڵکانی ڕاستن ئەگەر کەمیش بن " و " بەردەوام شەرعی نەبوونی زۆرینە "[1]. و بەتایبەتی کاتێ کەمینە دەبێتە وەهابی و زۆرینە دەبێتە نا وەهابی.

د.عەدنان عەلی ریزا نەحوی دەڵێت لە بارەی ڕەت کردنەوەی دیموکراسی: ئەو "کۆمەڵەی" مەبەستە ئەوەن کە شوێنکەوتووی ڕاستی ڕوونن، ئەگەر ژمارەشیان کەم بێت. دروست نییە وشەی "کۆمەڵ: جەماعەت" بەکاربهێنرێ وەك ئاماژەیەك بۆ زۆری، چونکە جەماعەت لە سەردەمێك زۆرن و لە سەردەمێکی تر کەمن. دواتر پابەندبوون بە جەماعەتەوە مەبەست لێی

---

(١) بە پشت بەستن بە تەفسیری ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ﴾ المائدة: ٤٩. واتە: (بێ گومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن). ﴿ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ: بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یاخین ﴾ المائدة: ٨١. ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ﴾ الروم: ٨. واتە: (لە ڕاستی دا زۆربەی خەڵکی بێ باوەڕن بە گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان). ﴿ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ البقرة: ٢٤٣. واتە: (هەرچەندە زۆربەی خەڵکی سوپاسی خوا ناکەن و سپڵەن). ﴿ وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ الأنعام: ١١٦. واتە: (خۆ ئەگەر فەرمانبەردار و ملکەچی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بیت ئەوە لە ڕێبازی خوا وێڵت دەکەن). ﴿ إِنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ هود: ١٧. واتە: (چونکە بەڕاستی ئەمە حەقیقەتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوەو بۆت ڕەوانە کراوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن). ﴿ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الأعراف: ١٨٧. بەڵام زۆربەی خەڵکیش (ئەمە) نازانن). ﴿ وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾ يوسف: ١٠٣. واتە: ("دڵنیاش بە" کە زۆربەی خەڵکی باوەڕدار نین، هەر چەندە تۆ زۆر بە پەرۆش بیت و هەوڵ بدەیت و تێبکۆشیت). ﴿ فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴾ الفرقان: ٥٠. واتە: (کەچی زۆربەی خەڵکی هەر ڕێبازی بێ باوەڕی دەگرنە بەر، هەر شوێنی بێ باوەڕی دەکەون و هیچی تر).

ئەوەیە پابەندی ڕاستی ڕوون ببیت و شوێن هەواو هەوەس نەکەویت و پابەندی عەقیدەو ئایین بیت[1].

چەمکی جەماعەت هەمیشە زۆرینە لەخۆی ناگرێت، چونکە هیچ پەیوەندیەکی نییە بە زۆرینە و کەمینە لە بواری ڕاوێژ و بۆچووندا[2].

حەق و ڕاستی دیار ناکرێت بە ژمارە: زۆرینە یاخود کەمینە، بەڵکو بە عەقیدە و ئایین و پەیڕەوی تەواوکەری ڕاستییە، هەروەك فەرموودەی ڕاست و صەحیح دەڵێت: (الناس کالابل المائة لا تکاد تجد فیها راحلة) واتە: خەڵکی وەك نمونەی سەد حوشتر وان جاری وا هەیە یەکی وایان تیادا نابینیتەوە کە کەڵکی ئەوە بدات بیکەیتە سەرمەشق و پێشڕەو... حەق و ڕاستی دیاری ناکرێت بە زۆرینە هەتا ئەگەر لەناو موسڵمانانیش بێت، دەکرێ خەڵکی دوابکەون لە ئاست بەرنامە و پەیڕەوی خوای گەورە و لێهاتووی و تواناکان کەم بوونە و ڕەگەزەکان تێکەڵ و پێکەڵ بوون، پلەکان شڵەژاون و ورەو ویستی تۆکمە کوژراوون، زانست و تێگەیشتن وشك بووە[3].

ئەبو موحەمەد عاصمی مەقدسی دەڵێت (سەرکردەی بزوتنەوەی وەهابیەت لە ئوردن): " دیموکراسی گەل بە باڵاترین دەسەڵات دادەنێت لە بووندا کە بریتیە لە حوکمی زۆرینە ... بەڵام لە ڕاوێژدا گەل یاخود زۆرینە پابەندە و فەرمان پێکراوە بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بۆ خواو

---

(١) النحوي، عدنان علي الرضا: الشورى لا الديموقراطية ٩٩، دار النحوي للنشر و التوزيع _ رياض چاپی چوارەم ١٩٩٢.

(٢) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ١٠٢.

(٣) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ١٠٥.

پێغەمبەرەکەی پاشان ئیمامی موسڵمانان پابەند ناکرێت بە ڕاو بۆچوون و حوکمی زۆرینە، بەڵکو زۆرینە فەرمانی پێکراوە کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەردا بێت بۆ ئیمامەکان ئەگەر ستەمیشیان کرد مادەم فەرمان نەکات بە خراپە و تاوان"[1].

د. نەحویش جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەمە بەو قسەیەی خۆی: " زۆرینە و ئوممەت.. لەسەر هەموویان پێویستە گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بن و ئامۆژگاری و ڕاوێژ بکەن، تەنانەت لە گەردنی دا بەیعەت هەیە، هەموو ئەوانە ملکەچن کە پەیڕەوی خوایی حوکمی لەسەر دەکات. بەڵام لە دیموکراسیدا نزیکە وێنەکە سەراوژێر ببێت بە پێچەوانەوە بەرپرس و حوکمڕان گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لەسەر پێویستە، لە دیموکراسی دا هیچ پەیڕەوێ حوکم ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە گەل دیاری دەکات[2]. و " ئێمە هەست دەکەین بە گرنگی بەرپرسیارەتی کاتێ ئەو فەرمایشتانە دەخەینەڕوو کە لەسەر بەیعەت و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری هاتوون:

١_ لە خۆشی و ناخۆشی.

٢_ لە کاتی ئاسایی و ناچاری.

٣_ لەسەر حیسابی خۆش بێت.

٤_ ململانێ لەگەڵ حوکمڕانان نەکەن.

٥_ لەوەی خۆشمان دەوێت و ڕقیشمان لێ دەبێتەوە.

---

(١) المقدسي، أبو محمد عاصم؛ الديموقراطية دين ٢٤.

(٢) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ١٠٨.

٦_ تا ئەو کاتەی کە فەرمان نەکات بە خراپە یان مەگەر ئەو کاتەی کوفرێکی ئاشکرای لێ ببینن کە خوای گەورە بەڵگەی لەسەر دابەزاندووە.

٧_ لەو کارەی لە تواناتاندایە.

٨_ ئەگەر بەندەیەکی پەل پەڕیوی ڕەش و ڕووتیش بووە حوکمڕانتان و بە قورئانی پیرۆز کاروباری ئێوەی ڕێك و پێك و بەڕێوە برد "[١].

بۆیە د. نەحوی بە سەرسامییەوە پرسیار دەکات: ئایا لە دیموکراسی دا شتێك هەیە کە هاووێنەی ئەوە بێت کە باسمان کرد؟ ئایا دیموکراسی بەو ئاستە تەماشای بەرپرسیارێتی دەکات؟ و مادەم ئێمە کەسی بەرپرس تۆمەتبار دەکەین بەرلەوەی دەست نیشانی بکەین و دیاری بکەین و بیناسین و دەست بەکاربێت، ئەوا بۆچی کار و متمانەی خۆمان ڕادەست دەکەین و پەیمانی پێدەدەین لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری و بەیعەتی ئیمانی پێدەدەین؟[٢]

بەم پێیە وەهابیەکان خودی دیموکراسیان بە کوفری ئاشکرا و هاوبەشدانانی ڕاشکاویان دانا " چونکە دیموکراسی لەسەر دروشمی (حوکم بۆ

(١) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ٥٩.

(٢) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ٨٨. لێردا نەحوی ئەوە لە بیر دەکات کە فیکری سیاسی وەهابی بڕاوی هەیە دروستی حکومەتی کەسی خۆسەپێنی زاڵ بوو و ستەمکارو لاسار، تەنانەت فیکرەی ناوبراو مەرجی دادپەروەری و تەقوا و ئەمینداری بە مەرج دانانێت لە حوکمڕان دا، بۆیە کاتێ لێ پێچینەوەی ئەو حوکمڕانە و چاودێری فیسارە ڕەت دەکاتەوە ئەوا ئازادی ڕەها بە حوکمڕانەکە دەبەخشێت لە هەڵسوکەوت کردن لە سەروەت و سامان و هاوڵاتیان و شەرەف و چارەنووسەکانی ئوممەت.

گەل) دادەمەزرێت کە لە ڕیشەدا دژی دەقی قورئانە کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی حوکم بۆ خوایە "[1].

هەندێکیان وتویانە: " دیموکراسی دینێکە جگەلە دینی خوای گەورە و شتێکی جیاوازە لە میللەتی یەکتاناسی و ئەنجومەنی نوێنەرانی تەنها بریتیە لە کۆشکی هاوبەشدانان و قەڵای بتپەرستی کە پێویستە خۆڵێ دوور گرتنی بۆ ئەوەی یەکتاناسی بێتەجێ و بەرپاببێ کە مافی خوایە لەسەر بەندەکانی، هەروەك دروست نییە جولەکایەتی و مەسیحایەتی تێکەڵ بە ئیسلام بکرێت بەهەمان شێوە نابێت دیموکراسی ئاوێتەی ئیسلام بکرێت "[2].

سەرباری ئەمەش وەهابیەت دیموکراسی ڕەت کردەوە، چونکە دیموکراسی بنەمای لێ پێچینەوە لە حوکمڕان لەلایەن ئوممەت لە خۆ دەگرێت و ئاڵوگۆڕی دەسەڵات و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە خۆ دەگرێت، کە ئەمەش دژی ئەو بنەمایەیە کە گوێڕایەڵی ڕەها پێویست دەکات بۆ حوکمڕان لە فیکری سیاسی وەهابی دا، هەروەك شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە بنەمای سێیەم لە (الاصول الستة) دا دەڵێت: " لە تەواوبوون و کامڵێتی جەماعەت دا بریتیەلە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری بۆ ئەوەی دەبێتە حوکمڕانمان ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش بێ ".

وەهابیەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان بانگەوازی کردن بۆ لادانی حوکمڕان بە ڕێگەی سەربازی یان گۆڕینی بە ڕێگەی ئاشتی دیموکراسی، جا هەموو ئەو شتانە لە دیدی ئەواندا پێچەوانەی گوێڕایەڵی ڕەهایە کە داواکراوە لە خەڵکی.

---

(١) النحوي، الشورى لا الديموقراطية ٤٢ _ ٥٠ و ٥٢.

(٢) المقدسي، أبو محمد عاصم، الديموقراطية دين ٢.

هەروەك تەنها ڕەخنە گرتنیش بە ئاشكرا لە حوكمڕان ڕەت دەكەنەوە، چونكە "دەبێتە هۆی بەرپا بوونی شۆڕش و ڕاپەڕین" و شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز وتی: " لە پەیڕەوی پێشینان دا نییە كە عەیب و كەم و كورتی حوكمڕانان دەربخەیت و گەورەیان بكەیت و بیانخەیتەڕوو، لەسەر مینبەرەكان باسی بكەیت؛ چونكە ئەمە دەبێتە هۆی دروست بوونی ئاژاوە و گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری نەكردن لە چاكەدا، تەنانەت دەبێتە هۆی خۆ هەڵقورتاندن لەو شتانەی كە نەسود و نەزیانی هەیە، بەڵام ئەو ڕێگایانە كە پێشینان دەیانگرتە بەر بریتین لە: ئامۆژگاری كردنی حوكمڕان تەنها لە نێوان خۆیان و پەیام بۆ نووسینیان و یان پەیوەندی كردن بەو زانایانەی كە پەیوەندی دەكەن بە حوكمڕانان تا بە چاكە ئاراستەیان بكەن. كاتێ ئاژاوەكە ڕوویدا لە سەردەمی عوسماندا _ خوا لێی ڕازی بێت _: هەندێ خەڵكی بە ئوسامەی كوڕی زەیدیان وت _ خوا لێی ڕازی بێت _: بۆچی لەگەڵ عوسمان نادوێیت؟ ئوسامە وتی: كاتێ شتێ لە ئێوە گوێبیست دەبم ئەوسا لەگەڵی نادوێم؟ بەڵكو لەگەڵی دەدوێم لە نێوان خۆم و ئەودا بە نهێنی بەبێ ئەوەی قسە لە شتێ بكەم كە كەس لەسەری نەدوابێت.

كاتێ خەواریجە نەزانەكان دەرگای ئاشوبیان كردەوە لەسەردەمی عوسماندا _ خوا لێی ڕازی بێت _ ئەوا ناڕەزایی خۆیان بۆ عوسمانیان ڕاگەیاند بە ئاشكرا لەهەمبەر گەورەیی فیتنە و كۆشتار و خراپەكاری كە شوێنەوارەكانی تا ئەمڕۆش ماون، هەتا ئەو فیتنەیەی لە نێوان عەلی و موعاویەدا ڕوویدا و كوژرانی عوسمان _ خوا لێی ڕازی بێت _ بەو هۆیەوە، بووە هۆی ناڕەزایی دەربڕین و باس كردنی كەم و كورتی بە ئاشكرایی ئەوا زۆرێك لە هاوەڵان

کوژران و زۆرێ لە خەڵکی ڕقیان بووەوە لە حوکمڕانەکەیان و کوشتیان، غیاضی کوڕی غەنەمی ئەشعەری گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا ~ فەرموویەتی: هەر کەسێ ویستی ئامۆژگاری حوکمڕان بکات ئەوا با بە ئاشکرا ڕاینەگەیەنێت، بەڵکو با دەستی بگرێت و بە تەنها پێی بڵێت جا ئەگەر لێی قبوڵ کرد ئەوا تەواو و ئەگەر قبوڵی نەکرد ئەوا ئەو ئەرکەی لەسەر شانی بوو ڕایپەڕاند[1].

فیکری سیاسی وەهابی فرەیی حیزبی و سیاسی ڕەت کردەوە بە پاساوی ئەوەی: دروست نەبوونی حیزبایەتی چونکە بەیعەتێکی داهێنراوە کە پێچەوانەی بەیعەتی حوکمڕانە و هۆیەکە لە هۆیەکانی پەرتەوازەیی. پرۆسەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی و کۆچ کردن و خۆ کەناردان لە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵگەدا ڕەت کردەوە مەگەر بە ڕەزامەندی حوکمڕان و دەسەڵاتداری شەرعی بێت[2].

---

(١) الكواشف الجلية في الكفر الدولة السعودية ٢٥٥ _ ٢٥٦.

(٢) یاداشتی دەستەی گەورە زانایان (١_ شێخ عەبدوڵلا عەبدوڵەتیف ٢_حەسەنی کوڕی حوسەین ٣_ عومەری کوڕی موحەممەدی کوڕی سەلیم ٤_ سەعدی کوڕی حەمدی کوڕی عەتیق ٥_ عەبدوڵلای کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی عەنقرێ ٦_ سولەیمانی کوڕی سەمحان ٧_ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵەتیف ٨_ عەبدوڵلای کوڕی بەلهید ٩_ عەبدوڕەحمانی کوڕی سالم) لە ڕێکەوتی ١٠ ذی القعدة ١٣٣٢ك.

## ڕەتکردنەوەی تەکفیر کردنی ئەو حوکمڕانانەی کار بە پەیامی نێردراوی خوای گەورە ناکەن

لەو کاتەی کە گەورە زانایانی دامەزراوەی وەهابیەتی نوێ، بەهۆی هۆکاری سیاسیەوە، تەکفیری گشت حوکمڕانە عەرەب و موسڵمانەکانیان دەکرد بە دیاریکراوی و کۆمەڵە گەورەکانی موسڵمانان بە گشتی[1]، کەچی هەمان ئەو

---

(١) هەروەك ئەمە ڕوویدا بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٨٢ کاتێ سەرۆکی لیبی عەقید مەعمەر قەزافی ڕەخنەی گرت لە سیاسەتی شا خایدی کوڕی عەبدولعەزیز، لەو کاتەدا ئەنجومەنی دەستەی گەورە زانایان ڕوون کردنەوەیەکیان دەرکرد تیایدا هاتووە: " کە قەزافی بێ باوەڕو ملهوڕ و گومڕابوو و گومڕاکەرە". ڕۆژنامەی (ریاض) ڕێکەوتی ١٤٠٢/٥/١١ و سەیری ئەم سەرچاوەیەش بکە: أنور عبدالله، العلماء و العرش ٣٨٥. هەروەك کاتێ سەرۆکی عێراقی لە ساڵی ١٩٩١ کوەیتی داگیر کرد و سعودیە جەنگی لە دژی ڕاگەیاند، ئەوا ئیبن باز هەڵسا بە پشتیوانی کردنی جەنگەکە و ڕوون کردنەوەیەکی دەرکرد و تیایدا وتی: " خوای پاك و پایەبەرز فەرمانی کردووە بە جەنگان لەگەڵ ئەو دەستەیەی یاخی دەبێت تا ملکەچی فەرمانی خوا ببن، ج چای ئەوەی دەستەی یاخی و نا موسڵمان و ملهوڕ بوو ئا لەو حاڵەتەدا جەنگانی لەگەڵی پێویستتر و ڕاستترە ". عبدالله، أنور، العلماء و العرش ٣٩٤. گەورە شێخە وەهابی فەرمیەکان خۆیان نەپاراست لە تەکفیر کردنی کۆمەڵەی شیعە کاتێ پەیوەندی نێوان سعودیە و ئێران پەشێوی تێکەوت لەکاتی جەنگی نێوان عێراق و ئێران، لەم بارەوە لیژنەی هەمیشەیی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی و فەتوا بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز و بە ئەندامێتی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی قعود و عەبدولعەزیزی کوڕی غەدیان و عەبدوڕەزاقی عەفیفی فەتوایەکیان دەرکرد بە ژمارە ١٦٦١ بە تەکفیر کردنی شیعە بەشێوەیەکی گشتی، دواتر شێخ عەبدوڵڵای کوڕی جبرین فەتوایەکی هاوێنەی فەتوای لیژنەی ناوبراوی دەرکرد بە ژمارە ٢٠٠٨ لە ڕێکەوتی ١٤١٣/٣/١٢ کە تیایدا هاتووە: " شیعە بە هاوبەشدانانی گەورە هاوبەشدانەرن کە پێی دەچنە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و ئەوان هەڵگەڕاوەن و زیاد ڕۆچوو

زانایانە سارديان دەنواند لە تەكفير كردنی حوكمڕانانی ئالی سعود يان حوكمڕانانی كەنداو ئەوانەی كاريان نەدەكرد بە پەيامی نێردراوی خوای گەورە، سەرباری جەخت كردنەوەی بزوتنەوەی وەهابيەت لەسەر بابەتی يەكتاناسی، يەكتاناسی گوێڕايەڵی و پەرستش و پابەند بوون بە ياساكانی شەريعەتی ئيسلام. لەبەرچاو گرتنی كاركردنی بە جگەلە پەيامی نێردراوی خوای بە هاوبەشدانان و كوفرێكی دەرخەر لە ئوممەت[1]. بەڵام زانايانی

---

و دووروون، بەم پێيە ئەو شتانەی بڕياردا: أ_ ئاژەڵە سەربڕاوەكانيان حەرامن. ب_ ژن هێنان لەوان حەرامە. ج_ ڕەتكردنەوەی بانگەشەكەيان بەوەی دەڵێن برای ئيسلامين ". و شێخ ناصرەدينی ئەلبانی ساڵی ١٩٨٧ لە عەمان فەتوای دەركرد بە تەكفير كردنی ئيمامی خومەينی.

(١) بۆ نمونە ئەمە بەدی دەكەين لە كتێبی: (رسالة تحكيم القوانين) دانراوی موفتی پێشوو شێخ موحەممەدی كوڕی ئيبراهيمی ئالی شێخ، دانەر لە كتێبەكەيدا وتويەتی: " يەكێ لەو شتانەی كە كوفری هەرە گەورەی ئاشكرايە ئەوەيە كە ياسا نەفرەتی بێنيە ئاستی ئەو پەيامی جبريلی ئەميندار دايبەزاندووەتە سەر دڵی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی ببێتە ئاگادار كەرەوە بە زمانی عەرەبی ڕەوان بۆ ئەوەی داوەری بكات لە نێوان جيهانيان و لەكاتی ڕاجيايی بۆی بگەڕێنەوە و كوفری دياری گەورە شكاندنی ئەو فەرايشتەی خوای گەورە:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ النساء: ٥٩. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕايەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواكان بكەن كە لە خودی خۆتانن (لە بيروباوەڕو پابەنديدا)، خۆ ئەگەر لە شتێكدا بوو بە كێشەتان دەربارەی حوكمی خوايی، ئەوە ئەو كێشەيە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) (كە قورئان و سوننەت دەگەيەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوايی هەيە، (ڕەفتاركردنتان) بەو شێوەيە چاكترين و جوانترين سەرچاوەيە بۆ چارەسەری كێشەكانتان). ئەو دادگايانەی لە زۆرێ لە وڵاتەكانی ئيسلاميدا هەن دادگای ئامادەكراو و تەواوكار و دەرگا كراوەن و خەڵكيش كۆمەڵ بە كۆمەڵ دەچن و دادوەرەكانی داوەری دەكەن لە نێوانيان دا بە ياسايەكی پێچەوانەی حوكمی

دامەزراوەی وەهابی نوێ، لە سایەی زاڵ بوونی ڕژێمی سیاسی و تێکچوونی پێوەرەکانی هێز خۆیان بەناچار بینی کە تەفسیرێکی نوێ بکەن بۆ چەمکی هاوبەشدانان و یەکتاناسی کە جیابوو لە تەفسیری وەهابی کۆن، بەتایبەتی لە چەمکی هاوبەشدانا و گوێڕایەڵی و حوکم کردن بە جگەلە پەیامی خوای گەورە، ئەم کارەی زانایە نوێیەکانی وەهابی بۆ ئەوە بوو کە پاساو بێننەوە بۆ حوکمڕانە لادەرەکان ئەوانەی ڕەتیان کردەوە کە کار بکەن بە شەریعەت یاخود ئەوانەی پاشکۆی بێ باوەڕان بوون، بۆ ئەم مەبەستە چەند مەرج و دەرگای نوێیان دانا بۆ لادانی تۆمەتی تەکفیر لەسەر ئەوان. هەروەك شێخ موحەمەد ناصرەدینی ئەلبانی وتویەتی: " دروست نییە بۆ هیچ کەسێ تەکفیری یەکێ بکات کە کار دەکات بە جگەلە پەیامی خوا بەوەی تەنها کاری پێکردووە بەبێ ئەوەی بزانێ کە بکەرەکە کارەکەی بە حەڵاڵ دەزانێ بە دڵیەتی یان نە ". دوای ئەمە موفتی پێشووی شانیشینی عەرەبی سعودی شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز ئەم ووتەیەی وەك پشتگیری فەتوای شێخ ناصر دەربڕی: " گومان لەوەدا نیە کە ئەوەی باسی کرد لە بارەی تەفسیری فەرمایشتی خوای گەورە:﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ المائدة: ٤٤. واتە: (جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن). ... هەر ئەمە ڕاستە". موفتی ڕوونکردنەوەی دا وتی: " دوو جۆر کوفر هەن، هەروەك دوو جۆرە ستەم و زۆرداری هەن، هەر کەسێ بەحەڵاڵ

---

قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر، جا خەڵکی پێیەوە پابەند دەکەن و لەسەریان جێبەجێ دەکەن، جا چ کوفرێ لەسەرووی ئەو کوفرە هەیە و بەڕاستی ئەوە تەوا پێچەوانەیە لەگەڵ ڕستەی (موحەمەد پێغەمبەری خوایە)؟". ٢٠_٢١.

بزانێ کە کار بکات بە جگەلە پەیامی نێردراوی خوای گەورە یان زینا یاخود ڕیبا یان جگەلەوانەش لە شتە حەرام و قەدەغە کراوەکان کە یەکدەنیان لەسەرە بە حەڵاڵ بزانێت ئەوا بکەرەکەی کوفرێکی گەورەی ئەنجام داوە، بەڵام هەر کەسێ شتێکی لەو جۆرەی کرد بەبێ ئەوەی بە حەڵاڵی بزانێت ئەوا کوفرەکەی بچوکە بەهەمان شێوە ستەمەکەشی بچوکە و لاسارییەکەشی هەمان حوکمی هەیە "[1].

لیژنەی هەمیشەیی بۆ توێژینەوەو فەتوا بە ژمارەی ٥٧٤١ فەتوایەکی دەرکرد لە بارەی بابەتی تەکفیری ئەوەی کار دەکات بە جگەلە پەیامی نێردراوی خوا. ئایا کەسەکە موسڵمانە یان بێ باوەڕە بە کوفرێکی گەورە کە کردەوەکانی قبوڵ نین؟ لیژنەکە لەوبارەوە ووتی: " خوای پایەبەرز فەرموویەتی:﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ المائدة: ٤٤. واتە: (جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزانووە، ئائەوانە بێ باوەڕن). ئەگەر کەسەکە ئەو کارەی بەحەڵاڵ زانی و بە دروستی دانا ئەوە بێ باوەڕە بە کوفرێکی دەرخەر لە ئوممەت، بەڵام ئەگەر ئەوەی کرد لە پێناو بەرتیل یان مەبەستێکی تر و دەشزانێ کە حەرامە ئەوا بکەرەکەی بە بێ باوەڕ دادەنرێت بە کوفرێکی بچوك کە نایخاتە دەرەوەی بازنەی ئوممەت هەروەك زانایان ئەمەیان ڕوون کردۆتەوە لە تەفسیری ئایەتی ناوبراو ".

بەهەمان شێوە ئیبن باز وتویەتی: هەر کەسێ بڵێ حوکمی من لەسەر ئەمە وایە، لە هەمان کاتدا بڕواشی وایە کە حوکم کردنە بە جگەلەو پەیامەی خوای گەورە دایبەزاندووە ئەوا دروست نییە. ئەگەر بڵێت حوکم کردن بە

(١) ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط) ژمارە ٦١٥٦ لە ڕێکەوتی ١٢/٥/١٤١٦ك.

شەریعەتی ئیسلامی چاکترە، کەچی خەمسارده یان ئەو کارەی دەکات بەهۆی فەرمان پێکرانی لەلایەن حوکمڕانانی ئەوا ئەو کاتە بێ باوەڕە بە کوفرێکی بچوك کە نایخاتە دەرەوەی بازنەی ئوممەت، بەڵام دادەنرێت لە گوناهە گەورەکان.

پرسیاری لێ کرا: حوکمی دانانی یاسا دەست کردەکان چییە؟ ئایا دروستە کاری پێ بکرێت؟ حوکمڕان بێ باوەڕ دەبێت بە دانانی یاسای ناوبراو؟ لە وەڵامدا حوکمەکەی بەستەوە بە حەڵاڵ کردنی و وتی: ئەگەر یاسایەکی دانا واتە حەد دەرکردن نییە لە زیناکەر و دزیکەر و مەیی خۆر، ئەمە پوچ و بەتاڵە و یاساکانیش بەتاڵ و پوچن، ئەگەر حوکمڕانەکە دانانی یاسای دەستکردی حەڵاڵ کرد ئەوا پێ کافر دەبێت ئەگەر وتی حەڵاڵە یاخود شتێکی ئاساییە، ئا ئەمە دەبێتە کوفر و دەچێتە چوارچێوەی ئەوەی حەڵاڵ کراوە کە خوای گەورە حەرامی کردووە.

لە وڵامێکی تردا وتی: ئەو حوکمڕانانەی کار دەکەن بە جگەلە پەیامی خوا چەند جۆرێکن، حوکمەکانیان دەگۆڕێت بە پێی عەقیدە و کردەوەکانیان، جا هەر کەسێ حوکمی کرد بە جگەلەوەی خوای گەورە ناردوویەتی حوکمی کرد و بڕوای وابوو کە ئەمە چاکترە لە شەرعی خوا ئەوە بێ باوەڕە لەلایەن گشت موسڵمانان، بەو شێوەیە هەر کەسێ داوەری بکات بە یاسا دەست کردەکان جگەلە شەرعی خوای گەورە و بڕوای وایە کە ئەوە دروستە. ئەگەر بشڵێت: حوکم کردن بە شەریعەت چاکترە ئەوا هەر بێ باوەڕە، چونکە شتێکی حەڵاڵ کردووە کە خوای گەورە حەرامی کردووە. بەڵام هەر کەسێ بە هۆی شوێنکەوتنی ئارەزووەکەیەوە یان بەرتیلەوە یان دوژمنایەتی لە نێوان حوکم

لەسەر کراو یان بەهەر هۆیەکی ترەوە کاری کرد بە جگەلەو پەیامەی خوای گەورە دایبەزاندووە، کەچی دەشزانێت سەرپێچی خوای کردووە و دەشزانێ پێویستە لەسەری شەرعی خوا بکات بە دادوەر، ئەوا ئەو جۆرە کەسە بە تاوانبار و گوناهکاری گەورە دادەنرێت و بە بکەری کوفری بچوك ئەژمار دەکرێت، هەروەك واتای شتێکی لەم جۆرە هاتووە لە ئیبن عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) و لە تاوس و کۆمەڵێ لە پێشینە چاکەکانەوە، ئەمە ناسراوە لەلایەن زانایانەوە، خوای گەورە پشتیوان و سەرخەرە[1].

شێخ موحەمەدی کوڕی صالحی عوثەیمین وتویەتی: " دەبێ بزانێ کە پێویستە لەسەر مرۆڤ کە لە گشت حوکمەکان دا لە خوای گەورە بترسێت و خێرا نەبێت لە دەرکردنی حوکمەکان بەتایبەتی لە بواری تەکفیر کە وای لێهاتووە هەندێ کەسی بە غیرەت و بە جۆش و خرۆش بەبێ بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو ڕامان ئەو حوکمانە دەردەکەن، لەگەڵ ئەوەی کە ئەگەر مرۆڤ کەسێکی تەکفیر کرد و کەسەکە شایەنی ئەو حوکمە نەبوو ئەوا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. تەکفیر کردنی کەسێ چەندین ئەحکامی لەسەر کەڵەکە دەبن و کەسەکە خوێن و ماڵ و سەروەتی حەڵاڵ دەبێت و هەموو ئەحکامەکانی کوفری لەسەر کۆدەبنەوە، بەوشێوە نابێ ئێمە ترسنۆکی بنوێنین لە تەکفیر کردنی ئەوەی خوای گەورەو پێغەمبەر تەکفیریان کردەوە، بەڵام دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان حوکمی دیاریکراو و دیاری نەکراو، چونکە دانی حوکمدانی تەکفیری دیاریکراو پێویستی بە دوو شت هەیە:

---

(١) ئەوەم وەرگرتووە لە (ساحات الحوار)ی د. عەبدوڵڵای فارسی.

١_ چەسپانی ئەو تایبەتمەندییەی کە پێی هەڵساوەو دەشبێتە هۆی تەکفیر کردنی.

٢_ هاتنەجێی مەرجەکانی تەکفیر لەسەر کەسەکە، گرنگترینیان بوونی زانست و زانیارییە کە بزانێ ئەو کارەی دەیکات کوفرە و ئەگەر نەزان بوو ئەوا تەکفیر ناکرێ... لەگەڵ پێویستی هاتنەجێی مەرجەکان تیایدا ئەوسا پێویستە پەرچ (الموانع)ەکان لابچن، چونکە ئەگەر کەسێ کارێکی کوفری کرد بەهۆی ئەوەی ناچارکرابوو یان بەهۆی گێژو وێژبوونەوە کردنی ئەوا تەکفیر ناکرێت"[1].

بەهەمان شێوە ئیبن عوسەیمین وتویەتی: دان و نەدانی حوکمی تەکفیر لەوجۆرە بابەتانەدا دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی خراپە و تاوان و ئەوەی من بۆی دەچم ئەوەیە یەکەم گەنجەکان خۆیان بەو بابەتەوە سەرقاڵ نەکەن کە ئایا حوکمڕان بێ باوەڕە یان نا و ئایا دروستە لەدژی دەربچین یاخود دروست نییە، پێویستە لەسەر گەنجان گرنگی بدەن بەو پەرستشانەی کە خوای گەورە لەسەرەوانی پێویست کردووەو یان بە باشی زانیووە ئەنجامی بدەن وەك سوننەت[2] و خۆیان دووربگرن لەوەی خوای گەورە لەوانی قەدەغە کردووە یان بە ناپەسەندی داناوە لەسەریان و هەوڵبدەن و تێ بکۆشن لە پێناو چاندنی تۆی برایەتی و خۆشەویستی زیاتر لە نێوان خۆیاندا و پێویستە بشزانن کە ڕاجیایی لە بابەتەکانی ئایین و زانستدا هەبووە لەسەردەمی هاوەڵان (خوا لێیان

---

(١) ئیبن عوثەیمین، القول المفید ٣/٢٦٨_٢٧١.

(٢) مەبەستی لە سوننەت لە ڕووی (فیقهیەوەیە) نەك لە ڕووی زانستی (بنەماکانی فیقهەوە؛ اصول الفقه). (وەرگێڕ).

ڕازی بێت) لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە نەبووەتە هۆی پەرتەوازەبوون و لێکترازانیان بەڵکو دڵ و پەیڕەوەکەیان یەکبوو.

سەبارەت بە حوکم کردنی بە جگەلە پەیامی نێردراوی خوای گەورە ئەوا لە قورئانی پیرۆزدا دابەش دەبێت بۆ سێ بەش: کوفر و ستەم و لاساری (فیسق)، بەپێی ئەو هۆکارانەی کە حوکمەکەی لەسەر بنیادنراوە:

١_ ئەگەر کەسێ حوکم بکات بە جگەلە پەیامی نێردراوی خوای گەورە بەهۆی شوێنکەوتنی ئارەزوو و هەواو هەوەسەکەی و بشزانێت کە حەق لە حوکمی خوای گەورە دایە، ئەوا ئەو جۆرە کەسە تەکفیر ناکرێ بەڵام لە نێوان لاسار و ستەمکاردایە.

٢_ بەڵام ئەگەر یاسایەکی گشتی دابنێت بۆ ئەوەی ئوممەت لەسەری بڕوات و بڕواشی وابێت کە ئەمە چاکە، ئەوا ئەو کەسە لێی تێکچوەو تەکفیر ناکرێت، چونکە زۆربەی حوکمڕانان نەزانن سەبارەت بە زانستی شەریعەت و ئەوەی حوکمی شەرعیش نازانێت پەیوەندیان پێوەدەکات و ئەوانیش ئەو کەسە بە زانایەکی گەورە دەزانن جا ئەمەش دەبێتە هۆی لادان.

٣_ ئەگەر شارەزای شەرع بێت بەڵام بەشێوەیەکی تر حومی کرد و یاسای دانا و کردیە دەستور بۆ ئەوەی خەڵکی لەسەری بڕۆن، ئەو جۆرە کەسە بەستەمکار دادەنرێن و حەق لەوەدایە کە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێز هێناویانە بەڵام ئێمە ناتونین ئەو جۆرە کەسانە تەکفیر بکەین. بەڵام ئێمە کەسێ تەکفیر دەکەین کە بڕوای وابێت حوکم کردن بە جگەلە پەیامی خوا چاکترەو پێویستە خەڵکی لەسەری بڕۆن یان حوکم کردن بە جگەلە پەیامی خوا وەك حوکمی خوایە ئەوا ئەو کەسە بەو کارو باوەڕەی کافرو بێ باوەڕە.

شێخ ئیبن عوثەیمین ئەو کەسانەی تۆمەتبار کرد کە تەکفیری حوکمڕانە موسڵمانەکان دەکەن "بەبێ مەرج و ڕێککاری" بەوەی ئەوانە پاشماوەی خەواریجەکانن ئەوانەی دەرچوون دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، تەنانەت وتی: بێ باوەڕو کافر کەسێکە خواو پێغەمبەر تەکفیریان کردبێت، بەڵام تەکفیر مەرجی هەن؛ لەوانە بوونی زانست و زانیاری لەسەر شتەکە و بوونی ویست لەسەر ئەنجامدانی کارەکە؛ پێویستە لەو کاتەدا بزانین کە حوکمڕانەکە پێچەوانەی حەق جوڵاوەتەوەو کەچی دەشزانێت و ویستیشی وابووە کە ئەو کارە بکات و تەئویلیشی نەکردووە. گرنگ ئەوەیە کە مەرج هەن، دروستیش نییە پەلە بکرێت لە تەکفیر کردندا، هەروەك دروست نییە پەلە بکەیت لەوەی بڵێیت: ئەوە حەڵاڵە و ئەوەش حەرامە[1].

سەرەڕای ئەوەی شێخ صاڵحی کوڕی فەوزانی ئالی فەوزان کتێبێکی دانا لەسەر (یەکتاناسی و حامیەتی خوای گەورە)، لە کتێبەکەدا تەکفیری ئەو حوکمڕانانەی کردووە کە کار ناکەن بە پەیامی نێردراوی خوا و شەریعەت وەلادەنێنن و یاسای دەستکردی لە جێگای دادەنێنن، بەڵام شێخ صاڵح ڕەتی کردۆتەوە کە تەکفیری حوکمڕانەکانی کەنداو بکات یان حوکمڕانێکی دیاریکراو تەکفیر بکات، بڕواشی وایە کە جیاوازی هەیە لە نێوان حوکمی گشتی و دیاریکراو. ئەو کەسانەی تەکفیری حوکمڕانەکان دەکەن بە

(١) ئەو فەتوایەی شێخ عوسەیمین لە ڕۆژی سێ شەممە ڕێکەوتی ٢٢ مانگی ربیع الاولی ساڵی ١٤٢٠ك دەرچووە.

دیاریکراوی ئەوا بە هەواو هەوەس بازی داناون و بە ئاژاوەچی وەسفی کردوون[1].

ئا بەو شێوەیە زانایانی دامەزراوەی وەهابیەتی نوێ دەرگای تەکفیریان داخست دژ بە حوکمڕانان، ئەو دەرگایەش تەنها ڕێگایەکی ڕەواو شەرعییە بۆ بەرپاکردنی شۆڕش لە فیکری سیاسی وەهابی، بەهۆی لادانی تۆمەتی کوفری ڕاشکاو لەسەر ئەوەی پابەند نابێت بە شەریعەتی ئیسلامی و کار ناکات بە پەیامی نێردراوی خوا[2].

---

(١) گەیەنەری دەنگی فەوزان؛

http://mypage.ayna.com/omar_salafi/fouzan01.rm

(٢) ئەو هەڵوێستە کە تەکفیر ڕەت دەکاتەوە ئەوا لە بەرامبەر کۆمەڵەی شیعە هەروەك خۆی مایەوە، چونکە هەندێ گەورە زانایانی ئایینی وەهابی بەردەوام بوون لەسەر تەکفیر کردنی شیعە بەگشتی بە بەڵگەی لاواز، هەروەك شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز لە بەرواری ١٤٠٩/١/٢٢ك فەتوایەکی دەرکرد بە ژمارە ١/١٣٦: " شیعە لە چەندین دەستە پێك هاتووە و هەر دەستە و کۆمەڵەیەکیش ئاڵودەی کۆمەڵێ لە بیدعەتن و ترسناکترین دەستەش بریتیە لە دەستەی رافیضی خومەینی دووازە ئیمامی لەبەرئەوەی بانگەشە کاری زۆرن و ئاڵودەی هاوبەشدانان و شیرکی گەورەن وەك هاوارکردنی ئالوبەیت و بڕوایان وایە کە ئالوبەیت زانستی غەیبیان لەلایە بەتایبەتی دوازدە ئیمامەکان ئەمەش بەپێی گومانی خۆیان ".

http://www.ibnbaz.org.sa./last_resault.asp?hID=1317

هەروەك داوای فەتوا لە شێخ عەبدوڵڵای کوڕی جیبرین کرا سەبارەت بە ئاژەڵی سەربڕاو بە دەستی شیعە لە بەرواری ٢٢-٣-١٤١٢، وتی: " لە وڵاتەکەماندا کەسێکی رافیضی هەیە کە قەسابە و ئەهلی سوننە دەچنە لای بۆ ئەوەی ئاژەڵیان بۆ سەربڕێت و هەندێ چێشتخانە هەن کە هەڵسەوکەوت و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ ئەو قەسابە رافیضیە و هەندێکی تریش دەکەن کە هەمان پیشەیان هەیە... ئایا هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو کەسە رافیضیە و هاووێنەکانی چ حوکمێکی هەیە؟ ئایا ئاژەڵە سەربڕاوەکانی حەڵاڵن یاخود حەرامن؟ تکایە بۆمان ڕوون بکەرەوەو فەتوامان بۆ بدە بە مەبەستی بەدەستهێنانی پاداشت و تەنها خوای گەورە پشتیوان و سەرخەرە ". شێخ بەوە

وەڵامی داوە کە: " ... دروست نیە ئاژەڵ بەدەستی ڕافیزی بکوژرێتەوە تەنانەت سەربڕاوەکەی حەرامە، چونکە زۆربەی ڕافیضەکان زۆربەیان هاوبەش دانەرن، بەشێوەیەك کە بەردەوام لە خۆشی و ناخۆشی و لە تەواف و هاوتوچۆی نێوان سەفا و مەڕوەشدا دا لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەپاڕێنەوە و لە کوڕەکانی دەپاڕێنەوە هەروەك چەندین جار ئەمەمان بیستووە، بەڕاستی ئەم کارەیان هاوبەشدانان و شیرك و هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام کە شیاوی ئەوەن لەسەری بکوژرێن، هەروەك چۆن زیادە ڕەوی دەکەن لە وەسف کردنی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)، تەنانەت جۆرە سیفاتێ بۆ ئیمامی عەلی بڕیاردەدەن کە ئەو سیفەتانە تەنها شیاوی خوای گەورەن بۆیە بەو کارەیان هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام، بەشێوەیەك ئیمامی عەلیان کردۆتە پەروەردگار و بەدیهێنەر و هەڵسوڕێنەرێکی بوونەوەر بەشێوەیەك کە زانستی غەیبی پێیە و سود و زیانی بەدەستە و هاووێنەی ئەمانە، هەروەك ئەو ڕافیضیانە توانج لە قورئانی پیرۆز دەگرن و گومان دەبەن کە هاوەڵان تێکیانداوە و هەندێ شتی پەیوەست بە ئالو بەیت و دوژمنەکانیان ڕەش کردۆتەوە، بۆیە شوێنی ناکەون جێبەجێی ناکەن. هەروەك ئەو ڕافیضیانە توانج دەگرنە هاوەڵە گەورەکان و سێ خەلیفەکان و دە هاوەڵەکانی تر و دایکانی بڕواداران و هاوەڵە ناودارەکان وەك ئەنەس و جابر و ئەبی هورەیرە و هاووێنەکانیان، ئەو هاوەڵانە بە گومانی ئەوان بێ باوەڕن و بۆیە فەرموودەکانیان وەرناگیرێت، تەنانەت ڕافیضیەکان کار ناکەن بە فەرموودەکانی دوو صەحیحەکە تەنها ئەو فەرموودانە نەبن کە لە ئالو بەیتەوە هاتوون و خۆیان وابەستەی فەرموودەی هەڵبەستراون یاخود ئەو قسانەی دەیکەن هیچ بەڵگەیەکیان نییە لەسەری، لەگەڵ ئەوەشدا پیشەیان دووڕوویە بە زمان شتێ دەڵێن و دڵیشیان شتێکی تری شاردۆتەوە کە بۆت ئاشکرا ناکەن، تەنانەت دەڵێن هەر کەسێ توقیەی نەبێت دینیشی نیە، بۆیە بانگەشەکەیان لە هەمبەر برایەتی و خۆشەویستی قبوڵ نەکەن .... تاد ....دووڕووی لەلای ئەوان عەقیدەیە، خوای گەورە ئاژاوەو شەڕیان لەناوببات ~.

http://www.khayma.com/rafidha/ematah.ht

## داخستنی دەلاقەی شۆڕش

ئەگەر تۆمەتی تەکفیر چەسپا لەسەر ئەو حوکمڕانانەی کە کار ناکەن بە پەیامی نێردراوی خوا، هەر ئەمەش بوو بڕوای زۆرێ لە وەهابی تەقوادارەکان، ئەوا پیاوانی دامەزراوەی ئایینی وەهابیەت هەڵسان بە داخستنی ئەو دەلاقەیەی کە دەبێتە سەرچاوەی فیکرەی ڕابوونی شۆڕش، ئەمەش بەڕێگەی ئەوەی کە شۆڕش و ڕاپەڕین بە ڕەهاییان ڕەت کردەوە بە بەڵگەی ئەوەی دەستەوەسانن لە گۆڕانکاری یاخود ترسان لە گەڵاڵە بوونی زیانێکی گەورەتر بەهۆی شۆڕش، موفتی پێشو عەبدولعەزیزی ئیبن بازی وتی: "پاشان، خوای بالادەست و خاوەن شکۆ فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ النساء: ٥٩. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن "لە بیروباوەڕو پابەندیدا"، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ~ "کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت"، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، "ڕەفتارکردنتان" بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان). ئەم ئایەتە دەقێکی ڕاشکاوە لەسەر گوێڕایەڵی کردنی (أولي الأمر) کە پێکهاتوون لە ئەمیرەکان و زانایان هەروەك لە سوننەتی ڕاست دا لە پێغەمبەرەوە ~ هاتووە

که جەخت دەکاتەوە لەسەر پابەند بوون بەو گوێڕایەڵیە، کە لە چاکەدا واجب و پێویستە. دەقەکان لە سوننەتدا ئایەتەکە ڕوون دەکەنەوە و مانای ئایەتەکە بەوە لێکدەدەنەوە کە بریتیەلە گوێڕایەڵی کردن لە چاکەدا، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان گوێڕایەڵی حوکمڕانەکانیان بن لە چاکەدا نەوەك خراپە، جا ئەگەر حوکمڕانەکان فەرمانیان کرد بە خراپە ئەوا نابێ گوێڕایەڵیان بکرێ و ئەمەش مانای وا نییە لەدژیان دەربچی، چونکە پێغەمبەر ~ فەرموویەتی:(هەر کەسێ ئەمیرەکەی بینی کە تاوان دەکات ئەوا با پێی ناخۆش بێت کە تاوان دەکات و سەرپێچی خوا دەکات، بەڵام با بەهیچ شێوەیەك لە گوێڕیەڵی دا دەرنەچێت، چونکە ئەوەی لە گوێڕایەڵ دەربچێت و لە جەماعەت جیاببێتەوە ئەوا بە نەفامی دەمرێت). لە فەرموودەیەکی تریشدا پێغەمبەر ~ فەرموویەتی: (پێویستە لەسەر تاکی موسڵمان گوێڕیەڵ و فەرمانبەردار بێت لەوەی حاڵەتەی پێی خۆشە و پێی ناخۆشە و لە خۆشی ناخۆشی و لە کاتی ئاسایی و ناچاری، مەگەر حوکمڕان فەرمان بکات بە خراپە، چونکە ئەگەر فەرمانی کرد بە خراپە ئەوا نە گوێڕایەڵی و نە فەرمانبەرداری پێویست نییە). هاوەڵێ لە پێغەمبەری خوای پرسی: (کاتێ باسی حوکمڕانانی کرد کە هەندێکیان دەناسن و هەندێکی تریان ناناسن)، هاوەڵان وتیان ئا لەو کاتەدا چی بکەین؟ پێغەمبەر فەرمووی: مافی ئەوان بدەن و مافی خۆتان لە خوا داوا بکەن. عوبادە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: بەیعەتمان دا بەپێغەمبەری خوا ~ کە ململانێ نەکەین لەگەڵ حوکمڕانان. ووتی: مەگەر کوفرێکی ئاشکرای لێ ببینن و بەڵگەتان لەسەری هەبێت لەلایەن خوای گەورەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆیان دروست نیە ململانێ

لەگەڵ حوکمڕانان بکرێت و دەربچن لە دژیان مەگەر کوفرێکی ئاشکرایان لێ ببینن و بەڵگەتان لەسەری هەبێت لەلایەن خوای گەورەوە، لەبەر ئەوەش کە دەرچوون و یاخی بوون لە حوکمڕانان دەبێتە هۆی هاتنە کایەی خراپە و تاوانی زۆر، ئاسایش دەشڵەژێ و مافەکان بە فیڕۆ دەدرێن و ئاسان نابێت ڕێگە لە ستەمکار بگیرێت و پیشتیوانی ستەم لێکراویش بکرێت، تەنانەت ڕێگاو بانەکانیش نائارامیان تێدەکەوێت و لە دەرەنجامی دەرچوون دژی حوکمڕانان ئاژاوەو فیتنەی گەورە دروست دەبن، مەگەر کوفرێکی ئاشکرای لێ بینرا و بەڵگەیان لەسەری هەبێت لەلایەن خوای گەورەوە ئەوا ئەو کاتە دروستە دەربچن دژی دەسەڵات ئەگەر لە توانایاندا هەبوو بیگۆڕن، بەڵام ئەگەر توانایان نەبوو ئەوا با دەرنەچن یان ئەگەر دەرچوونەکە ببێتە هۆی خراپەیەکی گەورەترو زیاتر ئەوا دروست نییە بۆیان دەربچن لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندی گشتی، بەپێی ئەو بنەما شەرعیەی کە یەکدەنگی لەسەرە کە: دروست نییە خراپەیەك بەشتێکی خراپتر لاببرێت، بەڵکو پێویستە ڕێگری بکرێت لە خراپە بەو شتەی خراپەکە سوك و کەمتر دەکات یان هەر لایدەبات، بەڵام ڕێگە گرتن لە خراپە بە شتێکی خراپتر ئەوا بەیەکدەنگی زانایان دروست نییە، ئەگەر کۆمەڵەیەك دەیەوێت ئەو دەسەڵاتە لابدات لەبەر ئەوەی کوفری ئاشکرای کردووە و ئەو کۆمەڵە ئەو توانایەی هەیە کە لایببات و ئیمامێکی چاك و باش لە جێگای ئەو دابنێت بەبێ ئەوەی خراپە و ناخۆشیەکی گەورەتر تووشی موسڵمانان بکات لە دەسەڵاتدارەکە ئەوا ئەو کاتە بۆ کۆمەڵکە دروستە. بەڵام ئەگەر بەهۆی دەرچوونەکە خراپەی زۆر هاتە کایە و ئاسایش تێکچوو و خەڵك پەنهان کوژ کرا بەناحەق ئەوا ئەوو کاتە دروست

نییە، بەڵکو گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لە چاکەدا و ئامۆژگاری کردنی حوکمڕانان و پاڕانەوە بۆیان بەچاکە و تێکۆشان لە پێناوی زیاد کردنی چاکە و کەم کردنەوەی خراپە پێویستە، ئائەمە ڕێگەی ڕاستە کە پێویستە بگیرێتەبەر، چونکە بەرژەوەندییە گشتیەکانی موسڵمانان لە مەدایە و لەبەرئەوەی لەمەدا خراپە کەمتر و چاکە زیاتر دەبێت، بەمەش ئاسایش پارێزراو دەبێت موسڵمانان سەلامەت دەبن لە خراپەی زیاتر، لە خوای گەورە داواکارین کە سەرکەوتن و ڕێنمایی بەهەمووومان ببەخشێت.

شێخ ئیبن باز ڕوونکردنەوەی دا لەسەر بانگەوازی هەندێ لە گەنجان کە توندو تیژیان بە بنەما دانابوو لە گۆڕانکاریدا، شێخی ناوبراو لەوبارە وتی:

ئەوەی ئەمە بڵێت هەڵەیە، تێگەیشتنی لاوازە چونکە ئەوان لە سوننەت تێ نەگەیشتوون و وەك پێویست نەیانناسیوە، بەڵکو غیرەت و جۆش و خرۆشیان هۆکاری هەڵگرتنی چەکە لەلایەن ئەوانەوە بۆ لابردنی خراپە کە دواتر دەکەونە ناو شتێ کە پێچەوانەی شەرعە هەروەك خەواریج و موعتەزیلە تێی کەوتن، خۆش ویستنی سەرخستنی حەق یان غیرەت هەبوون بۆ حەق و ڕاستی وای لێکردن کە بکەونە ناو شتی پڕوپوچ و باتیڵ تا وای لێهات کە موسڵمانانیان بە هۆی تاوانەوە تەکفیر کرد یان بڕوایان وابوو کە کەسی تاوانبار هەتا هەتا لە ئاگردا دەمێنێتەوە هەروەك موعتەزیلە ئەمە دەڵێن.

خەواریجەکان خەڵکیان بەهۆی تاوانەوە تەکفیر کرد و بڕوایان وابوو تاوانباران هەتا هەتا لە دۆزەخدا دەمێننەوە و موعتەزیلەکانیش لەمەڕ سەرەنجام یەکدەنگ بوون لەگەڵ خەواریجدا بەوەی هەتا هەتا کەسی گوناهبار لە دۆزەخدان، بەڵام موعتەزیلەکان وتویانە لە مەنزڵگایەکن لە نێوان دوو

مەنزلگادا و هەموو ئەوانە شتانێکی گومڕان و ئەوەی ئەهلی سوننە لەسەری دەڕۆن هەر ئەمە حەقە، تاوانکار تەکفیر ناکرێت بە تاوانەکەی مادەم بەحەڵاڵی نەزانێت، جا ئەگەر زینا و دزی ئەنجامدا و مەیی خواردەوە ئەوا تەکفیر ناکرێ بەڵام دەبێتە کەسێکی تاوانکاری ئیمان لاوازی لاسار کە یاساکانی لەسەر بەرپا دەکرێن. تەکفیر ناکرێ بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەکە مەگەر بە حەڵاڵی بزانێ و بۆچوونەکەی خەواریج لەمەدا پوچە، تەنانەت تەکفیرەکەشیان پوچە، هەر لەبەر ئەمەش پێغەمبەر ~ لەبارەی خەواریجەکانەوە فەرموویەتی: لە ئیسلام دەردەچن و بۆی ناگەڕێنەوە و جەنگ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن و بتپەرستان پشتگوێ دەخەن. ئەمە حاڵی خەواریجەکانە بەهۆی زیاد ڕۆچوون و نەزانی و سەرگەردانیان بۆیە شیاوی گەنجان و جگەلەوانیش نییە کە لاسایی خەواریج و موعتەزیلەکان بکەنەوە، بەڵکو پێویستە لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەت بڕۆن بەپێی بەڵگەی شەرعی، وەك دەقەکان چۆن هاتوون ئاوا هەڵسوکەوت دەکەن و بۆیان نییە دژی دەسەڵاتدار دەربچن لەبەر گوناه یان چەند گوناهێ کە ئەنجامی داوە، بەڵکو پێویستە ئامۆژگاری و پەیام گۆڕینەوەو تەنانەت بە زمانیش یەکتری ئاراستە بکەن بەڕێگەی جوان و دانایانە، بە قسە گۆڕینەوە بە جوانترین شێوە تا سەربکەون و ئاژاوە کەم و چاکە زیادبێت. دەقەکان بەوشێوەیە لە پێغەمبەری خواوە ~ هاتوون و خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ﴾ آل عمران: ١٥٩. واتە: (کەوابوو "ئەی موحەممەد ~" بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورەو قسە ڕەق و بێ

بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد). وەڵام بۆ ئەوانەی کە غیرەتیان جوڵاوە لە پێناوی خوا و ئەوانەش کە بانگەوازی دەکەن بۆ ڕێنمایی و هیدایەت کە پابەندی یاساکانی شەرع ببن و ئامۆژگاری ئەو کەسە بکەن کە خوای گەورە کردویەتیە حوکمڕانیان بە قسەی جوان و دانایانە و شێوازی باش تا چاکەو خێر زیاد ببێت و خراپە کەم دەبێتەوە و بانگەواز کار بۆ لای خوا زۆر بن، تەنانەت تا لە بانگەوازەکەیاندا بە جوانترین شێوە چالاك بن نەك بە توووند و تیژی. هەوڵی ئامۆژگاری کردنی حوکمڕانیان بکەن بە گشت ڕێگە ئاشتیەکان لەگەڵ پاڕانەوە بۆیان لە پاشە ملەدا بە چاکە بۆ ئەوەی خوای گەورە هیدایەت و سەرکەوتوو و پارمەتی بدات لەسەر خێر و چاکە و پارمەتی بدات لەسەر دەست هەڵگرتن لەو تاوانانەی کە دەیکات و حەق بەرپابکات. ئا بەو شێوەیە بانگەوازی بۆ خوا دەکرێت و لێی دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی حوکمڕانەکان ڕێنمایی بکات و یارمەتیان بدات لەسەر حەق و فڕێدانی شتی پڕوپوچ و بەرپاکردنی شێوازی چاك. تەنانەت ئەمە لەگەڵ برا بە غیرەتەکانیشی بەکاردەهێنێت ئامۆژگاریان دەکات و چاکەیان بە یاد دێنێتەوە تا چالاك بن لە بانگەواز کردن بە چاکترین شێوە نەوەك بە توووندو تیژی، بەمە چاکە زۆر و خراپە کەم دەبێت و خوای گەورە حوکمڕانان بۆ چاکە و خۆڕاگری ڕێنمایی بکات و سەرەنجامی باش بەشی هەمووان بێت.

## وەهابیەت دژایەتی وەهابیەت دەکات

هەر لەم چوارچێوەیەدا ژمارەیەك لە گەورە زانا وەهابی فەرمیەکان، لەسەرووی ئەمانەوە: شێخ (موحەممەد ئەمانی کوڕی عەلی جامی) مامۆستای شەریعەت لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی مونەوەرە و شێخ (ڕەبیعی کوڕی هادی عومەیری مەدخەلی) هەڵدەستن بە چاودێری کردنی بزوتنەوەو حیزب و ڕێکخراوە وەهابیەکان کە تێدەکۆشن بۆ چاکسازی و هەندێ جار دەکرێ دەربچن لە چوارچێوەی دامەزراوەی فەرمی یاخود چالاکی سیاسی سەربەخۆ دەکەن یان هەڵدەستن بە تەکفیر کردنی ئەو حوکمڕانانەی کە شەریعەت پەیڕەو ناکەن و دژایەتیان دەکەن و دایاندەماڵن لە ناسنامەی "سەلەفیەت" یان "وەهابیەت" و ناوی "خەواریج" یا "زیاد ڕۆچوو" لە پشتگیرانی ئەوان دەنێن[1]، ئەمەش هەمان ئەو تۆمەت و وەسفانەن کە بزوتنەوەی وەهابیەت لە

---

(١) ناوی (القطبيين) لەوان دەنێنن وەك دانە پاڵ سەید قوتب، چونکە سەید لە کتێبەکەی (في ظلال القرآن) دا وتویەتی: لەسەر ڕووی زەوی ئەمڕۆ دەوڵەت و کۆمەڵگەیەکی موسڵمان نییە کە بنچینەی هەڵسوکەوت و ڕەفتار تیایدا بریتی بێت لە شەریعەتی خواو فیقهی ئیسلامی (٢١٢/٤) و دەڵێت: مرۆڤایەتی گەڕاونەتەوە بۆ پەرستنی بەندەکان و زۆرداری دینەکان و هەڵگەڕاونەتەوە لە (لا اله الا الله)، ئەگەر چی کۆمەڵێك لەسەر شوێنی بانگدان دا (لا اله الا الله) بڵێنەوە بەبێ ئەوەی هەست بکات بەواتاکەی و پەی بە مەبەستەکەی بدات... دەڵێت: مرۆڤایەتی بەگشتی و ئەوانەش کە لەسەر شوێنی بانگدان (لا اله الا الله) دووبارە دەکەنەوە بەبێ ئەوەی لە ماناکەی بگەن و بیکەنە واقیع، ئەوا ئەوانە گوناهیان گەورەتر و سزایان سەختترە لە دوارۆژدا، چونکە ئەوانە گەڕاونەتەوە سەر بەندە پەرستی پاش ئەوەی ڕێگای هیدایەتیان بۆ ڕۆشن کرایەوە و پاش ئەوەی لەسەر دینی خوا بوون (١٠٥٧/٢).

سەرەتای ئەشو نوماکردنی دا ڕووبەڕووی دەبوویەوە پێشتر بەتایبەتی یاخود لە لایەن دامەزراوەی ئایینی دەوڵەتی عوسانی.

شێخ ڕەبیع مەدخەلی لە وتارێکی دا دەڵێت کە لە پێگەی (سحاب) لەسەر ئینتەر نێت لە ڕێکەوتی ١٧ ڕەمەزانی ١٤٢٢ك بڵاوکرایەوە: " فیتنە و ئاشوب زۆرن.... گەورەترین فیتنە بەڕاستی خەواریجەکانی هاوچەرخن، ئەو فیتنەیە بڵاوبوونەوەیەکی فراوانی هەیە و ژاوەژاوێکی ڕاگەیاندنی ترسناکی هەیە کە بە گشت هۆیەکان بەوپەڕی هێزەوە دەخرێتەڕوو، وەك کتێب و پەیامەکان و لەگەشت هۆیەکانی تری ڕاگەیاندن جا بەڕاستی خراپە و ئاژاوەی ئەمە بە توندی بڵاوەی کردووە. هەڵخەڵەتاندنی ماددی کە لە وا نییە لە جۆری یەکەم بەهێزتر بێت کە نەفس و دەروون نزمەکان دینیان دەفرۆشن بە دونیایان و بەژیانی دوارۆژ ژیانی دونیا دەکڕن بەم هۆیەش بەڵایەکە گەورەتر و زیاتر بوو.

ئەم دەستەیە بەهۆی کێشەکانیەوە ئوممەتی ماندوو کرد... نوقمی سیاسەتی خەیاڵاوی و پڕو پوچیان کردووە، جا شتی زۆر خراپیان کرد لەبەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان لە ئەنجامدا گەنج و توانادارەکانی ئوممەتیان گەندەڵ کرد، پەروەردەیان کردن لەسەر ڕق بوونەوەو ناشرین کردنی ئەهلی سوننە و پەیڕەوی حەقی خوا کە ئەهلی سوننە و یەکتاناسی بانگەوازی بۆ دەکەن و نەوەکانی موسڵمانانی لەسەر پەروەردە دەکەن.

ئەو دەستە سیاسیە خۆیان بە لایەکی ئیسلامەوە گرتووە، کە ناویان ناوە (الحاکمیەت) بە شێوەیەکی سیاسیانە وابەستەی ئەمەن و لە پێناوی ئەمەدا بنچینەی ئیسلام کە وشەی یەکتاناسیان کە (لا اله الا الله) تەحریف کرد و

لێکیان داوەو تەفسیریان کرد بە واتایەك کە پێغەمبەران و دوای ئەوان هاوەڵە زاناکان نەیان زانیوە، دەڵێن: واتای (لا اله الا الله) واتە: هیچ حوکمێ نییە تەنها حوکمی خوای گەورە نەبێت، و حاکمیەت یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی خوایەتی، تەنانەت گەورەکانیان شایەتی ئەوە دەدەن کە ئەوەی تەفسیری (لا اله الا الله)ی کردووە و بەشێوەیەك واتای (لا اله الا الله)ی ڕوون کردۆتەوە کە هاووێنەی نیە لەو سەردەمەدا، بەڵێ ڕاست دەکەن چونکە بەرلەو کەسە هیچ یەکێك لە پێغەمبەران و پیاوچاکان ئەو مانایەیان بۆ (لا اله الا الله)یان لێك نەداوەتەوە، ئەو مانایە واتای ڕاستەقینەی (لا اله الا الله)ی کاڵ کردەوەو فەرامۆشی کرد و کاتێ بەڕاستی زانایان ئەم تەفسیرەیان ڕەت کردەوە ئەوا کۆمەڵێك لەوان هاتن و وتیان: یەکتاناسی چوار بەشە، چوارەم بەشی حاکمیەتە. ئەمەش گەمەیەکی سیاسیە لە کۆی ئەو تەڵەکە و فێڵانەیان دژی ئوممەت کە مەبەستیانە گەنجانی سەلەفی پێ بێ هۆش بکەن تا وای لێهات گەنجەکان دانیان نا بەو دابەش کردنە و بەدڵ قبوڵیان کرد بەشێوەیەك کە حاکمیەتیان کردە سەرەتا و کۆتا بۆ مانای (لا اله الا الله).

مەدخەلی ئەوەی ڕەت کردۆتەوە کە زانایان بابەتی (حاکمیەتیان) لە یەکتاناسی وەدەر نابێت، تەنانەت دەڵێت زانایان (حاکمیەت) دەخەنە ناو (پەروەردگارێتی) و هەندێکیان دەخەنە ناو (یەکتاپەرستیەوە).

دواتر بەرپەرچی نووسەری چاکخوازی داوەتەوە کە ناوی لەخۆی ناوە: (یەکتاناس) و کتێبێکی نووسی لە ژێر ناونیشانی:(تنقیح المناهج من البدع الخوارج): " ئەو نووسەرە حەقیقەتی مەزهەبی قوتبییەکانی دەرخستووە کە تەکفیری ئوممەت و لەسەرووی هەموویانەوە گەورەی زانایان ئیبن باز و

هاوەڵانی. هەموو ئەو شتانەی دەرخستووە کە قوتبییە فێڵبازەکان دەیشارنەوە لە تەکفیری ئوممەت و زانایان، دواتر ئەم نیاز و کارانەیان بە توقیەی هاوشێوەی باتینیەکان دەشارنەوە، وای پیشانی خەڵکی دەدەن کە ئەوان تەکفیر ناکەن بەڵکو دژایەتی تەکفیر و مەزهەبی خەواریجەکان دەکەن و خۆیان بە ئەهلی سوننە و جەماعەت دادەنێنن، ئەگەر حەقیقەتەکەیان وەك ئەوە بێت کە دەری دەخەن ئەوا ئەو خەواریجە تەکفیرییە سوتاوە بۆیان نەدەگریا و نەوەك هەر ئەوە بەڵکو شایەتی داوە لەسەر یاخی بوونیان و دەرچوونی ئەوان پاساودار کردووە بەوەی کوفری ئاشکرایان بینیوە و بانگەواز کارن بۆ ڕاستی و یەکتاناسی و ئیمان.

بێگومان مەزهەبی سەید قوتب وەك خۆری ڕووناك دیارە کە کۆمەڵگا موسڵمانەکان تەکفیر دەکات هەر لە سەردەمانی سەرتاوە، تەنانەت تەکفیریان دەکات بەهۆی شتێکی لاوەکی و گوناه و داب و نەریت، کۆمەڵکەشی شکۆداری دەکەن و تەنانەت بەشکۆوە بۆ کتێب و پەڕەوەکەی دەڕوانن و بە جۆش و خرۆش و چالاکانەوە بڵاوی دەکەنەوەو شوێنکەوتووانیان لەسەر پەروەردە دەکەن و لەسەر دۆستایەتی و دوژمنایەتی بنیاد دەنێنن، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وا دەردەخەن کە تەکفیر ناکەن. کەچی پەیڕەوی سەید قوتب لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەوی بڵاو دەکەنەوە، ئەو کەسە و هاووێنەکانی کە تەکفیری ڕاشکاو دەکەن تەنها بەرهەمێکن لە بەرهەمەکانی تێکوشانە بەهێزەکەیان کە بنیادنراوە لەسەر سادەیی.

لە جەنگی ئەو کەسە و هاووێنەکانی دا بەدەردەکەوێت کە ناوی دەنێنن بە (جامی) و (سەلەفی) کە مەبەستیان لێی سەلەفیەکانن لە تێکڕای پارچەکانی

زەوی و لەسەرووی هەموویانەوە زانایانی سعودییە بەتایبەتی ئیبن باز و عوثەیمین و فەوزان ".

بەم شێوە هەموو ئەو شتانەی کە زانایانی دامەزراوەی ئایینی وەهابی هەڵسان بە قەدەغە کردن و هۆشداردان لەبارەیەوە ئەوا ڕژایە خزمەتی بەرژەوەندی تاکڕەوی ڕەها و دوورکەوتنەوە لە ڕاوێژ، تەنانەت بووە هۆی گەورە بوونی ڕۆڵی حوکمڕان لەسەر حیسابی گەل و بزوتنەوەی وەهابی و خودی دامەزراوەی ئایینی[1].

---

(١) یەکێك لە وەهابییە چاکخوازەکان لەسەر یەکێك لە پێگەکانی ئینتەر نێت لەبارەی پیاوانی دامەزراوەی وەهابی دەڵێت: لە شاری پێغەمبەری خوا ~ فیکرێکی نەخۆش پەیدابوو کە ناونرا بە (مەدخەلی) یان (جامی) وەك دانە پاڵ دانەرەکەی یاخود کۆمەڵەی مەدینە وەك درانە پاڵ شوێنی پەیدابوونیان... بەمەبەستی لێدان لە ڕابوونی ئیسلامی و بزوتنەوە جیهادییەکانە لە جیهاندا لەژێر ناوی سەلەفیەت و دین و وتەی زانایانی پێشین ... یەکێ لە فیکرە و ژەهرەکانیان لە کارخستنی پرۆسەی جیهاد بوو کە جیهاد ئەمڕۆ نییە بەڵکو هەمووی بریتیەلە ئاڵای کوێرانە و ئیمام بوونی ئەمڕۆ نییە، فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە نییە مەگەر حوکمڕانی تاوانبار ڕێگە بدات، گوێڕایەڵی حوکمڕان بەپێی یاسا گوێڕایەڵی خوایە و بەیعەتی لە گەردنی خەڵکی دایە ئەگەر شەریعەت پەراوێز بخات و ئیمان بگۆڕێتەوە بە کوفر، ئامۆژگاریش تەنها دەبێت بە نهێنی بێت، مرۆڤ کافر نابێت بەهۆی ئەنجامدانی کوفرێکی گوفتاری یان ڕەفتاری مەگەر بەدڵ بە حەڵاڵی بزانێت. هەموو خەڵکی لەلای ئەوان لە سەر ڕێگەی پێشینان نین تەنها خۆیان نەبن و هەموو خەڵکی نەزانە تەنها ئەوان زانان و بەس. هیچ کەسێ نییە کە ئەو ڤایرۆسەی گرتبێت ئەوا ئیلا ڕووی گرژ بووە لە بەرامبەر برادەرەکانی و ڕەوشتەکەی خراپ و قسەکانی ڕەق بووە، بەشێوەیەك بۆ حوکمڕان ملکەچ بووە کە وەك ئاژەڵی سواری و ڕایەخ لێهاتووە. دینیان ڕووت کردەوە لە ڕوح و ناوەڕۆکەکەی و کردوویانەتە چەند تەڵسوم و نوشتە و حاڵەتێك، جا سیاسەتیان دارنی لە دین و هەڵسان بەڕەتکردنەوەی فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە و دڵسۆزی بۆ ئوممەت و زیندوو کردنەوەی پاش مردنی، حوکمەکانی خوایان لە کار خست کە پێویست کرابوو بەهۆی کوفری و لاساری و بیدعەتەوە ".

به لەبەرچاو گرتنی سروشتی جەماوەری بزوتنەوەی وەهابیەت، ئەوا شتێکی پێویست دەبوو کە پێشبینی هاتنە کایەی چەند تەیارو دەستەیەك بکەین و کورتی هەڵنەهێنین لەیەك تەیاردا کە پاشکۆی دەسەڵاتە. هەتا لەناو دامەزراوەی ئایینی فەرمی ئەوا بوونی بۆچوونی جیاواز شتێکی دوور نەبوو بەتایبەتی لەگەڵ نەبوونی ڕاوێژ لە ناویدا و دیاریکردنی هەڵوێستی دەستەی گشتی لەلایەن دەسەڵاتەوە لەهەمبەر پێش هاتەکان. لێرەوە شتێکی ئاسایی دەبوو کە بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیۆن و دژ بە ڕژێمی سعودی سەرهەڵبدەن هەر لە ناوەوەی بزوتنەوەی وەهابیەت لە بەرامبەر دامەزراوەی ئایینی فەرمی کە پاشکۆ و پشتگیر و کۆڵەگەی ڕژێمەکە بوو.

ئەو بۆچوونانەی دژی ڕژێمی سعودی جاواز بوون و دابەش بوون بۆ چەند دەستەو تەیارێ، منیش دابەشی دەکەم بۆ سێ بەشی سەرەکی:

١_ ئۆپۆزیسیۆنی چاکساز خواز (پاشکۆی ڕژێمەکە).

٢_ ئۆپۆزیسیۆنی دەرەکی (ڕەتکەرەوەی ڕژێمەکە).

٣_ ئۆپۆزیسیۆنی ڕادیکاڵی[1](تەکفیری ڕژێمە حوکمڕانەکە دەکات).

ئەوەی ئەو سێ بەشانە کۆدەکاتەوە بریتیە لە نەبوونی جیاوازی بنچینەیی لە فیکری سیاسی وەهابی و گەڵاڵە بوون لەناو عەقڵی سیاسی ڕژێمەکە و بە بنەما نەکردنی ڕاوێژ و هەڵبژاردن یاخود بەژداربوونی جەماوەر لە دەسەڵاتدا یان بانگەواز کردن بۆ گۆڕینی ڕژێمەکە لە ڕێگەی دەستورەوە یان گۆڕینی پەیوەندی نێوان حوکمڕان و هاوڵاتیان، بەشێوەیەك کە

(١) لە پێشەکی نووسەردا پێناسەی (ڕادیکاڵ)مان خستۆتەڕوو. (وەرگێڕ).

ئۆپۆزیسیۆنایەتیەکەی کورت بوومتەوە لە ڕەخنە گرتن لە حوکمڕان (و دەکرێ بانگەوازیش بکەن بۆ ڕووخاندنی) و سیفەتی ستەمکاری و لاساری و کوفری دانە پاڵ حوکمڕان یاخود ڕەخنە گرتن لە هەندێ لە هەڵسوکەوتەکانی کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامی و عەقیدەی یەکتاناسیین، ئەمەش بەپێی تێگەیشتن و تێڕوانینی وەهابی. بەڵام بەبێ ئەوەی جێگرەوەیەکی ڕیشەیی پێشکەش بکەن یاخود ڕەگ و ریشەکانی قەیرانی سیاسی دەستنیشان بکەن، کە بریتیەلە سروشتی ڕژێمی دیکتاتۆری و تاکڕەوی خۆسەپێنەری ڕەها. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئۆپۆزیسیۆنی وەهابی هەوڵدەدات چاکسازی بکات لە ڕژێمەکەدا یاخود هەندێ لە هەڵوێستەکانی بگۆڕێت یان حوکمڕانەکە لابدات و یەکێکی تر لە جێگای دابنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانکاری ڕیشەیی ڕەتدەکەنەوە بە ئاراستەی دامەزراندنی ڕاوێژ و گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ گەل و ڕازی بوون بەوەی سندوقەکانی دەنگدان بڕن دادوەر.

### ا_ ئۆپۆزیسیۆنی (چاکسازی خواز)ی پاشکۆ

لەوانەیە دیارترین نمونە بۆ ئەو جۆرە ئۆپۆزیسیۆنە بریتیبێت لە دەستە و تەیاری چاکساز خواز کە لە ناو دامەزراوەی ئایینی وەهابی لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم دروست بوو، ئەو تەیارە ناسراوە بە تەیاری (یاداشتنامەی ئامۆژگاری) کە ژمارەیەك لە گەورە زانایانی ئایینی پێشکەشیان کرد بە شا فەهد ساڵی ١٩٩٣. ئەم تەیارە دەستی بە چالاکیەکانی خۆی کرد لە کاتی جەنگی کەنداوی دووەمەوە وەك نارەزاییەك دژی بریاری حکومەتی سعودیە کە بریاری دابوو یارمەتی لە ئەمریکیەکان و بیانیەکان (بێ باوەڕان) وەربگرێت لە دژی سەرۆکی عێراقی صەدام حوسەین لە ساڵی ١٩٩١، ئەم یاداشتە نا ڕەزایی بوو دژی هەڵوێستی گەورە زانایان ئەوانەی فەتوایان دەرکرد بەوەی بە دروستیان دانا کە سەربازی نا موسڵمان بێنە ناو خاکی شانیشینی عەرەبی سعودی لە میانەی پرۆسەی "گەردەلولی بیابان"[1] جا ئەم تەیارە هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی کاسیێت و بڵاوکراوە کە تیایدا ڕایان گەیاند کە هێزی سەربازی

---

(١) شێخ ئیبن باز ئەو کات وتی: " ئەوەی کە حکومەتی سعودیە پێی هەڵسا لەبەر ئەو ڕووداوانە بوون کە هاتنە کایە لە ئەنجامی ستەمکاری سەرۆکی دەوڵەتی عێراق لە بەرامبەر دەوڵەتی کومیتی، بۆیە یارمەتی وەرگرتنی دەوڵەتی سعودیە بە هێزە موسڵمان و نا موسڵمانەکان بۆ ڕێگرتن لە ستەمی دوژمنان و بەرگری کردن لە وڵات ئەوا ئەو کارە شتێکی دروستە و ناچاریی ئەو شتە پێویست دەکات، لەو کارەیدا دەوڵەتی سعودیە پاساوی هەیە و تەنانەت سوپاس کراوە لەسەر دەست پێشخەریەکەی ". (ڕۆژنامەی "اقرا"، ژمارە ٧٧٩ لە بەرواری ١٩٩٠/٨/٢٣) و (عبدالله، انور: العلماء والعرش ٣٩٢)".

ئەمریکی بوونی هەیە لە شانیشینی عەرەبی سعودییە " لانك و بێشکەی ئیسلام".

ژمارەیەك لە ئەندامانی دەستەی گەورە زانایان چوونە پاڵ ئەو تەیارە[1]. جەنگەکە کۆتایی هات ئەو تەیارە خێرا یاداشتنامەی پێشکەش بە شا فەهد کرد کە زیاتر لە چوار سەد کەس داوا لە شا دەکەن پەلە بکات لە پرۆسەی چاکسازی دا، یاسای دەستکرد بگۆڕێت و هێزی سەربازی توکمە و بەهێز بکات[2] ئەوەی هاندەری ئەو تەیارە بوو ئەوە بوو کە شا فەهد لە ساڵی ۱۹۹۰ ڕایگەیاند کە نیەتی هەیە هەڵسێ بە چاکسازی سیاسی و دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاوێژ. شێخ سولەیمانی عۆدە و شێخ سەفەری حەوالی و شێخ عەبدوڵڵای کوڕی جیبرین لە هاوینی ساڵی ۱۹۹۲ هەڵسان بە پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ چاکسازی و ڕاوێژ و نووسینی یاداشتنامەی ماف خوراویی و ستەمەکان و دایانە دەستی ئیبن باز، بەڵام پێشوازییەکی گەرم لەو یاداشتنامەیە نەکرا لەلایەن ئیبن بازەوە، چونکە ئەو وای دەبینی کە سنور شکێنی کراوە لە ڕۆڵی گەورە زانایان ئەوانەی کە ئامۆژگاری و ڕاوێژکاری پاشایان قۆرغ کردووە و تێڕوانینی وابوو ئەو یاداشتنامەیە شکاندنی ڕێچکەی کۆنی وەهابیەتە کە بریتیە لە ئاراستەکردنی ئامۆژگاری بەشێوەی نهێنی بۆ حوکمڕانەکان.

---

(١) هاووێنەی: شێخ عەبدوڵڵای کوڕی قعود و شێخ عەبدوڵڵای کوڕی جبرین و شێخ سولەیمانی کوڕی فەهدی عۆدە و شێخ سەفری کوڕی عەبدوڕەحمانی حەوالی و شێخ حەمودی کوڕی عەقلانی شەعبی و شێخ عەبدوڵڵای مەسعەری. سەرۆکی پێشوی دیوانی ماف خوراوەکان.

(٢) عبدالله، انور، العلماء والعرش ٣٩٧.

لەسەر ئەمە دەستەی گەورە زانایان كۆبوونەوەیەكیان گرێدا لە بەرواری ١٤١١/١١/١٩ك و ڕوونكردنەوەیەكی دەركرد كە تیایدا هاتووە:

_ دەستەی گەورە زانایان ئەو شێوازەی كە گیراوەتەبەر لە بڵاوكردنەوەی نووسراوەكە بە ناشیاو ناشرین دەزانێت و هۆشداریش دەدات لە سەرەنجامی دووبارە بوونەوەی ئەو جۆرە شتانە لە داهاتوودا، وای بۆ دەچێت كە ئەو ڕێگەیەی گیراوەتە بەر بۆ بڵاوكردنەوەی ئەم یاداشتە بەرژەوەندی تێدا نییە و نابێتە هۆی یارمەتی دان لە چاكەدا... ئامۆژگاری كردنی پێشەوایانی موسڵمانان دەكرێ بە نهێنی بێت لە نێوان ئەوان و ئەوەی دەیەوێت ئامۆژگاریان بكات[1].

ئەو تەیارە بەرپەرچی ڕوونكردنەوەی دەستەی گەورە زانایانی دایەوە، بەوەی ئامۆژگاری دەستەی گەورە زانایانی ڕەت كردەوە لەهەمبەر پرۆسەی فەرمان بەچاكە و ڕێگری لە خراپە یاخود پابەندبوون بە ئامۆژگاری كردن بە نهێنی، كەچی لە بەرامبەردا تەیارەكە ئەوەی ڕاگەیاند كە توانای هەیە دەنگی بگەیەنێتە حوكمڕان ڕاستەوخۆ و پێویست ناكات بە ڕێگەی دەستەی گەورە زانایان بێت[2].

دوای ئەوەی شا فەهد سێ دامەزراوەكەی ڕاگەیاند ئەوا ئەم تەیارە چاكساز خوازە هەڵسا بە پێشكەش كردنی "یاداشتنامەی ئامۆژگاری" بۆ پاشا و دامەزراندنی (لیژنەیەك بۆ بەرگری كردن لە مافە شەرعیەكان)یان ڕاگەیان لە مانگی ئایاری ١٩٩٣، ئەم یاداشتنامەیە گرنگترین بیرۆكەكانی تەیارە

---

(١) عبدالله أنور، العلماء والعرش ٣٩٧.

(٢) عبدالله، أنور، العلماء والعرش ٣٩٨.

چاکخوازەکەی لە خۆ گرتبوو، لە بواری کارگێڕی و سیاسی و ئابوری و سەربازی و دادوەری و کۆمەڵایەتی، بەڵام لە یاداشتەکەدا باس لە ڕووخان و تێکدانی ڕژێمەکە نەکرابوو، بەڵکو جوڵانەوەکەی خۆی پاراست لە چوارچێوەی فیکریە سیاسیە فەرمیە گشتیەکە[1].

یاداشتنامەکە پشتی بەستبوو بە بڕگەی بیست و سێیەم لە سیستەمی بنەڕەتی کە پاشا دانی پێدانابوو، هەروەك لە بڕگەکەدا هاتووە: " دەوڵەت عەقیدەی ئیسلامی دەپارێزێت و شەریعەت جێبەجێ دەکات و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکات و هەڵدەستێت بە ئەرکی بانگەواز کردن بۆ لای خوای گەورە " بۆ ئەوەی داوا بکەن بە ڕاست کردنەوەی ڕۆڵی پیاوانی ئایینی لە دەوڵەتی سعودیەدا لەوەی پاشکۆی دەسەڵاتن بگۆڕێت بۆ ئەوەی دەسەڵات ببێتە پاشکۆی ئەوان " پێویستە زانا و بانگخوازان پلەیەکیان هەبێت کە بە هیچ پلەیەکی تر بەراورد نەکرێت و لە پێشەوەی ئەندامانی هەڵوەشێنەرەوەو گرێدان و فەرمانکار و ڕێگری کاران (حل و العقد و أمر و النهی) بن، ئوممەت بە دەسەڵاتدار و ژێردەستەوە بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی لە گشت کارێکی دیندار و دونیاداریان پێویستە بۆ لای ئەوان بگەڕێنەوە "[2] و یاداشتنامەکە ڕەخنەی گرتووە لە واقیع و حاڵی پیاوانی ئایینی ئەوانەی کە دەبینرێن لە:

١_ لاوازی ڕۆڵی زانایان لە ژیانی گشتی، تەنانەت بینینی ڕۆڵی پەراوێز لە شوێنە زۆر گرنگەکان لە ژیانی ئوممەتدا وەك یاسادانان و ڕاگەیاندن و چالاکی

---

(١) عبدالله، أنور، العلماء والعرش ٣٩٩.

(٢) مذكرة النصيحة ١٠.

ڕۆشەنبیری و ئابوری بەشێوەیەك كە زۆرێ لە دەزگاكانی دەوڵەت كە بەكارەكان هەڵدەستن ڕای زانایان وەرناگرن، تەنانەت بەشێوەیەكی دەگمەن ڕاوێژیان پێدەكرێت لە بڕیارە گرنگەكانی ناوەخۆیی و دەرەكی كە پێویستی بە حوكمی شەرعی و بنەما تێرو تەسەلەكانی ئیسلامەتیە... تەنانەت دەكرێ وەڵامی فەتواكانیان نەدرێتەوە كاتێ تێكدەگیرێ لەگەڵ ڕێنماییەكانی ئەو دەزگا و یەكانە و لەوانەیە هەر ڕێگەش نەدرێ بە بڵاوبوونەوەی ئەو بۆچوون و فەتوایانە. هەموو ئەو شتانە هەواڵدەرن بەوەی كە دەكرێ ببێتە هۆی جیاكردنەوەی دین لە واقیعی خەڵكی و نەهێشتنی كاریگەری دین لە گوزەرانیان دا و ئەو دەرەنجامەی لەسەر ئەمەش كەڵەكە دەبن ئەوا زۆر ترسناكن كە ئەو بنەمایانە دەڕوخێنێت كە دەوڵەت لە پێناوی دامەزراوە لە بانگەوازی كردن بۆ ئیسلام و جێبەجێ كردنی حوكمەكانی.

٢_ سەربەخۆ نەبوونی زانایان و پەیوەست بوونیان بە دامەزراوەو فەرمانگە جیا جیاكانی حوكمەتەوە، ئەمەش بووەتە هۆی بەستنەوەی زانایان لە كاتی دەركردنی فەتواكانیان و دوورخستنەوەیان لە واقیعی ژیانی ڕۆژانە و دانانیان بە لاسایی كەرەوە نەوەك لاسایی كراو و بەڕێوەبراو نەوەك بەڕێوبەر.

٣_ زیاد لە پێویست هەستیار بوون لە بەرامبەر ئامۆژگاری و ڕێنمایی و ڕەخنەی ئامانجداری بنیاتنەر كە لەلایەن زانا و بانگخوازان پێشكەش بە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و دەزگا جۆراو جۆرەكان دەكرا، ئەم هەستیاریەش بووە هۆی بەرتەسك كردنەوە لە بانگەواز و بانگخوازان و دەركەوتنی چەند شێوازێكی نەناسراو لەلایەن پێشینەكانی ئەم دەوڵەتە وەك دوورخستنەوەی

بانگخوازان یان لەسەر کار لابردنیان و ڕێگری لێکردنیان لەوەی بە کاری خۆیان هەڵبستن لە زۆربەی کاتەکان دا.

٤_ کورت هەڵێنانی ئەرکی ڕاگەیاندن لەو بابەتانەی کە گشتین و شتی لاوەکین کە بڵاو دەکرێنەوەو دەنوسرێن و پەخش دەکرێن لەلایەن زانایان و بانگخوازانەوە، تەنانەت توونددو توڵ کردنی چاودێری بەسەر هەموو ئەو شتانەی کە پەخش و بڵاو دەکرێنەوە.

٥_ کورت هەڵێنانی بابەتی وتاری هەینی و پەیامی مزگەوت لە ئامۆژگاری گشتیدا و ڕێگری کردنی لەوەی بپرژێنە سەر بابەتی گشتی کە باون لە ناو واقیعی موسڵمانا و هەڵوێستی شەرعی لەبارەیانەوە. بەهەمان شێوە سنوردار کردنی کۆڕو وتارە گشتیەکان کە چارسەری بابەتە هەنوکەییەکان دەکەن. چاودێری دانان لەسەر ئەوەی دەوترێ و بڵاودەکرێتەوە[1].

بەم پێیە یاداشتنامەکە داوایکرد بە چاك کردنی حاڵ و بارودۆخی زانایان و بەهێز کردنی ڕۆڵیان و پایەدار کردنیان لە هەڵسان بە کاروباریان، ئەمەش بە لابردنی هەموو بەند و مەرج و ڕێنماییەکان کە سنورداری چالاکی بانگخوازان دەکات و ڕێگەدان پێیان بە دانان و نووسین و بڵاوکردنەوەو فەتواو وتاردان و بەستنی کۆڕو بازنەی زانستنی، بەبێ ئەوەی پێویست بکات بەوەی ڕەزامەندی و لاری نەبوونی فەرمی وەربگیرێت لە وەزارەتی ڕاگەیاند یاخود ئەوقاف یان دەزگاکانی تری دەوڵەتیش، کار بکرێت بۆ ئەوەی دادگای شەرعی بکرێت بە تاکە دامەزراوەو لەمیانەشیدا بڕوانرێتە هەر لاساریەك کە دەدرێتە پاڵ زانا و بانگخواز و جگەلەوانیش بەوەی ئەو دادگایە لێ پێچینەوەو

---

(١) مذكرة النصيحة ١٠_١١.

لێکۆڵینەوە لەو جۆرە دۆسیانەدا بکات. یاداشتنامەکە پێشنیاری کردووە کە ڕۆڵی دەستەی گەورە زانایان بەهێز بکرێت بەوەی کەسانی پاك و بۆخوا صوڵحاو ناودار و توانادار و خاوەن ئیجتهادی قبوڵکراو لەلایەن تاکەکانی ئوممەت بکرێن بە ئەندامی دەستەی ناوبراو، ئەمەش بەوە دەبێت کە بپاڵێورێن لەلایەن یەکە شەرعیەکان وەك دادوەر و ئەندامانی فەتوا و ڕێنماییکار و ئەنجومەنی دادوەری باڵا و مامۆستایانی شەریعەت، هەروەك داواشی کرد کە هەموو یاسا و هاوپەیمانیەکان کە کار بۆ دانانی دەکریت بەر لە دانپێدانانی ئەوا بۆ دەستەی گەورە زانایان بخرێتە ڕوو بۆ جەختکردنەوە لەوەی ئایا کۆکە و یەکدەگرێ لەگەڵ شەریعەت و ئەحکامەکانی[1].

دەکرێ بڵێین داواکاری ئەو یاداشتنامەیە بریتیە لە جۆرێك لە (ولایەتی شەرعزانەکان) بەسەر دەوڵەتی سعودییە. لەگەڵ ئەوەشدا یاداشتنامەکە داوای کردووە زانایان بپاڵێورێن بۆ ئەو دەزگایەی کە وەك (ئەنجومەنی یاسادانان)ە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشت بە ئاستی ئەوەی داوا بکرێت ئەو ئەنجومەنە هەڵبژێردرێت لەلایەن ئوممەت لەڕێگەی هەڵبژاردن و دەنگدانی گشتی، بەڵکو تەنها داوای کرد بوو هەڵبژێردرێن لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە نەوەك لەلایەن حکومەتەوە.

بەپێچەوانەی ئەوەی کە فیکری سیاسی وەهابی فەرمی لێی ڕاهاتبوو لەوەی کە گوێڕایەڵی ڕەها بۆ ئیمام پێویستە بنوێنرێت ئەوا یاداشتنامەکە ڕەخنەی گرتبوو لە زەوت کردنی ئازادییە گشتیەکان، لەوو بارەوە تیایدا هاتووە: " لە ناو خەڵکی دا بڵاو بووتەوە کە دەوڵەت بۆی نییە ئەو شتانە

---

(١) مذكرة النصيحة ١٢_١٣.

قەدەغە بکات یان بکاتە شتی پێویست کە ڕێپێدراو (مباح)ن بە ناوی ئەوەی کە بەرژەوەندی گشتیە لەبەر ئەوەی شەرع مرۆڤی سەرپشك کردووە لەوەی بکات یان نەیکات. لەو گومانە پۆخەڵە ئەوە هاتەکایە شتانێ کە خواو پێغەمبەر حەرامیان کردبوو حەڵاڵ کران و شتانێ پێویست و واجب کران کە خوای پایەبەرز پێویستی نەکربوو، تەنانەت پابەند کردنی هاوڵاتیان بەمە و سزادانیان لەسەر هەڵسوکەوت کردنی پێچەوانە بەبێ بەندو قەیدی شەرعی یاخود ڕەزامەندی بەدەستهێنان لە یاسادانەری ئیسلامی لەمبارەیەوە.... شەریعەتی ئیسلامی ڕێگری کردووە کە مرۆڤ خۆی قەدەغە بکات لە شتێکی ڕێپێدراو ئەگەر بە مەبەستی پەرستیشی بێت... جا چۆن دەبێت بۆ دەوڵەت کە هەندێ شتی ڕێپێدراو حەرام بکات یان ئەنجامدانی ئەو شتە ڕێپێدراوانە پێویست بێت بە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی دەوڵەت؟... چونکە لە بنەڕەتدا بۆ دەوڵەت نیە شتی ڕێپێدراو حەرام و قەدەغە یان پێویست بکات یان تەنها ڕێگە بە کەسانێ بدات ئەنجامی بدەن کە ڕەزامەندی دەوڵەتیان بەدەست هێناوە، چونکە ڕێپێداروی (الاباحە) حوکمی بەدیهێنەری بەندەکان و پەروەردگاری پایەبەرزیانە، هەر کاتێکیش بەبەڵگە حوکمی ڕێپێدراوی و حەڵاڵی شتێ سەلمێنرا ئەوا بۆ بەدیهێنراوێ نییە بە ڕەها قەدەغەی بکات یاخود پابەندبێت پێیەوە و تەنانەت دەوڵەتیش ئەوەی بۆ نییە تەنها بەپێی ئەو حاڵ و بارودۆخانە نەبێت کە بە شەرع ڕوون کراونەتەوە "[1].

یاداشتنامەکە ڕەخنەی لە زۆرێ لەو یاسایەنەی گرت کە شا فەهد پێشکەشی کردبوون، تەنانەت ئەو یاسایانەی بە دژی ئازادیە گشتیەکان یاخود

(١) مذكرة النصيحة ٢٠ و ٢١ و ٢٣.

بە وەرگیراوی لە یاسا و دەستورە بیانیە بێ باوەرەکانی دانا وەك یاسای هاوڵاتی بوونی سعودیە کە " جیاوازی دەکات لە نێوان موسڵمانان و ناونانی موسڵمان بە ناوی بیانی لە زۆر شتدا لەسەر بنەمای هەرێمی و شوێنی لە دایك بوون بەپێچەوانەی ئەحکامەکانی وڵاتی ئیسلام کە ناسراون لە دیندا "[1].

یاداشتنامەکە پێداگیری کرد بە ئاگاداری دان لەسەر (سیستەمی بنەڕەتی) کە پاشا پێشکەشی کردبوو؛ بە سەربەخۆ بوونی دادگا، یادشتنامەکە داوای کرد بە وەی ئەمە لەواقیعدا بچێتە دۆخی جێبەجێ کردنەوە، لابردنی ڕێگری لەسەر دادگا شەرعیەکان بۆ ئەوەی بڕاونێتە ئەو سکاڵایانەی نوسراون لەسەر لایەنەکانی حوکمەت، ڕێگری کردن لە تەماشا کردنی ئەو سکاڵایانەی کە بەرز دەکرێنەوە بۆ دادگاکان و دیوانی مافخوراویەکان (دیوان المظالم) بەبەڵگەی ئەوەی ئەمە لە بابەتەکانی سەرومریدان، وەك ئەو سکاڵایانەی پێشکەش کراون لە دژی دەزگاکانی و ڕێنامە (الجوازات) لێکۆڵینەوە و جگەلەوانیش. درێژ خایەندنی بەرچاو لە جێبەجێ کردنی ئەو حوکم و فەرمانە دادگاییانەی کە دەرچووینە لە دیوانی ماف خوراویەکان دژی دەزگا و وەزارەتەکانی دەوڵەت، بەهەمان شێوە ئەو فەرمانانەی دەرچووینە لە دادگاکان بە گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان ئەگەر ئەو پەیوەست بوون بە دەزگاکانی دەوڵەت یان هەندێ لە گەورە بەرپرسەکان[2]، یاداشتنامەکە پێشنیاری کرد لە پێناو چاك کردنی واقیعی دادوەری ئەوا کار بکرێ بۆ لابردنی بەند و قەیدەکان کە دەبنە کۆسپ و ڕێگر لە بەردەم جۆرەکانی دادگا و ناردنی سکاڵا بۆ دادگا شەرعیەکان

(١) مذكرة النصيحة ٢٥.

(٢) مذكرة النصيحة ٣٥.

بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بێ هۆکار یان ڕەوانەکردنی بۆ شوێنانی تر، جا چ سکاڵاکە تایبەت بێت یان فەرەبوو بێت یاخود بابەتی ململانێ بێت کە ڕووبەڕووی دەزگاکانی حوکمەت بووەتەوە. تایبەت کردن و سپاردنی کاری ڕێنمایی کردنی دادوەران بە ئەنجومەنی باڵای دادوەری و ئاراستە کردنی دەزگا و میرنیشین و وەزارەتەکانی دەوڵەت بۆ پابەند بوون بەمەوە. دەسەڵاتی دادگای شەرعی فراوان و زیاد بکات بۆ ئەوەی پیاوانی ئاسایش و پۆلیس و نوێنەری دەستەکان و هاوشێوەی ناوبراوان بگرێتەوەو ملکەچی ببن[1].

لەژێر بەندی (واقیعی ڕێزو کەرامەت و مافەکانی مرۆڤ) یاداشتنامەکە ڕەخنەی گرت لە هەڵسانی دەزگاکانی ئەمن و ئاسایش هەڵدەستن بە سیخوڕی کردن و گوێهەڵخستن و پشکنینیماڵەکان و کردنەوەی پەیامەکان و دەستدرێژی کردن بە لێدان و کوتان و ئەشکەنجەدانی ئەوانەی کە هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعیەکەیان وەك بانگەوازی و ئامۆژگاری و دەربڕینی شتی دروست و ڕەوا و فەرمان بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، یاداشتنامەکە ڕەخنەی لەوەش گرت کە حوکمەت ڕێگرە لە پێکهێنانی ڕێکخراوی بانگخوازی یان دانان و نووسین و وتاردان مەگەر بە ڕازامەندی خۆیان نەبێت[2].

یاداشتنامەکە ڕەخنەی گرت لە هێزی سەربازی سعودی لەوەتەی وڵات یەکی گرتووە، کە هێز ڕۆڵی جیهادی خۆی نەگێڕاوە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی یەکتاناسی و سەرخستنی موسڵمانە ستەم لێکراوەکان، داواشی کرد

(١) مذكرة النصيحة ٣٦ _ ٣٧ و ٤١.

(٢) مذكرة النصيحة ٤٧ _ ٤٨.

به هەڵوەشاندنەوەی گشت پەیوەندی و هاوپەیمانی سەربازی کە کەم و کورتی دەخاتە سەروەری و سەربەخۆیی دەوڵەت و پشت نەبەستێ بە هیچ هێزێکی بیانی لە هیچ حاڵ و بارودۆخی پاراستن و بەرگری کردن لە وڵات[1].

یاداشتنامەکە ڕەخنەی گرت لەوەی کە خۆی ناوی ناوە بە سیاسەتی ساردو سوڕی و خۆ نەزان کردن و سەرشۆڕی و ناشرین کردنی ڕاگەیاند کاری (الاعلامی) کە شانیشنی سعودیە دەیگرێتە بەر لەگەڵ ئاراستە ئیسلامیەکان جا چ دەوڵەت یان بزوتنەوە یاخود کەس بێت[2]،پێداگیری کردن لەسەر تێك نەگیرانی بەرژەوەندی ڕژێمە خۆرئاوایەکان کە دوژمنانی ئیسلام بەرپێوەی دەبەن و دراوسێتی کردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە زۆربەی هەڵوێست و پەیوەندی و بڕیارەکان دا وەك چوون بەرەو پرۆسەی ئاشتی لەگەڵ جولەکەدا. یاداشتنامەکە داوای کرد بە کارکردن بە سیاسەتی یەکێتی ئیسلامی و کارکردن لەم پێناوەدا و پاڵپشتی کردنی کێشەکانی موسڵمانان لە گشت کۆبوونەوە نێودەوڵەتیەکان و هەڵسوکەوت کردن بە دانایی لەگەڵ دەوڵەت و کوتلە و ئاراستە دژەکانی ئیسلام بەتایبەتی ڕژێمە خۆرئاوایەکان، خۆ دوورگرتن لە هەموو جۆرە هاوپەیمانی و یارمەتی دانێ کە خزمەتی ئامانجەکانی ئیستعماری دەکات و کاریگەریشی دەبێت لەسەر بڕیاری سیاسی وڵات[3].

---

(١) مذكرة النصيحة ٧٤ و ٧٧.

(٢) جگەلە بزوتنەوەو دەوڵەتە شیعیەکان، چونکە شێخ ئیبن جیبرین فەتوای دەرکرد کە تیایدا بەگشتی تەکفیریان دەکات.

(٣) مذكرة النصيحة ٩١ و ٩٣.

سەرباری ئەوەی کە یاداشتنامەکە ئەو هەموو خاڵە گرنگ و کاریگەریانەی خستەڕوو، کەچی هەر لە چوارچێوەی (ئامۆژگاری) دا مایەوە و هیچ هەنگاوێکی کرداری بەرەو پێشەوە نەچوو بۆ ئەوەی شێواز و ئامرازێك دابنێت بۆ جێبەجێ کردنی داواکارییەکانی، ئەمەش بە خستنەڕووی بابەتی ڕاوێژ و هەڵبژاردن یان گوشار خستنە سەر حوکمەت بە هەڵسان بە ئەنجامدانی خۆ پیشاندان و کار نەکردنی گشتی (جگەلە چەند خۆپیشاندانێکی دیاریکراو و سنوردار نەبێت کە لە _ بریدە _ ئەنجامدرا) چ جای بەکارهێنانی توندو تیژی یاخود بانگەشە کردن بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سیاسی. چاکخوازەکان بەردەوام بوون لە دەربڕینی نارەزایی و پێشکەش کردنی ئامۆژگاری و ڕەخنە گرتن بەڵام لە چوارچێوەی ڕێپێدراو لە فیکری سیاسی وەهابی و لە چوارچێوەی دڵسۆزایەتی تەواو بۆ ڕژێمی سعودی. سەرباری ئەمەش ئەوا شێخ عۆدە و حەوالی دەستگیر کران و ئیبن قعود و شوعەبیی لە دەستەی گەورە زانایان وەك ئەندام لابران و بزوتنەوەی شێخ مەسعەری بەستراوەو سنوردار کرا.

## ٢_ ئۆپۆزیسیۆنی دەرەکی و ڕەتکەرەوەی ڕژێمەکە

لە پاڵ ئەو ئۆپۆزیسیۆنە پاشکۆیە و لەبەردەم داخرانی دەرگای چاکسازی دا و لە پاش کەڵەکە بوونی لادانی سیاسی، ئەوا شتێکی پێویست بوو کە ئۆپۆزیسیۆنێکی پێشکەوتووتر لە دایك ببێت، بەشێوەیەك کە پەتی دڵسۆزی و دۆستایەتی بۆ ڕژێمی سعودی بپچڕێنێت و دان نەنێت بە شەرعیەتەکەی و بانگەشە بکات بۆ ڕووخاندنی " بەلەبەرچاو گرتنی ئەو مەرجە شەرعیە ئایینیانە نین کە ڕێگەی پێبدات بە بەردەوام بوون لە حوکم دا ". لەوانەیە دیارترین کەس کە نوێنەرایەتی ئەو جۆرە دەکات بریتیە لە بزوتنەوەی جوهەیمانی کوڕی سەیفی عوتەیبی کە هەڵسا بە داگیر کردنی حەرەمی مەککە ساڵی ١٩٧٩ و دەرکەوتنی مەهدی (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای قەحتانی) لە حەرەمی مەککەی ڕاگەیاند.

ئەو بزوتنەوە ڕەخنەی گرت لە "لادانی ڕژێمی سعودی لە ئیسلام" و بابەتی بەیعەتی خستەڕوو. ڕایگەیاند بەیعەتی ئالی سعود پوچ و باتیڵە لەبەر ئەوەی مەرجی "قوڕەیشی" تێدا نیە کە لە هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتووە. بەڵام ئەم بزوتنەوە لە دژبوونی دا بۆ ڕژێمی سعودی نەگەیشتە ئەو ئاستەی کە تۆمەتباری بکات بە کوفری ڕاشکاو، چونکە سەرکردەی ئەو بزوتنەوەیە (جوهەیمان) جەختی دەکردەوە لەسەر موسڵمانێتی حوکمڕانەکان و دەیووت: " ئالی سعود هیچ بەیعەتێکیان بەدەستەوە نیە و بەیعەتەکەیان نا شەرعیە. پوچی و نادروستی بەیعەتەکەیان پێویست ناکات کە تەکفیریان

بکرێ، بەڵکو ئەوان موسڵمانن بەیعەتەکەیان پوچ و باتیڵە بە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێز "[1].

توندترین ئەوەی جوهەیمان دەیووت لەبارەی دەسەڵاتدارانی ئالی سعود بریتی بوو لە وێچواندنیان بە دووڕووەکان، هەروەك دەڵێت: " ئای ئەو دەسەڵاتدارانە چەند بە دووڕووەکان دەچن بەوەی ئیسلام بە ڕووکەش دەردەخەن و دۆستایەتی و پشتیوانی بێ باوەڕو هاوبەشدانەران دەکەن، کۆمەڵێك دۆستایەتی و ئاشتەوایی کرد لەگەڵ جولەکە و کۆمەڵێکی تر لەگەڵ شیوعیەت و مەسیحیەکان و هاوبەش دانەرانی شیعە و ڕافیضەی پەنادا. جا هەموو ئەو دەوڵەتە ئیسلامیانە بەشیان هەیە لە دەرخستنی ئیسلام و دۆستایەتی کردنی بێ باوەڕان. لەوانەشە ئەو دەوڵەتانە ئاراستەیان جیاواز بێت کەچی هەموویان کۆکن لەسەر دژایەتی کردنی حەق و حەقخوازان ئەگەر جوڵانەوە بە پێچەوانەی سیاسەتی دۆستەکانی ئەوان و ئەوانەی دوژمنی ئیسلامن "[2].

سەرباری ئەوەی جوهەیمان بڕوای وابوو کە دەسەڵاتدارانی ئالی سعود لایانداوە، بەڵام لەسەرەتادا هەر بە پێشەوای ستەمکار و زۆرداری دادەنان و هەڵنەسا بە دەرکردنیان لە بازنەی ئیسلام، لە پەیامەکەشی دا (ئامۆژگاری ئیخوان بۆ موسڵمانان و دەسەڵاتداران) باسی فەرموودەی (گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئەمیرەکە ببە ئەگەر لە پشتی دای وماڵ و سامانیشی بردی...)

---

(١) العتيبي، جهيمان، الحاكمية و تقديم الطاعة و كشف خداع الحاكم للعامة و طلاب العلم ١١. وەرم گرتووە لە: الكواشف الجلية في كفر الدولة السعودية ٢٥٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، وەرم گرتووە لە: الكواشف الجلية ٣٦٠.

کردووەو بەبەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر پێویستی گوێڕایەڵی کردنی ئەوەی بەیعەتیان پێداوە، بەڵام دواتر گومانی لە ڕاستێتی فەرموودەکە بۆ دروست بوو بۆیە لەو هەڵوێستەی پەشیمان بوویەوە لە پەیامی (الإمارة)،لەگەڵ ئەوەشدا زیاد ڕۆنەچوو تا حوکمی کوفر و هەڵگەڕانەوە بدات بەسەر ئالی سعود دا. " جوهەیمان بۆچوونی وانیە کە ئالی سعود کوفری ئاشکرایان کردبێت و دەرخستبێت و پێی وایە حکومەت موسڵمانە و زۆربەی شوێنکەوتووانی لەسەر ئەو بۆچوونەن تا ئەمڕۆ "[1].

بەم پێیە جوهەیمان هەڵوێستێکی توندی نەگرتەبەر لە دژی دامەزراوەی ئایینی و سەرکردەکەی شێخ عەبدولعەزیزی ئیبن باز، بەڵکو تەنها ڕەخنەی ئاراستەی ئەو زانایانە کرد کە خۆیان فرۆشتۆتە ڕژێمی گەندەڵ لە بەرامبەر پارە و پلە و پۆست و وصفی کردن بەوەی فەرمانبەری کارگێڕیین و بەشێکن لە بنچینەکانی دەوڵەت[2].

(١) النجدي، أبو البراء عبدالعزيز: الكواشف الجلية ٢٦٠.

(٢) جوهەیمان لە بارەی شێخ ئیبن بازەوە دەڵێت: " بریتیە لە یەکێك لە بنچینەکانی دەوڵەت .. ئێستا فەرمانبەرێکی کارگێڕییە و هەڵی دەخەڵەتێنن بەوەی پێی دەڵێن:(باوکمان) و (شێخمان) و جگەلەوانە لە شتەکانی دووڕووەکان. ئەوە لە وی و لە زانستەکەی وەردەگرن کە یەکدەگرێ لەگەڵ هەواو هەوەسیان، جا ئەگەر بەهۆی حەقەوە ڕاجیابوو ئەوا دوودڵ نابن لە بەرپەرچ دانەوەی و ئەو خۆیشی باش ئەمە دەزانێت... گەورەترین شت کە وای کرد لە ئەو (واتە شێخ ئیبن باز _ و _) دوور بکەوینەوە بریتیە لە پەیوەستبوونی ئەو بەو دەوڵەتە و تەنانەت کاریگەری شوێنەواری ئەوەمان لەسەری بینی خوا لێی خۆش بێت " . لە پەیامی (الامارة)ی جوهەیمانی عوتەیبی ٢٣، وەرم گرتووە لە: الكواشف الجلية ٢٦٠.

لەبەر ئەوەی عوتەیبی سەلەفی بوو و بڕوای هەبوو بە هەندێ هەواڵ کە دەدوێت لەسەر گومان نەبوون لە دەرکەوتنی (مەهدی چاوەڕوان کراو) پاش داڕووخانی دەسەڵاتی سیاسی و گوێزرانەوەی بۆ پاشایەتی خۆسەپێن، ئەمە ڕەنگی دایەوە لەسەر کارو گۆڕانکارییەکەی، بۆیە لە ناو شوێنکەوتووانی بەدوای ئەوەدا گەڕا کە ڕۆڵی مەهدی بگێڕێت و قەناعەتی بەیەکێك کرد کە ناوی: (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای قەحتانی) بوو، وای پیشاندا کە ناوبراو بەڕاستی (مەهدی چاوەڕوان کراوە) کە دەردەکەوێت _ هەروەك لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە _ بەوەی لە کەعبەدا دەردەوکێت و حوکم دەکات بە دادپەروەری، بۆیە لەگەڵ موحەمەدی بە مەهدی کراو و کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پەنای بردە بەر حەرەمی مەککە لە سەرتای ساڵی ١٤٠٠ك، لەوێدا دەرکەوتنی ئەو مەهدی (قەحتانی) ڕاگەیاند و بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ بەیعەت پێدانی.

بەڵام عوتەیبی و قەحتانی ڕێك نەکەوتن، کە تەصەوری سیاسی خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات لە داهاتوودا ڕوون بکەنەوە، جگەلەوەی کە هیچ شتێ لە کەلەپوری بزوتنەوەکەدا نیە کە ئاماژە بدات بەوەی بڕوایان هەبووبێت بە ڕاوێژ یان هەڵبژاردن یاخود بەژداربوونی جەماوەری لە دەسەڵاتدا. دەکرێ بەرزترین شت کە خەیاڵ و خەونی پێوە ببینن بریتی بووبێت لە گۆڕینی حوکمڕانانی ئالی سعود بە حوکمڕانی پارێزگارتر و بەتەواو پابەندتر بە دینەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ تەصەورێکی سیاسی پێی نییە کە بە شێوازێکی بنچینەیی و ڕیشەیی جیاواز بێت لەگەڵ ڕژێمی سعودی وەهابی کە ئەوا حوکمی دەکرد.

سەرباری ئەوەی کە ئەو بزوتنەوەیە حەرەمی پیرۆزی مەککەی داگیر کرد بەڵام لە سەرەتادا توندوتیژی بەکارنەهێنا و کەسی نەکوشت، بەڵام تەنها داگیر کردنی حەرەمی مەککە بەس بوو بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سعودی هێرشی بکاتە سەر. لەبەر ئەوەی بزوتنەوەکە گەڵاڵە بوو لە قوڵایی بزوتنەوەی وەهابی لە ناوچەی نەجد دا ئەوا بەوهۆیە حکومەتی سعودی تووشی سەختی و کۆسپێکی زۆر بوو لە ڕازی کردنی سەربازەکانی کە زۆربەیان ئەو شوێنەیان خۆشدەویست تا هێرش بکەنە سەر حەرەم و داگیر کەرانی لێ دەربکەن. بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشتی پیاوانی ئایینی کرد بۆ دەرکردنی حوکمێکی توند لە دژیان و پشتیوانی کردنی حکومەت، بەم بۆنەیەوە ئەنجومەنی باڵای فەتوا بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولعەزیز ئیبن باز کۆبووەوەو فەتوای دەرکرد کە تیایدا پشتگیری ئالی سعود دەکات و ئیدانە و مەحکومی داگیر کردنی حەرەم دەکات، پرۆسەی یاخی بوون و دەرچوونیش مەحکوم دەکات بەوەی دەرچووە دژی دەوڵەتی شەرعی ئیسلامی و پەرت کردنی یەکریزی موسڵمانە. وە سی زانای گەورە لە سعودییەدا واژوویان کرد لەسەر ئەم فەتوایە[1].

لە فەتواکەی شێخ ئیبن بازدا هاتووە: " چۆن بۆ ئەو دروستە (واتە: بۆ جوهەیمانی عوتەیبی) یاخی ببێت لە دەوڵەتی جێگیر کە یەکدەنگ و ڕازین بە کەسێك و بەیعەتی شەرعیان پێداوە، جا بە یاخی بوونەکەی دەیەوێت ڕیز و کۆمەڵی موسڵمانان پەرتەوازە بکات؟ و پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام) فەرموویەتی:(من أتاکم و أمرکم جمیع یرید أن یشق عصاکم أو یفرق جماعتکم فاضربوا عنقه کائنا من کانة) موسلیم تەخریجی کردووە. واتە: هەر

(١) الیاسینی، ایمن: الاسلام و العرش ٢٠١.

کاتێ ئێوە کۆك بوون لەسەر کەسێ و یەکێك هات ویستی ڕیزو کۆمەڵی ئێوە پەرتەوازە بکات ئەوا لە گەردنی بدەن هەر کێ بێت. کاتێ پێغەمبەر ~ بەیعەتی لەگەڵ هاوەڵانی گرێدا لەسەر ئەوە بوو کە: (ململانێ لەگەڵ کاربەدەستان مەکەن مەگەر کوفرێکی ئاشکرایان لێ ببینن و بەڵگەتان پێبێ لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە) و ئەم دەوڵەتە سوپاس بۆ خوا هیچ شتێکی وای نەکردووە کە لێ یاخی بوون پێویست بکات. لەو کاتەدا بەڵگەی هێنایەوە بە فەرموودەی:(هەر کەسێ ئەمیرەکەی بینی کە تاوان دەکات ئەوا با پێی ناخۆش بێت کە تاوان دەکات و سەرپێچی خوا دەکات، بەڵام با بەهیچ شێوەیەك لە گوێڕیەڵی دا دەرنەچێت، چونکە ئەوەی لە گوێڕایەڵ دەربچێت و لە جەماعەت خیاببێتەوە ئەوا بە نەفامی دەمرێت) و بۆیە ئەو دەستەیە (واتە: جوهەیمان هاوەڵانی[1]) دەچنە ژێر واتای ئەم فەرمایشتەی خوای بالادەست و خاوەن شکۆ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا أُولَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ البقرة: ١١٤. واتە: (جا کێ لەوە تاوانبارترو ستەمکارترە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوەی ناوی پیرۆزی ئەوی تیادا ببرێت و باسی ئایینی ئەوی تیادا بکرێت و هەوڵبدات بۆ وێران کردنیان، ئەوانە بۆیان نییە بچنە مزگەتەکانەوە مەگەر ترسی خوایان لە دڵ دابێت، ئەوا تەنها سوکی و ڕیسوایی بەشیانە لە دنیادا و لە قیامەتیشدا سزای گەورەیان بۆ هەیە). شێخ

(١) گۆڤاری (البحوث الاسلامية)، سعودییە (ژمارەی یەکەم لە بەرگی دووەم) بەناونیشانی (ڕووداوی (ڕووداوی مزگەوتی حەڕام و پرسی مەهدی چاوەڕوانکراو). و: الكواشف الجلية في كفر الدولة السعودية ٢٥٥ _ ٢٥٦.

بەلگەی بە فەرموودەیەکی تریش هێناوەتەوە:(هەر کەسێ چەك دژی ئێمە هەڵبگرێت لە ئێمە نییە) ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە (ئیخوان) بە تاوانبار دابنێن لەبەر ئەوەی گوللەبارانی پیاوانی ئاسائیشیان کردبوو ئەوانەی دەیانەویست موسڵمانان بپارێزن لە خراپەی ئەوان "[1].

فەتواکەی شێخ ئیبن باز و گەورە زانایان ڕێگەی دا بە دەسەڵاتەکانی سعودی کە هێرش بکەنە سەر حەرەم و دەسگیر کردن و کوشتنی ئەوانەی داگیریان کردبوو و ئەوانەش پەنایان بردبووە بەر ئەوێ و زاڵ بوون بەسەر جوهەیمان و هاوەڵەکەی:(مەهدی قەحتانی) لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانرا ڕیشەکێشی شوێنکەوتووەکانی بزوتنەوەکە بکەن کە لە ناو بزوتنەوەی وەهابیەتدا بڵاوببونەوە، کە ئەمڕۆ دەناسرێن بە:(حیزبی قورئان) و ئەوانەی دان نانێن بە شەرعیەتی دەوڵەتی سعودیە. بەڵکو لەوانەیە هەندێك لەوان دوای زاڵ بوون بەسەر بزوتنەوەکەدا تەکفیری دەوڵەتی سعودییەی کردبێ، هەروەك لە خودی عوتەیبی گێڕدراوەتەوە کە ڕژێمی سعودی بە خراپ و ستەمکار و زۆردار داناوە بەڵام دوای هێرش کردن بۆ سەر حەرەمی مەککە قەناعەتی بۆ دروست بووە کە: "بێ باوەڕە".

---

(١) وەرگێڕ.

### سەروریيە

کۆمەڵ و دەستەیەك هەن کە بەناوی (سەروریە) ناودەبرێن، بە دانە پاڵ (موحەمەدی کوڕی سەروری زەینولعابیدین)[1] ئەو کۆمەڵەیە بەو شێوەیەن کە شێخ ئەحمەدی کوڕی یەحیای نەجمی وەسفی کردوون لە کتێبەکەیدا:(الفتاوی الجلیة عن المناهج الدعویة): " گەل یان حیزبێکن هەندێ شتی سوننەت و هەندێ لە بیدعەتیشیان هەیە، توانج دەگرن لە حوکمڕانان و قسە دەکەن لە شتانێك کە دەبێتە هۆی دروست بوونی فیتنەو ئاژاوەو مەترسی، ئەوەی دیاریشە ئەوەیە کە تەکفیری حوکمڕانان دەکەن بە زمانی حاڵ نەوەك بە زمانی گوفتار... توانج و تۆمەتباری زانایانی ئەو وڵاتەیان کردووە بە خیانەت کردن لە دین و گومانیان وایە کە زانایان لەو وڵاتە لە واقیع تێناگەن. ئەمەش ئاماژەیە لەسەر ئەوەی کە ئێستا دەخرێتە ڕوو. بانگەشە دەکەن بۆ بەرپاکردنی جیهاد و مەبەستیان جیهاد کردن نییە لەگەڵ بێ باوەڕان بەڵکو ئەوەی دیارە مەبەستیان جیهاد کردنە لە دژی دەوڵەت ".

لەو بزوتنەوەیە گێڕدراوەتەوە کە داوای ویلایەتی شەرعزانان دەکات بۆ دەوڵەت بە پشت بەستن بەو ڕۆڵەی کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بینی لەگەڵ ئەمیر موحەمەدی کوڕی سعود و کوڕەکەی عەبدولعەزیز،

(١) شێخێکی سوریە لە دژەکانی ڕژێمی سعودیە بوو وانەی دەووتەوە لە زانکۆی ئیمام موحەممەدی کوڕی سعود لە سعودیە و لە لەندەن جێگیر بوو دوای جەنگی کەنداوی دووەم.

بەشێوەیەك كە شێخ موحەمەد هەڵدەستا بە ڕۆڵی ڕابەر و چاودێر و ئاراستە كردن[1].

---

(١) شێخ موحەمەدی سەروری زەینولعابدین بڕوای وایە، ئەمیر موحەمەدی كوڕی سعود بەیعەتی دا بە شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب ئەوەك بە پێچەوانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: كە شێخ بووەتە ئیمامی ئەو وڵاتە و خاوەنی بڕیاری یەكەم و یەكلاكەرەوەیە تیایدا. ئەمەش بە پێی گێڕانەوەی مێژووناسە وەهابیەكان ئیبن غەننام و ئیبن بیشر، هەروەك لەو گێڕانەوەیەدا هاتووە: موحەمەدی كوڕی سعود دەستی هێنا و بەیعەتی دا بە شێخ لەسەر دینی خواو پێغەمبەر و جیهاد كردن لە پێناوی خوا و جێبەجێ كردنی یاساكانی ئیسلام و فەرمان بە چاكە و ڕێگری كردن لە خراپە، جا شێخ لەگەڵ ئیبن سعوددا چووە ناو شارەكە و لەلای جێگیر بوو. شێخ لەگەڵ ئیبن سعود دا هێزیان بەڕێ دەكرد و پێشوازییان لە دەستە و وەفدەكان دەكرد و سەرپەرشتی (خومس) و هەموو ئەو شتانەی كە دەهێنرانە درعیە بە ووردو درشتەوە ئەوا دەیخستە بەردەستی شێخ و ئەویش بەكەیفی خۆی دابەشی دەكرد و عەبدولعەزیز و جگەلەویش هیچ شتێكیان لێ نەدەبرد بەبێ فەرمانی شێخ، تەنانەت هەڵوەشاندنەوەو گرێدان و بردن و بەخشین و پێشخستن و دواخستن هەمووی بەدەستی شێخ بوو. هیچ هێزێ بەڕێ نەدەكرا و هیچ فەرمانی لە موحەمەدی كوڕەكەی دەرنەدەچوو بەبێ ویست و ڕەزامەندی شێخ. دوای ڕزگار كردنی (ڕیاز) ئەوا كاروباری موسڵمانان و خانەی سامانی سپارد بە عەبدولعەزیزی كوڕی موحەمەدی كوڕی سعود و خۆی دوور كەوتەوە لە كاروباری دونیا و خۆی یەكلا كردەوە بۆ پەرستش و بڵاوكردنەوەی زانست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولعەزیز هیچ كارێكی بەبێ بۆچوونی شێخ یەكلای نەدەكردەوەو جێبەجێ نەدەكرد بەبێ ڕەزامەندی ئەو، ئەمەش ئاماژەو بەڵگەیە كە شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب سەری ڕژێمەكە بوو كە بەهۆی بەیعەتەكەی دامەزرا. وە لێرەدا كەسانێ هەن دەڵێت: شێخ موحەمەدی كوڕی عەبدولوەهاب هەڵەی كردووە كاتێ ڕازی بووە بەوەی حوكمرانی بە پشتاوپشتی و میراتگری بێت لە خانەوادەی سعود دا كە دواتر ئەو بانگەوازەیان قۆستەوەو بەتاڵیان كرد لە ناوەرۆكە چاكسازییەكەی. بەم پێیە داوا دەكات كە كاروبار لە دەوڵەتی وەهابیدا بگەڕێتەوە بەردەستی زانایان و پیاوانی ئایینی وەك سەردەمی یەكەمی وەهابیەت.

### ٣_ ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕی چەكدار (ڕێكخراوی قاعیدە)

دواتر ئەو ئۆپۆزیسیۆنە شۆڕشگێڕە گەڵاڵەبوو لە ناو ڕیزەكانی ئۆپۆزیسۆنی پاشكۆدا، ئەمەش دوای مایە پوچ بوونی گفتوگو لەگەڵ ڕژێمدا و دەستەوەسانی لە بەجێهێنانی ئامانجەكانی بە ڕێگەیەكی ئاشتیانە، جا بۆیە گەشەی سەند بەرەو تەكفیر و یاخی بوونی چەكدارانە و بەشێوەیەكی فەڕمی بڵاوبوویەوە لەناو ڕیزەكانی جەماوەری وەهابی و بەتایبەتی "ئەفغانیە سعودییەكان" ئەوانەی بەژداربوون لە ڕزگار كردنی ئەفغانستان لە دەستی یەكێتی سۆڤیەت و ژمارەیان دەگاتە نزیكەی پازدە هەزار كەس، كاتێ گەڕانەوە وڵاتەكەیان ئەمەریكای داگیر كەریان بینی كە بنكە سەربازییەكانی مۆڵ و بڵاوكردۆتەوە لە حەرەمەین لەوەتەی جەنگی كەنداوی دووەمەوە ساڵی ١٩٩١.

لەوانەیە پەیامە كراوەكەی (ئوسامە بن لادن) كە ئاراستەی موسڵمانان و دانیشتووانی دوورگەی عەرەب بەتایبەتی كردبوو لە ساڵی ١٩٩٧ ئەوا ئەو داڕوخانە دەروونیە شیدەكاتەوە كە ئەو كۆمەڵەیە لە ئۆپۆزیسیۆنی وەهابیەت هەستی پێكردووە، ئەمەش دوای بە بنبەست گەیشتنی چاكسازی بە ڕێگەی ئاشتیانە، هەر ئەمەش بووە خاڵی دەسپێك بۆ بزوتنەوەكە، هەروەك لەبارەیەوە دەووترێت:

_ " هەموو دەستەیەك تێكۆشانی خۆی كرد بۆ ئەوەی بەخێرایی هەست بە هەڵوێستەكە بكرێت و مەترسیەكە لابچێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەڵسان بە ئامۆژگاری كردن بە نهێنی و ئاشكرا و بە پەخشان و شیعر و كۆمەڵ كۆمەڵ و

تاك تاك و سکاڵانامه دوای سکاڵانامه و یاداشتنامه دوای یاداشتنامه و هیچ ڕێگەیەکیان نەهێشت و هەموویان گرتنەبەر و هیچ کەسێکی کاریگەر نەما کە لەگەڵیان نەخەن بۆ ئەوەی بیانجوڵێنی لە کارە چاکسازییەکانیاندا، تەنانەت لە نووسینەکانیاندا شێوازێکیان گرتبووە بەر کە نەرم و نیان و دانایانە و وتەی چاك بوو بە مەبەستی ئەوەی چاك ببن و تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە لەو خراپە گەورە و گەندەڵی و تاونە بەرجەستانە کە لە میانەیاندا سنوری حوکم و دەقە یەکلابووەوەو قەتعی و چەسپاوەکانی ئایین بەزێنرا و مافە ڕەواکانی هاوڵاتیان بە فیڕۆدرا. بەڵام _ زۆر بەداخەوە _ ڕژێمەکە دەرگای دادەخست و پشتی لەو چاکسازیی و داواو ئامۆژگارییانەی دەکرد، بەڵکو گاڵتە و گەمەی پێ دەکرد، بەوەش نەوەستان کە بە گەوجیان بزانن و بەس، بەڵکو لاسارییەکانی ڕابردوویان بەهێزتر کرد بە تاوان و شتی ناپەسەندی زیاتر... بۆیە بێ دەنگ بوون و ڕق لێ بوونەوە چیتر قبوڵ و گونجاو نییە... لەبەر ئەوەی سنور شکاندنەکە گەیشت بەوەی پێگەیشت و دەرچوو لە چوارچێوەی گوناهە گەورە و لەناوبەرەکان تا گەیشتە ئەنجامدانی هەڵوەشێنەرەوە دیارەکانی ئیسلام، کۆمەڵێ لە زانا و بانگخوازان ئەوانەی دەروونیان وێکهاتەوەو تەسك بووەوە بەهۆی ئەو گومڕاییەی کە گوێچکەکانی ئەوانی کەڕ کرد و ئەم ستەمەی چاوەکانی ئەوانی پۆشی و بۆنی گەندەڵی و تاوان تووشی هەڵامەتی کردن... بۆیە لەسەر خۆیان پێویست کرد کە ئەو خراپە و گەندەڵی و بارودۆخە نالەبارە ڕەت بکەنەوەو دەنگی چاکسازی بەرزبووەوە بۆ پشتگیری هەڵوێستەکە و چارەکرنی بارودۆخەکە، بۆ ئەم مەبەستەش سەدان ڕۆشەنبیرو خانەدان و بازرگان و بەرپرسە پێشووەکان چوونە پاڵیان و سکاڵانامە و یاداشتنامەیان

بەرز کردەوە بۆ پاشا کە داوای چاکسازی دەکرا، بەڵام ئەو ئامۆژگارییەکەی پشت گوێ خست و گاڵتەی بە ئامۆژگاریی کارەکانی کرد و بارودۆخەکە هەر خراپتر دەبوو.

دووبارە ئەو ئامۆژگاری کارانە سەرلەنوێ یاداشتنامە و سکاڵانامەی تریان پێشکەش کرد، گرنگترینیان یاداشتنامەی ئامۆژگاری بوو کە درایە دەستی پاشا لە موحەڕەمی ١٤١٣ك، لەو یاداشتنامەدا نەخۆشی و چارەسەر دەستنیشان کرابوون بە ڕەسەنایەتیەکی شەرعی کۆن و خستنەڕوویەکی زانستیانەی ڕێك و جوان، تەنانەت بۆشاییە گەورەکانی دیاری کردووە لە فەلسەفەی ڕژێم و خاڵە لاواز و کەمو کورتەکانی لە بنچینەی ڕاگری حوکمدا، ئەوەشی ڕوون کردەوە کە پێشەواو پێشەنگەکانی کۆمەڵگا بەهۆی بانگەوازەکەیان بۆ چاکسازی کردن _ وەك زانا و بانگخواز و ڕدێن سپی هۆزەکان و بازرگان و خانەدانەکان و مامۆستای زانکۆکان _ دەناڵێنن بەهۆی بەڕاوێز خستن و لە کارخستن تەنانەت بە هۆی ڕاوەدوونان و تەنگ پێ هەڵچنین.

بارودۆخی دامەزراوەو یاساکانی لە وڵاتدا ڕوونکردۆتەوە، کە چەندین لادان لەخۆی دەگرێت بە هۆی حەڵاڵ و حەرام کردن بەبێ لەبەرچاو گرتنی شەریعەتی خوا... یاداشتنامەکە باسی پەکخستنی زۆرێ لە یاسا شەرعیەکان و گۆڕینیان بە یاسا دەست کردەکانی کرووە... لەسەر ئاستی سیاسەتە دەرەکیەکانی دەوڵەت ئەوا یاداشتنامەکە تایبەتمەندی ئەو سیاسەتەی خستەڕوو کە بریتیەلە فەراموش کردن و گرنگی نەدان بە کێشەی موسڵمانان، بەڵکو لە جیاتی ئەمە پشتیوانی کردنی دوژمنان و نمونەی (غەزە _ ئەریحا) و شیوعیەکان لە باشوری یەمەن لە ئێمە دوور نین و جگەلەو نمونانەش زۆرن.

له هیچ کەسێ شاراوە نییە کە داوەری کردن بە یاسا دەست کردەکان و پشتیوانی کردنی بێ باوەڕان دژی موسڵمانان ئەوا ئەژمار کراوە لە دە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام.

لەگەڵ ئەوەی یاداشتنامەکە ئەوەی خستەڕوو بە دەربڕینێکی نەرم و ئامـاژەیەکی جوان و یاد خستنەوەی خوا و ئامۆژگاری بەچاکە بە شێوازێکی دڵ گر و ناوەرۆکێکی ڕاست و سەرباری گرنگی ئامۆژگاری لە ئیسلامدا و پێویست بوونی بۆ دەسەڵاتدار، تەنانەت سەرباری ژمارە و پلەوپایەی ئەوانەی واژوویان کردبوو لەسەر یاداشتنامەکە و ئەوانەی هاوسۆزی بوون، ئەوا هەموو ئەمانە تکای بۆ نەکرد، بەڵکو بە توندی ناوەرۆکەکەی ڕەتکرایەوە و ئەوانەی واژوویان لەسەر کردبوو و ئەوانەش کە هاو سۆزی بوون بە گەوجی وەسف کران و سزادران و خرانە بەندینخانەوە ".

بەوشێوەیە ئوسامە بن لادن دەچێتە قۆناغێکی نوێیەوە کە بریتیە لە لێ سەندنەوەی شەرعیەتی دینی لە ڕژێمی سعودیە و نزیك بوونەوە لەوەی حوکمی تەکفیری بەسەردا بدات، ئەمەش وەك هەنگاوێك لە پێناو ڕەوایی دان بە یاخی بوون لێی و خۆ ڕزگار کردن لە بەیعەت و دڵسۆزی و دۆستایەتی بۆی، هەروەك دەڵێت:

" بەڕاستی ڕژێم شەرعیەتەکەی بە دەستی خۆی پارچە پارچە کرد بە هۆی ئەنجامدانی چەند کارێکەوە، گرنگترینیان:

١_ پەکخستن و لەکارخستنی یاسا و حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی و گۆڕینی بە یاسا دەست کردەکان... تا گەیشتە ستەم و زۆرداری گەورە کە هاوبەش دانانە بۆ خوا و بەزداربوونە لەگەڵ خوا لە یاسادانان بۆ خەڵکی و

حەڵاڵ كردنی ئەوەی كە خوای گەورە حەڕامی كردووە وەك ڕیبا و هاوێنەكانی لە ناو شاری حەڕام و لەلای مزگەوتی حەڕام.

٢_ دەستەوەسانی و بێ توانایی لە ئاست پاراستنی وڵات و ڕێپێدانی چەند ساڵێكی دوورو درێژ بۆ مانەوەی دوژمانی ئوممەت و هێزە خاچ پەرستە ئەمریكیەكان ".

دەڵێت: " لە كاتێكدا كە هێشتا ئوممەت نەیتوانیوە ڕووگەی یەكەمی و شوێنگەی شەوڕۆیی پێغەمبەر ~... كەچی ڕژێمی سعودی ئوممەتی خەمبار و دەروون داخ كرد لە ئاست ئەو شوێنگە پیرۆزانەی كە بەدەستیەوە مابوون: مەككەی پرۆز و مزگەوتی پێغەمبەر، بەڵام ڕژێمی ناوبراو ئافرەتە سەربازە نەصرانیەكانی هێنا بۆ ئەوەی بەرگری لێبكەن و بیپارێزن، تەنانەت دوو حەرەمەكەی بەرەواو حەڵاڵ دانا بۆ خاچ پەرستەكان و بە پانی و درێژی دەرگای بە ڕوویاندا كردەوە، جا بەو هۆیە دوو حەرەمەكە پڕ بوو لە بنكەی سەربازی ئەمەریكا و هاوپەیمانانی. ئینجا ڕژێمەكە بە هۆی ئەوەی دوورگەی عەرەبی بە ڕەوا دانا بۆ خاچ پەرستەكان ئەوا وەسیەتی پێغەمبەری شكاندووە كە ئاراستەی ئوممەتەكەی كرد كاتێ لەسەرە مەرگدابوو و وتی:(هاوبەش دانەران وەدەر بنێن لە دوورگەی عەرەبی)؛ جا لەبەر ئەوەی ڕژێمی سعودی بەبێ یارمەتی ئەوان ناتوانێت دامەزراو بێت، بەمەش خیانەتی لە ئوممەت كرد و دۆستایەتی و پشتگیری بێ باوەڕانی كرد و بەرزی كردنەوە بەسەر موسڵماناندا، شتێكی شاراوەش نییە كە ئەمە ئەژمار دەكرێت لە دە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام.

"بێگومان موسڵمانان تووشی چەرمەسەری و فیتنەی هەرە گەورە بوون لەومتەی پێغەمبەر ~ کۆچی دوایی کردووە ئەویش بریتیە لە داگیر کردنی وڵاتی دوو حەرەمە پیرۆزمکە، ناوەڕاستی وڵاتی ئیسلام و شوێنگەی دابەزینی سروش و سەرچاوەی پەیام و لە ناو ئەوانەشدا کەعبەی پیرۆز ڕووگەی گشت موسڵمانان، ئەمەش لەلایەن هێزە مەسیحیە ئەمریکی و هاوپەیمانەکانی".

ئوسامە بن لادن بانگەشەی حکومەتی سعودیان ڕەت کردەوە بەوەی کە هێزەکانی ئەمەریکا بۆ پارێزگاری لە زەوی دوو حەرەمەکەیە و بۆ ماوەیەکی کاتییە بۆ بەرگری لێ کردنی. بەڵگە و گەواهیشی هێنایەوە بە وتەی وەزیری بەرگری ئەمەریکی ویلیام بیری کە ئاراستەی سەربازە ئەمەریکیەکانی کرد پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، بەوەی بوونیان لە وڵاتی حەرەمەین بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئەمەریکایە. بین لادن جەختی کردەوە: کە بوونی ئەمەریکیەکان لە دوورگەی عەرەبیدا بریتیە لە داگیر کردنێکی سەربازی کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشراوە، ئەو بانگەشە و پڕوپاگەندانە بریتین لە چەند فێڵ و تەڵەکەیەکی تر کە ڕژێم دەیەوێت موسڵمانانی پێ چاوبەست بکات و ئەو شوێنە پیرۆزانەشی کە ماون با لە دەستی بڕوات، جا درۆی بۆ ئەو زانایانە کرد کە فەتوایان دا بە هێنانی ئەمەریکیەکان، تەنانەت لە کۆنگرەی یەکگرتوو (الرابطة) لە مەککەی پیرۆز درۆی کرد لەبەردەم کۆمەڵێکی زۆر لە زانا و سەرکردەکانی ئیسلامی کاتێ جیهانی ئیسلامی سەرسامی خۆیان دەربڕی و بەنا دروستیان زانی کە هێزە خاچ پەرستەکان هێنراونە ناو وڵاتی حەرەمەین بە پاساوی بەرگری لێ کردنی، لەو کاتەدا پێی وتن: (ئەمە شتێکی سادەیە، هێزەکانی ئەمەریکی و هاوپەیمانان پاش چەند مانگێك دەردەچن لە خاکی

وڵاتدا نامێنن). دەی ئەوە ئێمە دەچینە ناو ساڵی حەوتەمەوە دوای هاتنیان، کەچی ڕژێم دەستەوەسانە لە دەرکردنیان بەڵام نایەوێت بۆ گەلەکەی دان بەوەدا بنێت، بۆیە بەردەوامە لەسەر درۆ کردن بۆ خەڵکی و بانگەشە دەکات کە ئەمەریکیەکان دەردەچن.

دوای ئەوەی بن لادن ئەو دوو مەسەلەی خستەڕوو کە دەیان ژمێرێت لە دە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، ئەوا ئاماژەی کرد بەوەی کە بانگخواز و چاکخوازان سورن لەسەر گرتنەبەری ڕێگەی چاکسازی ئاشتییانە لە پێناو پاراستنی یەکێتی وڵات و پاراستنی خوێنی بەندەکان. پرسیاری کرد: " بۆچی ڕژێم هەموو ڕێگەکانی چاکسازی ئاشتییانە دادەخات و خەڵکی ناچار دەکات و پاڵ دەدات بۆ کاری چەکداری؟! کە ئەوەش تاکە دەروازەیە کە لەبەردەم خەڵکی ماوە بۆ ئەوەی ستەم نەهێڵرێت و مافەکان بدرێنەوەو دادپەروەری بەرپا ببێت"[(1)].

سەرباری ئەوەی بن لادن فەتوای دەدا بەوەی حوکمڕانانی سعودی تەکفیر دەکرد بەهۆی ئەنجامدانی هەندێ لە دە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان و کردنەوەی دەرگای کۆچ کردن و جیهاد دژیان، بەڵام بڕیارێکی گرنگی دا لەوەی

---

(١)دواتر چووە سەرباسی بزوتنەوە چاکسازییەکەی و بوونی خۆی لە ئەفغانستان لە پێناو لابردنی ئەو ستەمەی تووشی ئوممەت بووە بەهۆی هاوپەیمانی مەسیحی و جولەکەوە، کە ڕەوایی دا بێتە ناو وڵاتی حەرەمەین. هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕێگەی چاکسازی ئەوەی بەگشتی تووشی جیهانی ئیسلامی بووە، بەتایبەتی وڵاتی حەرەمەین، وتنەوەی ئەو ڕێگایانە بە وانە کە لە میانەیدا دەتوانرێ کاروبارەکان وەك خۆی لێبێنەوە و مافەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەمەش بەسەر موسڵماناندا هات... وای لێهاتووە کە بارودۆخەکە لە وڵاتی حەرەمەین وەك گرکانێکی گەورەی لێهاتووەو زۆر نەماوە بتەقێتەوەو زاڵ ببێت بەسەر کوفر و گەندەڵی و خراپەدا.

خۆی دوور بگرێت لە کوشتاری ناوەخۆیی و ڕووی چەك ڕاستەوخۆ ئاراستەی ڕژێمی سعودی نەکات"، چونکە چەندین دەرئەنجامی ناخۆشی سەختی لێ دەکەوێتەوە، گرنگترینیان:

١_ بەفیڕۆچوونی هێزی مرۆیی، چونکە زۆربەی کوژراو و قوربانی ئەوا لە نەوەکانی گەلە موسڵمانەکە دەبن.

٢_ بەفیڕۆچوونی هێزو توانای سەروەت و سامان و ئابوری.

٣_ داڕوخانی ژێخانی دەوڵەت.

٤_ هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا.

٥_ تێکدان و ڕووخاندنی پیشەسازییەکانی نەوتی خاو، چونکە بوونی هێزە ئاسمانی و وشکانی و ئاوییەکانی خاچ پەرستەکان و ئەمریکی لە دەوڵەتەکانی کەنداوی ئیسلامی مەترسیەکی زۆر گەورەیە و زیانێکی مەزنە کە هەڕەشە لە مەزنترین هەڵگیراوی نەوت دەکات لە جیهاندا، بڵاو بوونەوەی کوشتار لەو شوێنانە ئەو نەوتە دووچاری مەترسی سوتان دەبێتەوە کە ئەمەش زیان دەگەیەنێت بە ئابوری دەوڵەتەکانی کەنداو و وڵاتی حەڕەمەین و تەنانەت زیانێکی بەرجەستەیە بۆ ئابوری جیهانی.

٦_ دابەش کردنی وڵاتی حەڕەمەین و دەست بەسەرداگرتنی ئیسرائیل بەسەر بەشی باکوری، چونکە دابەش کردنی وڵاتی حەڕەمەین داواکاریەکی جەخت لەسەر کراوی هاوپەیمانی جولەکە و خاچ پەرستەکانە، چونکە بوونی دەوڵەتێك بەو قەبارەیە و هێزانە لە ژێر حوکمێکی ئیسلامی دروست بە ویستی خوا مەترسییەکی گەورەیە لەسەر قەوارەی جولەکە لە فەڵەستین،

لەبەرنەوەی وڵاتی حەڕەمەین نمونەی یەکێتی جیهانی ئیسلامییە بەهۆی بوونی کەعبەی پیرۆز لە وێدا کە ڕووگەی گشت موسڵمانانە.

٧_ هەر کوشتار و جەنگێکی ناوەخۆیی بەهەر پاساوێك بێت لەگەڵ بوونی هێزی داگیرکەر ئەوا هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەو هێزانە کاردەکەن لەسەر لەناوبردنی بزوتنەوەکە بۆ بەرژەوەندی کوفر و بێ باوەڕی جیهانی ".

بە دەستپێکردن لەو حەوت خاڵانەوە ئەوا بن لادن دەرگای جەنگی ڕاستەوخۆیی نەکردەوە لەگەڵ ڕژێمی سعودی کە بە ناشەرعی دەزانی بەڵام بە ڕاشکاوانە حوکمی بێ باوەڕو هەڵگەڕاوەی بەسەردا نەدەدا، بەڵکو سنوری شکاند و کاری کرد وەك ئەوەی ڕژێم بوونی نەبێت، جا جیهادی لە پێناوی خوا ڕاگەیاند و دەستی کرد بە جەنگ لە ڕێی دەستەی بچوك، بۆ وەدەرنانی دوژمنی داگیرکەر لە وڵاتی حەڕەمەین و ڕزگار کردنی پیرۆزییە دەست بەسەردا گیراوەکان "، ئەم کارەی کرد بەهۆی هێزی سوك و جوڵە خێرا کە کاردەکات زۆر بەنهێنی، بەشێوە دەربڕینێکی تر بەرپاکردنی جەنگ لەڕێی دەستەی بچوك کە ئەوەکانی گەل تیایدا بەژدار دەبوون کە لە هێزی چەکدار نەبوون ". ڕووی وتاری کردە هێزە چەکدارەکانی سعودیی بۆ یارمەتی دانی، نەوەك چوونە پاڵی بەگشتی لە ئێستادا چونکە " یەکسانی هێز نیە لە نێوان هێزەکانی ڕژێم و هێزەکانی دوژمندا. دەشزانن کە حیکمەت و دانایی وا دەخوازێت کە لەو قۆناغەدا هێزی سەربازی چەکدار دووربێت لەوەی بچێتە ناو جەنگی نەریتی و هاکەزایی لەگەڵ هێزە خاچ پەرستەکانی دوژمن، تەنها ئەوە نەبێت کە هەندێ پرۆسەی چاونەترس و بوێر نەبێ لە تاکەکانی هێزە چەکدارەکان وەك تاکە کەس پێی هەڵدەستن، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی

جوڵاندنی هێزی فەرمی. بۆ ئەوەی هێزی دوژمن زۆر بەخراپی ببەزن و بنچینەکانی لەناوببرێن و ناچار بکرێن بۆ دەرچوون لە وڵات بە شکاوی و سەرشۆڕی لەگەڵ خۆپاراستن لە ڕژانی خوێنی موسڵمان لەو نێوەندەدا.

ئەوەی براو کورە تێکۆشەرەکانتان داواتان لێدەکەن لەو قۆناغەدا بریتیە لە یارمەتی دانیان بە زانیاری و چەك و تەقەمەنی پێویست و داواشیان بەتایبەتی لە پیاوانی ئاسایش ئەوەیە کە پەردەپۆشیان بکەن و دوژمنانیش سەرشۆڕ بکەن و ترس و لەرز بخەنە ناو ڕیزەکانیان، تەنانەت داوایان وایە کە هەموو ئەو شتانە پێشکەش بکەن کە یارمەتی دەری تێکۆشەرانن بەسەر دوژمنی داگیرکەردا ". بەهەمان شێوە ئوسامە بن لادن وتی: " لەوکاتەی دەزانین کە ڕژێمەکە هەموو ئەو بەرپرسیارێتیە لە ئەستۆ دەگرێت کە تووشی وڵات و بەندەکان بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بزانین کە سەرچاوەی دەرد و نەخۆشیەکە و سەری ئاژاوەکە بریتیەلە دوژمنی ئەمەریکی داگیرکەر، جا بۆیە پێویستە تێکۆشانەکان کۆگیر بکرێن لەسەر کوشتن و جەنگ و ڕووخاندن و لەناوبردن و بۆسە دانانەوە بۆ ئەمەریکا تا بەویستی خوای پایەبەرز تێکدەشکێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەمووان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی "کە دار خوار بوو ئەوا سێبەرەکەی ڕاست و ڕێك ڕاناوەستێت" بۆیە شتێکی پێویستە جەخت بکرێتەوە لەسەر لێدانی دوژمنی سەرەکی، کە بووە هۆی ئەوەی ئوممەت پارچە پارچە ببێت بۆ چەندین هەرێم و دەوڵەتی بچوك و تووشی ئەو سەرگەردانییە ببێت، جا هەر کاتێ بزوتنەوەیەکی چاکسازی خواز سەری هەڵدا لە وڵاتێکی ئیسلامی ئەوا ئەو هاوپەیمانە جولەکە و خاچ پەرستانە هانی حوکمڕانە بریکارەکانیان دەدەن لە ناوچەکە بۆ لەناوبردن و

لەباربردنی بزوتنەوە چاکسازییەکە بە گشت ڕێگایەك. ئەو کارەی ڕاست بێت لەو حاڵەتەدا کە تیایدا دەگوزمرێنین بریتیە لە هەوڵدان بۆ یەکخستنی موسڵمانان بۆ تێکۆشان و وەدەرنانی کوفری گەورە کە دەستی گرتووە بەسەر وڵاتانی ئیسلامی، تەنانەت شتێکی شاراوە نیە کە دوای ئیمان و باوەڕ گەورەترین واجب بریتیە لە وەدەرنانی دوژمنی ئەمریکی کە هیچ شتێك پێش ئەو واجبە ناکەوێت.

ئەوەی پێویستە لەو حاڵەتەدا بریتیە لەوەی کە هەمووان ئەوپەڕی کۆششیان بخەنەگەڕ لە هاندان و زەخیرە دارکردنی ئوممەت دژی دوژمنی سەرسەخت و کوفری گەورە کە دەستی گرتووە بەسەر وڵاتاندا و دین و دونیای تێك و پێکداوە، ئەویش بریتیە لە هاوپەیمانی ئیسرائیلی و ئەمریکی داگیر کەری وڵاتی حەرمەین و شوێنگەی شەوڕۆیی پێغەمبەر ~".

لەبەر ئەوەی بن لادن ناسنامەی موسڵمانێتی و شەرعیەتی لادا لەسەر دەوڵەتی سعودییە، ئەوا ڕاشی گەیاند کە پابەندی هیچ شتێکی نییە، دووا لەگەڵ ئەمریکیەکان وتی: " گەنجان بە بەرپرستان دەزانن لەبەرامبەر هەموو ئەوشتانەی جولەکەی براتان پێی هەڵدەستن لە فەلەستین و لوبنان و کوشتن و بردنی شەرف و ناموسی موسڵمانان و پیرۆزییەکانیان... جا ئێوە لەگەڵ ڕژێمی سعودی خوێنی ئەو بێ تاوانانە لە ئەستۆ دەگرن، هەموو ئەو شتانە دەبنە هۆی ئەوەی کە هەموو پەیمانێکتان لەگەڵ ئێمە هەڵوەشاوە بێت. کە ئێمە دەتان ترسێنین لە کاتێکدا ئێوە لەسەر خاکی ئێمە چەکتان بەدەستە، ئەوە شتێکی پێویستە بە پێی شەرع و عەقڵ کە بتان ترسێنین، تەنانەت ئەمە شتێکی ڕەوایە لە نەریتی مرۆڤایەتی و بوونەوەردا، جا نمونەی ئێوەو ئێمە

وەك مارێكی گەورە وایە چووبێتە ماڵی پیاوێك و ئەویش كوشتبێتی، ترسنوكیش ئەو كەسەیە كە ڕێگەتان پێدەدات چەكەكانتانەوە لەسەر خاكی ئەو بە ئارامی بێن و بچن ". و وتی: " ئەوانەی گومانیان وایە كە خوێنی سەربازانی ئەمریكی دوژمنی داگیركەری وڵاتی موسڵمانان پارێزراوە، ئەوا بە ناچاری ئەو بانگەشەیە دەكەن بەپێی ویستی ڕژێم لە ترسی هێزیان و سەلامەت بوون لە دەستیان، بەڕاستی پێویست و واجبە لەسەر تێكڕای هۆزەكانی دوورگەی عەرەب كە لە پێناوی خودا جیهاد بكەن و خاكەكەیان پاك بكەنەوە لەو داگیركەرانە، تەنانەت خوای گەورەش زانیویەتی كە خوێنی ئەو داگیر كەرانە بەفیڕۆدراوەو سەروەت و ماڵیان دەستماییەی جەنگە، جا هەر كەسێ یەكێ لەوانی كوشت ئەوا كەل و پەلە بەدەستهاتووەكانی هی خۆیەتی ".(١)

بن لادن لەو پەیامە بەناوبانگەی دا بانگەشەی كردووە بۆ هەڵسانی تێكۆشەرەكانی بۆ ئەنجامدانی هەر دوو پرۆسەی هەواڵ و ڕاهێنان دژی هێزەكانی ئەمەریكی كە بوونیان هەیە لە سعودییەدا. پاشان لە ساڵی دواتر هەڵسا بە دامەزراندنی (بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ كوشتنی جولەكە و خاچ پەرستەكان) فەتوای دەركرد كە تیایدا كوشتنی هەموو ئەمریكیەكان و هاوپەیمانانی بە پێویست دادەنێ لەسەر گشت تاكێكی موسڵمان. دەستخۆشی كرد لەو دوو هێرشەی كرایە سەر دوو باڵوێوێزخانەی ئەمریكی لە (نیوروبی) و (داروسەلام) ساڵی ١٩٩٨، پاشان پشتگیری و دەستخۆشی كرد لە هێرشە

---

(١) دەقی پەیامەكەم بە تەواوی دەبینی لەسەر ئەو ناونیشانە لە تۆڕی زانیاری دا:
http://www.aloswa.org/bayanat/afgan/laden2.html

گەورەکە بۆ سەر وەزارەتی بەرگری ئەمریکی لە واشنتن و تاوەری بازرگانی جیهانی لە نیۆ یۆرك لە ١١ی ئەیلولی ساڵی ٢٠٠١ز.

کاتێ ئەمریکا بن لادنی تۆمەتبارکرد بەوەی لە پشتی ئەو هێرشانەوەیە و بۆیە هێرشی کردە سەر (ڕێکخراوی قاعیدە) و حکومەتی تاڵیبانی ئەفغانی کە ڕێکخراوەکەی پەنا دابوو، لەو کاتەدا سعودییە خۆی بەری کرد لە بن لادن و هەمان هەڵوێستی جەنگ کردنی هەبوو دژی قاعیدە و بزوتنەوەی تاڵیبان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەك لە ئیمامەکانی مزگەوت و شێخەکان کە پشتیوانی بزوتنەوەکەیان دەکرد ڕەخنە بگرن لە هەڵوێستی سعودییە و بانگەشەشیان کرد بۆ پشت گرتنی ئەفغانستان و تاڵیبان و تەنانەت جیهاد کردن دژی ئەمەریکا، سەرکردەی ڕۆحی بۆ بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیۆنەکە شێخ حەمودی کوڕی عەقلائی شوعەیبی ڕونکردنەوەیەکی دەرکرد تیایدا داوایان لە وڵات و گەلانی ئیسلامی کرد کە پشتیوانی دەوڵەتی تاڵیبان بکەن دژی وڵاتانی خۆرئاوای بێ باوەڕ، پاشان ناوبراو فەتوایەکی دەرکرد و تیایدا جیهادی ڕاگەیاند دژی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکەدا، لەوبارەوە وتی: " ئەرکی ئێمە ڕاگەیاندنی جیهادە لەدژی ئەوەی جەنگ و دژایەتی ئەفغانستان دەکات ". ئەمە وەك هەڕەشەیەك بوو بۆ ڕژێمی سعودی و هەوڵێك بوو بۆ دەرچوون لە سیاسەتە پاشکۆیایەتیەکەی ئەمریکا و پشگرتنی هەڵوێستی بن لادن بوون. دواترفەتوایەکی تری دەرکرد تەکفیری گشت ئەوانە دەکات کە پشتیوانی و بەرگری لە بێ باوەڕان دەکەن لە دژ و لەسەر حیسابی

موسڵمانان[1]. جا وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی سعودی وەڵام و بەرپەرچی دایەوە بەوەی تەنها حوکمڕان و (ئولولئەمر) دەسەڵاتی ڕاگەیاندنی فەتواو جیهادیان هەیە و زۆر جەخت و پێداگیری کرد لەسەر پێویستی گوێڕیەڵی و فەرمانبەرداری[2]. شوعەیبی وەڵامی وەزیری دایەوە بەوەی کە ماموستای زۆربەی ئەوەی ئێستای پیاوانی ئاینینە لە شانیشینی سعودییەدا و بۆیە مافی خۆیەتی فەتوا دەربکات[3].

---

(١) ژمارەیەکی تر لە پیاوانی ئاینی لە شوێنکەوتووانی شوعەیبی وەك سولەیمان عەلوان و عەلی خیضر و بیشری کوڕی فەهدی ئالی بیشر و سولەیمان عوّدە و ناصرشی عیمڕی و حامیدی عەلی چەند فەتوایەکیان دەرکرد کە تانەو توانجیان دەدا لەو پشتیوانییەی پێشکەشی ئەمریکیەکان دەکرا و تەکفیری ئەوەی دەکرد کە سەریان دەخات بەسەر موسڵمانان (ی ئەفغانی). وەزیری ناوەخۆ ئەمیر نایفی کوڕی عەبدولعەزیز لە بەرواری ٢٠٠١/١٠/١٨ هۆشداری دا لە پرۆسەی تەکفیری کە ئاراستەی دەوڵەت و زانایان دەکرێت و وتی: " ئێمەین موسڵمان و شەریعەت جێبەجێ دەکەین، جا چون کەسانێك وەك ئەوانە دەوێرن تاکەکانی ئەم وڵاتە بە پێشەواو زانا و پیاو ئافرەت تەکفیر بکەن، ئێمە چۆن شتی وا قبوڵ دەکەین؟ ".

(٢) ئەمە لە گفتوگۆیەك دابوو لەگەڵ ڕۆژنامەی (ریاز) لە بەرواری ٢٠٠١/١١/٨ و هەندێ لە شێخەکانی سەر بەدەوڵەت پشتگیریان کرد وەك شێخ صالح لوحەیدان سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای دادوەری و سەدلان کە هەر دووکیان هێرشەکەی ١١ سێپتێمبەریان مەحکوم کرد، کۆمەڵەی (قاعیدە)شیان تۆمەتبارکرد بەوەی یاخی بوونە و مەبەستیان ئانەوەی خراپەیە لە سەر زەویدا و لە ناوبردنی بەروبووم و ڕەچەڵەکە.

(٣) شێخ شوعەیبی و دوو قوتابیەکەی عەلی خیزیری و سولەیمان عەلوان لە ڕێکەوتی ١٤٢٢/١٠/١٦ك پەیامێکی پشتگیریان ڕەوانەکرد بۆ ئەمیری بزوتنەوەی تاڵیبان مەلا عومەر کە تیایدا هانی ئەمیری ناوبراو دەدا لەسەر خۆڕاگری و بەرگری و هێرش کردنە سەر ئەمریکیەکان، هەروەك تیایدا هاتووە: " گەواهی و شایەتی دەدەین کە تەنها ئێوەن سەری خۆتان بەرز کردۆتەوە لە سەردەمێکدا سەری زۆرێك لە موسڵمانان شۆڕبووە بۆ دەوڵەتی بێ باوەڕ و خاچ پەرستی ئەمریکا،

لەگەڵ ئەوەی کە شوعەیبی بەڕاشکاوی تەکفیری دەسەڵاتدارە سعودییەکانی نەکرد و بانگەشەی نەکرد بۆ ڕووخاندنییان، بەڵام هاوهەڵوێستی و پشتگیرییەکەی بۆ بزوتنەوەی تالیبان و قاعیدە و دەرکردنی فەتوا بۆ پشتیوانی کردنیان و بەناڕەوا دانانی پشتیوانی کردنی ئەمریکا لە هێرش کردنە سەر ئەفغانستان، ئەمە خۆی بینیەوە لە ڕووخانی هاوپەیمانییە مێژووییەکە کە ٢٥٠ ساڵ درێژەی کێشا لە نێوان ماڵی سعودی و

---

موسڵمانان کەسێکی وایان دەست نەکەوت کە ببێتە مایەی ڕێزو شکۆ بۆیان و بڵێت (نا پاشان نا) لە بەرامبەر ئەوەی ئەمریکا لەو سەردەمەدا داوای دەکات تەنها ئێوە نەبن وتوتانە نا، بەڕاستی موسڵمانان ئاسوودەن بە کەسانی وەك ئێوە... لە ڕۆژێکدا ئارامتان گرت کە ئەوانی تر هەموویان سەر شۆڕ بوون و بیروباوەڕەکان گۆڕان و هەڵوەشێنەرەوی ئیسلام لە ناو زۆرێ لە موسڵمانان دیارکەوت.

ئەمیری بڕواداران بێگومان سەرسامی ئێمە بە کردەوەکانتان و پشتیوانی ئێمە بۆ ئەو کردەوانەتان ناپچڕێت هەرگیز بەویستی خوای پایەبەرز مادام ئێوە ناگۆڕێن و ساردو سوڕ نابن یان پاشگەز نابنەوە، جا لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە کە خۆڕاگری بە ئێوەو ئێمە ببخەشێت تا مردن، دڵنیاشتان دەکەینەوە کە ئێمە و کۆمەڵێك لە زانایان و بانگخوازان و زانستخوازن لەگەڵ ئێوەین و پشتیوانتانین، پێشتان دەڵێین سەرزەنشت و توانجی کەسانێ کە ئاراستەی خۆڕاگری و تێکۆشانەکەتان کرابوو نەبێتە هۆی خاوبوونەتەوەتان و هێزتان لاواز نەکات... بەڵکو چاوی یەکتاناسان بەهۆی ئێوە ئۆقرەی گرت و سەربازانی خوا لە ئێوە ڕازی بوون، ئێمە لە پشتی ئێوەین بەهەموو هێزێك پشتان دەگرین بەهەموو توانایەکمەوە و بڕواداران هاندەدەین بۆ ئەوەی بێنە ڕیزەکانتانەوە بۆ جەنگان دژ بەبێ باوەڕی و کوفر.. .

لە کۆتاییدا ئامۆژگاری گشت موسڵمانان دەکەین لە گشت شوێنێکدا بە پشتیوانی کردنی میرنیشینی ئیسلامی لە جیهاد کردن دژ بە تێکڕای گەلە بێباوەڕەکان، هەروەك ئامۆژگاری ئەفغانیش دەکەین بەتایبەتی کە نەفس و گیانی خۆیان ببەخشن لە پێناوی خوادا و پشتیوانی میرنیشینی ئیسلامی بکەن و بوەستن لە ژێر ئاڵای ئەمیری بڕواداران ".

شوێنکەوتووانی مەذهەبی وەهابی، چونکە شوعەیبی لە نەجد و بەریدە کە قەڵای وەهابیەتە پێگەیشتووە، تەنانەت یەکێکە لەوانەی کە ئاستی زانستی زۆر بەرزو باڵایە و دەژمێردرێت لە گەورە زاناکانی سعودیە و ژمارەیەکی زۆری شوێنکەوتەی هەن. لە ناوەڕاستی حەفتاکان بەندکرا لە دوای واژوو کردنی لەسەر یاداشتنامەی ئامۆژگاری و لە ئەندامێتی دەستەی گەورەی زانایان لادرا.

بەهەر حاڵ: ئەو بزوتنەوەیە ئۆپۆزیسۆنە نزیکترینیانە لە ڕۆحی وەهابی کۆن، لەبەر ئەوەی هەر لەژێر دەسەڵاتی سعودیەدا دەژیا و جەنگی لەدژی ڕانەگەیاند، دەکرێ گریمانی ئەوە دابنێین کە توقیەی بەکارهێناوەو بۆچوون و ڕای خۆی بە ڕاشکاوانە لە هەموو شوێنێ دژی حوکمڕانانی ئالی سعود دەرنەدەبڕی[1].

---

(١) بن لادن گەڕایەوەو ڕژێمی سعودی تۆمەتبار کرد بە هەڵگەڕانەوەو بێ باوەڕی، ئەمەش لە پەیامێکی دەنگیدا بۆ کەناڵی (جەزیرە) لە ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ١٤٢٣ بەرامبەر ١١ شوباتی ٢٠٠٣، وتویەتی: "هەر کەسێ لە حوکمڕانانی دەوڵەتە عەرەبیەکان ئەوانەی یارمەتی ئەمریکایان داوە لە دامەزرادنی بنکەی سەربازی یان هەر جۆرێ لە جۆرەکانی یارمەتی هەتا ئەگەر بە قسەش بێت، بۆ کوشتنی موسڵمانان، ئەوا پێویستە بزانێت کە ئەو هەڵگەڕاوەتەوەو دەرچووە لە ئایینی ئیسلام". داوای لە موسڵمانان کرد کە یاخی ببن لە ڕژێمە لەسەر حوکمەکان، هەروەك وتی: "جەخت دەکەینەوە بۆ موسڵمانە ڕاستگۆکان کە پێویستە لەسەریان خۆیان ڕزگار بکەن لە بەندە و کۆیلایەتی و بچنە ڕیزی سەربازانی ئوممەتەوە و پڕ چەك و زەخیرە و تفاقی بکەن و خۆیان دابڕن لەو ڕژێمە حوکمڕانە ستەمکارەکان و هەڵگەڕاوانە کە بەکۆیلە کراوی ئەمریکان و پێویستە موسڵمانان حوکمی خوا بەرپا بکەن لە زەویدا". و "ئەو شوێنانەی زۆرتر پێویستیان بە ڕزگاربوون هەیە بریتین لە ئوردن و مەغریب و نێجیریا و پاکستان و سعودیە و یەمەن".

## تەکفیر کردنی ڕژێمی سعودی و دامەزراوەی ئایینی

لەوانەیە کتێبی (الكواشف الجلية في كفر الدولة السعودية)[1] دانەرەکەی نزیکە لە ڕێکخراوی قاعیدە، ئەوا ڕوونکردنەوەیەکی حەقیقی فیکرەی ئۆپۆزیسیۆنی بزوتنەوەی وەهابی (شۆڕش گێڕی تەکفیری) پێکدێنێت، لە دژی ئالی سعود و شوێنکەوتووە "وەهابیەکانی". چونکە دانەرەکە (نەجدییەکە) وەك گەڕاندنەوەی کەلەپەوری وەهابی دەڵێت: "مەرج نییە هەرچی بانگەشەی یەکتاناسی کرد و خۆی دایە پاڵی و ناوێکی لە خۆ نا کە خوێن و ماڵی پارێزراو بکات بە یەکتاناس دابنرێت، ئەمە نایەتەجێ تا بێ باوەڕی خۆی ڕانەگەیەنێت بەهەموو ئەو شتانەی کە جگەلە خوا دەپەرسترێن و خۆی بەریی بکات لەو تانە جا ئەو پەرستشانە چ سوژدە بن یان قوربانی یان پاڕانەوە یاخود ملکەچ بوون و یاسادانان و داوەری کردن بێت، جا هاوبەشدانان بۆ خوا لە حوکمدا وەك هاوبەشدانانە بۆ خوا لە پەرستنی دا. شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە ڕوونکردنەوەی فەرموودەی موسلم: (هەر کەسێ وتی هیچ خوایەك نیە بەحەق شایەنی پەرستن بێت جگەلە خوای گەورە و بێ باوەڕی خۆی دەربڕی سەبارەت بەو شتانەی جگەلە خوا دەپەرسترێن ئەوا ماڵ و خوێنی پارێزراو دەبێت و پاداشتیشی لەسەر خوایە) وتویەتی: " ئەمە لە

---

(١) بڵاوکراوەتەوە لە ساڵی ١٩٩٤ لە چاپخانەی (القصيم) لە لەندەن، بە ناوێکی خوازراو کە بریتیە لە: (ئەبی بەڕاء مورشدی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی سولەیمانی نەجدی) (و ناوی حەقیقی بریتیە لە: ئەبو موحەمەد عاصمی بەڕقاوی مەقدەسی) ئوردونیە و نزیکە لە ڕێکخراوی قاعیدە.

گەورەترین ئەو شتانەیە کە واتای (لا اله الا الله) ڕوون دەکەنەوە، جا تەنها دەربڕینی شایەتمان و زانینی ماناکەی و دان پێدانانیشی بەبەس نەزانیوە تا ماڵ و خوێنی پارێزراو بێت، تەنانەت ئەوەشی بە بەس نەزانیوە کە تەنها لە خوا بپارێتەوە بەڵکو پێویستە بێ باوەڕی خۆی دەربڕێت بەوەی جگەلە خوا دەپەرسترێ، جا ئەگەر گومان یان دوودڵی لەمەدا هەبوو ئەوا ماڵ و خوێنی پارێزراو نابێت"[1].

دەڵێت:- "ئێمە فەرمان پێکراوین بەوەی بە گشتی بێینە ناو ئیسلامەوە، کە سەیری قورئانی پیرۆز دەکەین و ئەو فەرمایشتەی خوای پایەبەرز دەبینیت: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرة: ١٩٣. واتە: ("خۆ ئەگەر کافران کۆڵیان نەداو هەر جەنگان و پیلانیان گێڕا" ئێوەش بجەنگن دژیان تاوەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت). ئەو ئاشوبەی لە ئایەتەکەوە باسی کراوە بریتیە لە هاوبەشدانان بەهەموو جۆرەکانی چ جیاوازی نیە لەنێوان شیرکی گۆڕ و شیرکی دەستور "[2] و ئەو " حکومەتە (ی سعوییە) بێ باوەڕ دەرچووە لە دین و خانەی یەکتاناسان لە چەندین دەرگاوە:

یەکەم: یاسادنان و سەروەری یاسا دەستکردەکان و داوەری پێکردنیان.

دووەم: دۆستایەتی دوژمنەکانی خوا کە بێ باوەڕە خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی و کەنداو و عەرەبەکان لەخۆ دەگرن، تەنانەت بەهێز کردنی

---

(١) النجدي: الكواشف الجلية، ١٩٥.

(٢) النجدي: الكواشف الجلية ٢٨٣.

پەیوەندی برایەتی و خۆشەویستی و سۆزداری و برادەرایەتی و پشتگیری کردنیان "[1].

نووسەرە نەجدییەکە ڕەخنەی لە حکومەتی سعودی گرت کە چووەتە ناو ڕێکخراوی کۆمکاری عەرەبی و ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، چونکە بەبۆچوونی ئەو ئەمانە کافرن، لەبەر ئەوەش کە ئەندام بوونی لەو ڕێکخراوانە دەبێتە هۆی زیاتر نزیك بوونەوەو پشتگیری کردنی دەوڵەتانی ئەندام لە ڕووی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی و دۆزینەوەی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ بەهێزکردنی یارمەتی و لێك تێگەیشتن لە نێوان دەوڵەتانی ئەندام و دەوڵەتەکانی تریش. لەبەر ئەوەی ئەو ڕێکخراوە لەسەر ئەم بنەمایانە دادەمەزرێن:

١_ یەکسانی تەواو لە نێوان دەوڵەتانی ئەندام.

٢_ ڕێزگرتن لە مافی چارەی خۆنووسین و دەست نەخستنە ناو کاروباری ناوەخۆیی.

٣_ ڕێزگرتن لە سەروەری و سەربەخۆیی و یەکێتی خاکی هەر دەوڵەتێکی ئەندام.

٤_ چارەسەر کردنی ئەو کێشانەی دروست دەبن بە ڕێگەی ئاشتی.

٥_ ڕێگە گرتن لە بەکارهێنانی هێز و هەڕەشە پێکردنی[2].

---

(١) النجدي: الكواشف الجلية ١٩١.

(٢) النجدي: الكواشف الجلية ١٩١.

ئەو شتانە دانەری نەجدی بە دژی عەقیدەی یەکتاناسی (وەهابی) دەزانێت و یەکسان کردنی: "یەکتاناس و موسڵمانان" لەگەڵ "هاوبەشدانەران" _ مەبەستی جگەلە وەهابیەکانە _ ئەوا بەدژی یەکتاناسی دەزانێت.

دانەر حکومەتی سعودی تۆمەتبار دەکات بەوەی ڕێگری دەکات لە دینی خواو بڕوای پێی نییە و ئاژاوە بۆ "موسڵمانان" دروست دەکات و ئەوانەی " یەکتاناسی حەقیقین و فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە و خۆیان بەری دەکەن لە هەموو تاغوتەکان" ئەوا ئەمانە دەچەوسێننەوەو بەندیان دەکەن و دەیان کوژن و شاربەدەریان دەکەن و ڕاوەدوویان دەنێن. تەنانەت دەشڵێت کە حکومەتی سعودی دۆستایەتی و پشتگیری دوژمنانی دین دەکات و هاوسۆزە لەگەڵیاندا[1].

ڕەخنەی ئەوە دەگرێت لە دەسەڵاتدارانی سعودییە بەوەی: " یاسا دادەنێن کە خوای گەورە ڕێگەی پێنەداوەو شوێن قسەی یاسادانەرانی بێ باوەڕو دوژمنانی دین دەکەون و تەنانەت چوونەتە ناو دینی فرە تاغوتەکان چ هەرێمی چ جیهانی و نێو دەوڵەتی بن "[2] و سەرزەنشتیان دەکات بەوەی " هاوبەشدانەرە تاغوتە عەرەبەکانیان هێناوەتە ناو ماڵی خوا لە کاتی بەستنی کۆنگرەی سەرکردەکان لە مەککە، تەنانەت هێنانە ناو مەککەی براکانیان بەکەیفی خۆیان ئەوانەی کە خوای پاك و بەرز لەبارەیانەوە وتویەتی:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾ التوبة: ٢٨. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە چاك بزانن کە موشریك و هاوەڵگەران

---

(١) النجدي، الكواشف الجلية ٢٤٩.

(٢) النجدي، الكواشف الجلية ٢٥٠.

ناپوخت و پیس، ئیتر لەم ساڵەیان بەدواوە نابێت نزیکی مزگەوتی حەڕام "کەعبەی پیرۆز" بکەون)"[1].

دواتر نووسەری کتێبەکە (نەجدییەکە) لە تەکفیرەوە دەچێتە سەر کۆچ کردن و جیهاد، لەو بارەوە دەڵێت: " زانایان بەدەق جەختیان کردۆتەوە کە ئەگەر حوکمڕان کوفری ئاشکرای ئەنجام دا ئەوا پێویستە موسڵمانان لەدژی ڕاپەڕن و لەسەر کار لای ببەن و بیگۆڕن و کەسێکی تری لە جێگەیدا دابنێن تا شەرعی خوا جێبەجێ بکات و یەکتاناسی بە تەواوی بێنێتەجێ، هەر کەسێکیش لەو حاڵەتەدا سەرگەرمی ماستاوچێتی ببێت ئەوا تاوانەکەی لە ئەستۆی خۆیەتی و پێویستە سزابدرێ. هەر کەسێ توانای نەبوو ئەوا لەسەری پێویستە کۆچ بکات و خۆی نەداتە پاڵ کوفر و حکومەتەکانی، بەڵکو پێویستە بەردەوام قسە بکات و بدوێت لەگەڵ نەفس و دەروون سەبارەت بە جیهاد کردن لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانە و نەوەکان لەسەر ئەمە پەروەردە و پێ بگەیەنرێن و ئەوەیان لە ناخا بچێنرێت... بشزانە لە چاکترین جۆرەکانی (کۆچ کردنی واجب) لە هەموو سەردەمێکدا بریتیە لە کۆچ کردن لە گشت پیشە و کارێ کە دەبێتە هۆی پشتیوانی کردن و سەرخستنی ئەو تاغوتانە و یاساکانیان"[2].

بەهەمان شێوە دەڵێت: " دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێ کە بۆنی یەکتاناسی کرد بێت و هاوبەشدانانی ناسیبێت کەچی یارمەتی دەر بێت بۆ ئەو دەوڵەتە بێ باوەڕو هەڵگەڕەواو هاووێنەکانی... بەهیچ شێوەیەك بۆی دروست

(١) النجدي، الكواشف الجلية ٢٥١.

(٢) النجدي، الكواشف الجلية ١٩٦.

نییه كه كار بكات له سەربازگەكانی و پاسەوانە نیشتمانیەكەی و هێزی سەربازیی یان پۆلیسیی و دەزگای هەوالگری یان ئاسایش و سیخورییەكەی. هەموو ئەو كارانەی باسكران دەچنە خانەی دۆستایەتی و پشتگرتن و سەرخستنی بەسەر بڕوادارانی یەكتاناس ئەوانەی بەرین لەو بێ باوەڕی و كوفرانەی حكومەت ئەنجامی داوە، جا لە سنوری تاواندا ناوەستێت بەڵكو سنورەكە دەشكێنێ دەچێتە خانەی بێ باوەڕی و هەڵگەڕانەوە "[1] و پرسیار دەكات: هەڵوێست چییە لە هەمبەر ئەو دەوڵەتە ناپوخت و پیسە و هاوێنەكانی لە حكومەتە هەڵگەڕاوەكان؟... وەڵام دەداتەوە: بریتیە لە كۆچ كردن و جیهاد كردن. ئامانجی ئەو جەنگەش بریتیە لە بەجێ هێنانی یەكتاناسیی، چونكە (لا اله الا الله) واتە خۆ بەری كردن لە گشت دین و تاغوت و پەیڕەو یاسا و پەرستراوێ جگەلە خوای گەورەو دژایەتی كردنی هاوبەشدانەران و دۆستایەتی كردنی بڕواداران[2] و هەر كەسێ ڕێگەی پێشینانی مەبەستە ئەوا با ئەوە لەبەر چاوبگرێت كە چۆن هەڵداتن لە دەروازەی دەسەڵاتداران و حوكمڕانە ستەمكارەكان لە سەردەمی خەلافەت چ جای سەردەمی بێ باوەڕی و كوفر و یاسای دەست كرد و دۆستایەتی كردنی دوژمنانی خوا "[3] و دەڵێت: " ئای چۆن ئەو وتەیەی باپیریان عەبدولعەزیزی كوڕی سعود جێبەجێ بووە كە لە پەیامێكیدا هاتووە كە بۆ وڵاتانی بیانی و ڕۆمی ناردبوو:(ئێمە تەنها ئەو كەسە تەكفیر دەكەین كە یەكتاناسی دەناسێ و

---

(١) النجدي: الكواشف الجلية ١٩٨.

(٢) النجدي: الكواشف الجلية ١٩٤.

(٣) النجدي: الكواشف الجلية ٢٨٥.

توانجی تێدەگرێ و ناوی دەبات بە دینی خەواریج، هاوبەشدانان و شیرکی ناسیوەو و هاوبەشدانەرانی خۆشویستووەو بانگەشەی بۆ کردووەو خەڵکی لەسەر هانداوە دوای ئەوەی بەڵگەشی لەسەر بەرپابووە، ئەگەرچی بەخۆیشی شیرك ئەنجام نەدات یان ئەنجامیشی بدات بەڵام بەناوێکی تر ناوی ببات ئەمەش دوای ئەوەی کە زانیویەتی خوای گەورە حەرامی کردووە) الدرر السنية: ١/١٤٥".

## هەڵوێست لەهەمبەر زانایانی دەست و پێوەندی حوکمڕان

دوای تەکفیر کردنی دەوڵەتی سعودییە، ئەوا نووسەری نەجدی هێرشێکی توند دەکاتە سەر پیاوانی ئایینی وەهابی کە هاوپەیمانی حکومەتن، تەنانەت تۆمەتباریان دەکات بەوەی پشتی دوژمنانی خوا دەگرن و دژایەتی خۆشەویستانی خوا دەکەن، ئوممەت هەڵدەخەڵەتێنن و تووشی ئاشوبی دەکەن. وتویەتی کە هاوبەشدانانی هاوچەرخی ڕاشکاو ئەنجام دەدەن بە ناوی ئیسلام و یەکتاناسی. داوا دەکات کە ئامۆژگاری زانایان بکرێت و موسڵمانان خۆیان لێ دوور بگرن تا بە خۆیاندا دەچنەوەو دەست هەڵدەگرن لە ماستاوچێتی کردن بۆ حوکمڕان و چوونە پاڵی و موشتومڕ کردن لە سەریان[1] و دەڵێت: " بەبیری یەکتاناسان دەخەمەوە کە هەڵ نەخەڵەتێن بە زانایانی حکومەت، چونکە ئەو زانایانە هەموو خەفەتیان ئەوەیە کە هێرش بکەنە سەر ئەو یەکتاناسانەی کە خۆیان بەری کردووە لە تاغوتەکانی حوکمەتەکەیان. واتە: هەڵ نەخەڵەتێن بە بڕوانامە و ناونیشان و مەندیلەکانیان. (هەر کە گەیشتیە بیدعەتچیەك یان بێ دینێك ئەوا بە تووڕەییەوە پشتی تێ بکە)... من داوام وایە لەو شێخانە بۆ ئەوەی بێن دابنیشن دووبارە فێری یەکتاناسی ڕاست ببن و فێری مانای (لا اله الا الله) ببن لە کتێبەکانی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و کوڕەکانی ئەوانەی کە ئەو دەوڵەتە خۆی بە شوێنکەوتەی ئەو دادەنێن کەچی ئەوانیش

(١) النجدي، الكواشف الجلية ٢٨٦.

لێی بەرین "[1].

نووسەر (ئەبو بەرائی نەجدی) دەدوێت لەسەر (ئەفغانە سعودییەکان) و تەکفیر، لەوبارەوە دەڵێت: " چەندین کۆمەڵەی گەنجی ڕاهێنان پێکراو لەسەر جەنگ و چەك و تەقەمەنی لە ئەفغانستان دەگەڕێنەوە، جا دەبینین کە دوای دەرچوونیان لە سنوری دوورگەکە و سعودییە ئەوا سوودیان بینیوە و کە گەڕاونەتەوە ئەوا جیاوازن لەگەڵ سەرەتای دەرچوونیان. جا ئەوەتا فیکری (تەکفیرو جەنگ کردن لەگەڵ حکومەت و پشتیوان و هاوسۆزانی) بڵاوبووەتەوە لە نێوان گەنجە گەڕاوەکان لە ئەفغانستان وەك چۆن ئاگر لە پوش بەردەبێت "[2] " ئا دەبینی ئەو گەنجانە دەگەڕێنەوەو متمانەیان نەماوە بەوانەی کە ستایشی ئەو تاغوتانە دەکەن یاخود پێیاندا هەڵدەڵێن یان مشتومڕیان لەسەر دەکات و لەبەردەم دەرگاکانیان دەوەستێت با هەر چەندە ڕدێنی درێژ و ناونیشانی گەورە بێ. لە ماوەی دواییدا هەندێ لە شێخەکانی تر دەرچوون کە جەخت دەکەنەوە لە وتار و وانەکانیان لەسەر دژایەتی کردنی بۆچوونە ڕیزپەڕەکان و فیکرە تووند ڕەوەکان، مەبەستیشیان لێ ئەو کەسانەن کە حوکمەتەکەیان و پشتیوانانی تەکفیر دەکەن و بانگەشە دەکەن بۆ جیهاد کردن لەگەڵی "[3].

ئەگەر ڕێك کەوت بۆ ئەو بزوتنەوە وەهابیە ڕەسەنە کە سەربکەوێت " لە جیهادەکەیدا " دژی ئالی سعود، ئەوا وەك دەردەکەوێت ئەزموونی حوکمی

---

(١) النجدي: الكواشف الجلية ٢٤٤.

(٢) النجدي: الكواشف الجلية ٢٧١.

(٣) النجدي: الكواشف الجلية ٢٧٢.

سعودی وەهابی بەتەواوی دەگێڕێتەوەو بەبێ گۆڕانكاری كردن لە بنەماكانی سیستەمی سیاسی، چونكە خاوەنی فیكرمیەكی ڕەخنەیی ڕیشەیی نییە و دەستنیشانی شوێنی كەم و كورتی و تاكڕەوی دەسەڵات ناكات، بەڵكو تەنها ئەوە دەزانێت كە بانگەشە بكات بۆ گوێڕایەڵی حوكمڕانی نوێ بەشێوەیەكی ڕەها. تا ئەمڕۆش، ئەوا بێگومان ناتوانێت هیچ سیستەمێكی دیموكراسی هاوچەرخ قبوڵ بكات كە دامەزرابێ لەسەر ڕاوێژ و بەژداربوونی هەموو دەستە و حیزب و چینە كۆمەڵایەتیەكان لە پڕۆسەی سیاسی دا جا چ لە سایەی ئالی سعود یاخود جگەلەوان، چونە ئەوە بە جۆرێ لە هاوبەشدانان و بێ باوەڕ بوون بە خوای گەورە دادەنرێت.

ئەبو موحەمەدی عاصمی مەقدەسی (یەكێ لە سەركردە وەهابی نوێیەكان و نزیكە لە ڕێكراوی قاعیدە) لە كتێبەكەی دا:(الديموقراطية دين) دەڵێ: " دیموكراسیەت دینێكی ترە جگەلە دینی خوای گەورە و میللەتێكە جگەلە میللەتی یەكتاناسی، ئەنجومەنی نوێنەرانی بریتین لە كۆشكی شیرك و قەڵای بت پەرستین، خۆ لێ دووركرتنی پێویستە بۆ هێنانەجێی یەكتاناسای كە مافی خوایە لەسەر بەندەكانی، بەڵكو پێویستە تێ بكۆشێ بۆ ڕووخاندنی و دوژمنایەتی كردنی پشتیوانانی و ڕق لێبوونەوەیان و جیهاد كردن لەگەڵیان. ئەمە بابەتێكی كۆشش (ئیجتهاد)ی نییە هەروەك هەندێ هەڵخڵەتاو وای دادەنێن، بەڵكو شیركێكی ڕوون و دیارە و كوفرێكی ئاشكرایە كە خوای گەورە لە ئایەتە یەك مانا هەڵگرەكان (موحكم)ەكانی قورئانی پیرۆزدا هۆشداری داوە لەبارەیەوەو پێغەمبەری هەڵبژێردراویش ~ بەدرێژایی ژیانی دژایەتی

کردووه"[1].

دەڵێت: " ئەو تاغوتەی پێویستە تەکفیری بکەی و موسڵمان خۆی لێ بپارێزی لەوەی بەندایەتی بۆ دەکەیت تا دەست بگریت بە قوڵف و ڕێشمی سەرکەوتنی تووندوتۆڵ، ئەوا تەنها بەرد و پەیکەرو دارو گۆڕێ نین کە دەپەرسترێن بەهۆی سوژدەیەك یان نەزرێك یاخود سوڕانەوەو تەواف بەدەوری دا و بەس... بەڵکو ئەمە لەوە گشتگیرترە... گوڕێڕایەڵی کردن لە یاسادانان بەندایەتی کردنە کە تەنها بۆ خوای گەورە دروستە، ئەگەر کەسێ لە یەك حوکمیشدا یاسای غەیری خوای گەورە کردە دادوەر ئەوا بەو کارەی بووەتە هاوبەشدانەر "[2]، دەڵێت: " مانای وشەیی دیموکراسی بریتیە لە:(حوکمی گەل یان دەسەڵاتی گەل یاخود یاسادانانی گەل) بێگومان ئەمە لە گەورەترین تایبەتمەندییەکانی کوفرو شیرك و باتیڵن کە تەواو پێچەوانەو دژی دینی ئیسلام و میللەتی یەکتاناسانە... دیموکراسیەت بێ بڕوابوونە بە خوای گەورە و هاوبەشدانانە بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و پێچەوانەی میللەتی یەکتاناسان و دینی نێردراوانە "[3].

بەهەمان شێوە دەڵێت: " گەل لە دینی دیموکراسی دا چەند نوێنەرێك هەڵدەبژێرێت، جا هەر دەستە و هۆز و کۆمەڵە پەروەردگارێ بۆ خۆی دەستنیشان دەکات لەو فرە پەروەردگارە بڵاوبووانە، بۆ ئەوەی بەپێی هەوەس و ئارەزووی ئەوان یاسایان بۆ دابڕێژن... جا هەیانە بەپێی ئایدۆلۆژیا و

---

(١)المقدسي: الديموقراطية ٢.

(٢) المقدسي: الديموقراطية ٢ _ ٣.

(٣) المقدسي: الديموقراطية ٨.

فیکرەکەی خۆی پەروەردگاری هەڵدەبژێرێ، جا یان پەروەردگاری فڵانە حیزبە یاخود پەرستراوی فیسارە حیزبە، هەشیانە بەپێی هۆزو دەمارگیری هۆزایەتی هەڵی دەبژێرێ، جا یان فڵانە خوایە یان بتە پەرستراوەکەی فیسارە هۆزە هەڵدەبژێرێ، تەنانەت هەیانە بە گومانی خۆیان خوایەکی سەلەفی هەڵدەبژێرێ و ئەوەی تر خوایەکی ئیخوانی و یەکێکی تر خوایەکی ... و فیسارە خوایەکی... جا لە حەقیقەتدا ئەو نوێنەرانە بتی دانراو و پەیکەری پەرستراوان لە پەرستگاو قەڵاکەیان (پەرلەمان) کە دینداری دەکەن بە خۆیان و شوێنکەوتووانیان بەپێی دینی دیموکراسی و دانانی دەستور "[1].

هەڵوێستی نەرێنیی (سلبی) بزوتنەوە ڕادیکاڵەکە (تەکفیرییەکە) لە هەمبەر ڕاوێژ و دیموکراسیەت، بووە هاندەری تا ڕێگەی سەربازی بگرێتەبەر لە پرۆسەی گۆڕانکاری سیاسی، وەك تاکە ڕێگە و چارەسەر، ڕێکخراوی (قاعیدە) کە ئوسامە بن لادن سەرکردایەتی دەکات ڕەخنە دەگێرێت لە یارمەتی سەربازی کە لە نێوان (ریاز) و واشتنۆن دا هەیە یان ڕەخنە لەو پرۆسەیە دەگرێت کە ناوی دەبات بە داگیر کردنی دوو حەرەمە پیرۆزەکە لە هەمان کاتدا هیچ شێوازێکی دیموکراسی بەدەست نیە تا لە میانەیدا هەڵوێستی خۆی بەسەر حکومەتی سعودیەدا بسەپێنێت و گوشاری بخاتە سەر بۆ وەدەرنانی هێزە ئەمریکیەکان بە ڕێگەی ئاشتی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سیستەمی دیموکراسی بوونی نییە لە سعودییە، بۆیە ڕێکخراوی ناوبراو وابەچاکی زانی کە گورزەکانی بوەشێنێتە هێزەکانی ئەمریکا، تەنانەت بن لادن لە پەیامێکی بەناوبانگی دا ڕای گەیاند کە بڵاوی کردەوە لە ساڵی ١٩٩٧،

---

(١) المقدسي: الديموقراطية ١٠.

پابەندی هیچ هاوپەیمانییەکی حکومەت نابێت و داوای لە گەڵی سعودی کرد کە گورزی توووند بوەشێننە ئەمریکیەکان لەناوەوەو دەرەوەی سعودییە تا ناچار بکرێن بۆ دەرچوون و کشانەوە لە دوورگەی عەرەبیدا. بەشێوە دەربڕینێکی تر... هۆکاری پێکدادانی بن لادن و ڕێکخراوی (قاعدە) لەگەڵ ئەمریکا دەرەنجامی نەبوونی دیموکراسیەتە لە ڕژێمی سعودی و فیکری ئۆپۆزیسیۆنی وەهابی ڕادیکاڵی کە بڕوای نیە بە دیموکراسی. چونکە ئەگەر هەر دەلاقەیەك هەبووبا بۆ گۆڕانکاری و چارەسەری سیاسی و بەژداربوونی جەماوەری لە دەسەڵاتدا ئەوا بن لادن خۆی بەناچار نەدەبینی کە دەست بداتە چەك لە جیاتی حکومەت و داوا بکات کە ئەمریکا ڕاستەوخۆ دەربچێت و بکشێتەوە لە دوورگەی عەرەبی دا.

بزوتنەوەی وەهابی پاشکۆی ڕژێمی سعودی و ئۆپۆزیسیۆنیش بەژدارن لە یەك بنەمای فکریدا و خاوەنی یەك بنچینەی فیکرین، هەڵوێستێکی وێکچوویان هەیە لەهەمبەر ڕاوێژ و هەڵبژاردن و بەژداربوونی گەل لە حوکم و دەسەڵاتدا. ئەگەر ئەو بزوتنەوە چاکسازی خوازانە ڕەخنە بگرن لە ڕژێمی سعودی یان هەندێ ڕەفتاری حوکمڕان و داوای گۆڕینی ڕژێمەکە دەکات لە ڕەگ و ڕیشەدا. ئەگەر هەندێکیان تەکفیری ڕژێمەکەیان کردبێتیش و جەنگی ڕایگەیاندبێ یان ڕادەگەیەنێ دژی ڕژێمەکە، ئەوا لەهەمان کاتدا شێوازێکی بەدەست نیە بۆ حوکمڕانی جگەلە شێوازی خۆسەپێنی تاکرەوی ڕەها نەبێت، تەنانەت بیریش ناکاتەوە لە پەنا بردنەبەر ڕاوێژ و هەڵبژاردن یان قبوڵ کردن و ڕازی بوون بە بنەمای ئاڵوگۆڕی دەسەڵات بەشێوەیەکی ئاشتی و دیموکراسی لەگەڵ حیزبەکانی تردا.

ئەگەر وەهابیەتی فەرمی و نافەرمی هەندێ لە "وەهابیەتەکەی" کاڵ کردبێتەوە بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە تەکفیر و کوشتار، ئەوا هەر ئەو بڕوایەی هەیە کە تەنها وەهابیەکان "کۆمەڵەی ڕزگار بوون" لە نێوان هەر دوو کۆمەڵەی "گومڕایان و لادەرەکان". ئەگەر بڕواشی وانەبێت کە تەنها ئەوان "موسڵمانن و یەکتاناسانن" لە بەرامبەر "بێ باوەڕان و هاوبەشدانەران". تا ئێستاش بە تێڕوانینێکی نەرێنی (سلبی) دەڕوانێتە کۆمەڵە و تاقمەکانی تر و تێکڕای موسڵمانان وەك شیعە و صۆفیەکان و ئەشعەری و موعتەزیلەکان هەتا (برایانی موسڵمانیش: ئیخوان موسلمین)، چ جای بانگەشە کارانی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لە ناو جیهانی ئیسلامی دا. ئا

لێرەوە شتێکی سەخت بوو لەسەر وەهابیەکان کە بوونی هەر حیزبێکی جیا لە خۆیان قبوڵ بکەن کە ململانێیان لەگەڵدا بکات لەسەر دەسەڵات یان ڕای گشتی بکەنە دادوەرو سەنگی مەحەك ئەو ڕایەی کە وەهابیەکان هەمیشە تۆمەتباری دەکەن بەوەی پابەندی شەرع نییە... ڕاوێژ ئەما هەتا لە ناو تۆڕی پەیوەندییە ناوەخۆییەکان و لە ناو پیاوانی ئایینی، تەنانەت لە نێوان ئەوان و حوکمڕانان، لە نێوان هەردوو دەستەی ناوبراو و پێگەو بنچینە وەهابیەکان. لە جیاتی پەیوەندییەکان دامەزران لەسەر بنەمای هێزو خۆسەپاندن و زاڵ بوون. هەروەك پەیوەندی لە نێوان ئەوانە و دەستە و حیزبەکانی تر دامەزرا لە سەر بنچینەی بانگەواز کردنیان و جیهاد لەگەڵ کردنیان و سەپاندنی ڕاو بۆچوون بەسەریاندا بە زەبری هێز[1].

ئەحمەد حوصەین لە کتێبەکەیدا (دعوة الامام محمد بن عبدالوهاب سلفية لا وهابية) دەڵێ: " شێخ فەرمانی کرد بە جیهاد بۆ بەرگری کردن لە خۆ دژی ئەوانەی لەلایەك نارازین و لەلایەکی ترەوە بۆ لابردن و نەهێشتنی ئەو بەردەی کە بووەتە ڕێگر لەبەردەم بڵاوبوونەوەی بانگەوازی، بەم شێوەیە بانگەوازەکە چووە قۆناغێکی نوێیەوە کە بریتیە لە (قۆناغی بەرپاکردنی جیهاد بۆ ناچار کردنی خەڵك تا ملکەچ ببن بۆ حەق و ڕاستی) و ئامادەکردنی کەشێکی لەبار بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز و گێڕانەوەی موسڵمانان بۆ سەر

---

(١) بگەڕێوە بۆ پەیامەکەی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بۆ دانیشتووانی مەغریب، کە تیایدا بە ڕاشکاوانە دەڵێت: " هەر کەسێ وەڵامی بانگەوازەکەمان نەداتەوە بە بەڵگە ئەوا جەنگی لەگەڵ دەکەین بە شمشێر و ڕم". و ڕاوێژکار لە دیوانی پاشایەتی سعودیی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی ئالی شێخ پشتی ئەو هەڵوێستەی گرت، لە پێشەکی کتێبی (دعوة الامام سلفية لا وهابية).

بەرنامە و شەریعەتی خوای گەورە ... جا ئەرکی هێز بریتیە لە دابین کردنی ئاسایش و دڵنیایی بۆ ئەوانەی کە ئیسلامیان هەڵبژاردووە بە خوێن و سەروەت و سامانیان تا توشی ئاشوب و فیتنە نەبن لە دینیاندا، پاشان پاراستنی ڕێگەی بانگەواز تا بڵاوبوونەوەی ئیسلام نەوەستێت، لەهەمان کاتدا تەمبێ کردنی زۆردارانە ئەوانەی سیفەتی خوایەتی دەدەنە پاڵە خۆیان بەهۆیەشەوە مرۆڤ سەرشۆڕ دەکەن بەهۆی ئەو ڕق و کینەیەی لە دەروونیان دا دەچێت "[1].

حوصەین تیشك دەخاتە سەر کوشتاری ناوەخۆیی کە کۆتایی نایەت، لەو بارەوە دەڵێت: " جوڵان بۆ ئەوەی ئەوانی تر دەست بکەن بە بانگەواز کردن بۆ ئیسلام ئەوا لە تایبەتەندییەکانی ئەو دینەیە، چونکە لە سادە و ساویلکەییەوەیە کە مرۆڤێ تەصەور بکات توانایەکی زۆری هەیە بۆ هێنانە دەرەوەی خەڵکی لە تاریکایی بۆ ڕووناکایی، کەچی بوەستێت لە بەردەم کۆسپ و لەمپەڕەکانی دوژمنان تا جیهاد بەس بە زمان و ڕوونکردنەوە بکات، بێگومان هیچ یەکێ لە پێشینانی ئوممەت ئەمەی نەووتوە و ڕای وانەبووە "[2] ئەوەش زیاد دەکات: "جیهاد پێویستە بۆ ئەوەی کۆسپ و لەمپەڕەکان لەسەر ڕێگا لابدرێن، ئەمەش سوننەت و بەرنامەی خوای پایەبەرزە.... بەرژەوەندی گشتی خەڵکی دەستەبەر نابێت تا ئیسلام زاڵ نەبێ بەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان و نەبنە خاوەنی عەقیدەی ڕاست و بانگەوازی خوایی... ئەم دوورگەیە پێشتر و ئێستاش ئەو ڕەگەزانە لە خۆی دەگرێت کە لە ماوەیەکەوە

---

(١) الحصين: دعوة الامام سلفية لا وهابية ١٩٠.

(٢) الحصين: دعوة الامام سلفية لا وهابية ١٧٩.

بۆ ماوەیەکی تر دەردەکەوێت بۆ ئەوەی ئەو پەیامە ئەمرە بگەیەنێت و ڕۆڵی مێژووی خۆی بگێڕێ کە بەردەوام لە هەموو سەردەمێکدا نوێ دەبێتەوە "[1] .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وەهابیەت دەڕوانێتە (جیهاد) وەك چەکێك لە ململانێیە ناوەخۆییەکان لەگەڵ موسڵمانان ئەوانەی وەهابیەکان دان بە موسڵمانێتی ئەوان نانێن، تەنانەت (جیهاد) بەچەکێك دەزانن دژ بە دەستە و تاقم و کۆمەڵ و ئەو کەسایەتیانەی دژی ئەوانن، ئەمەش ڕێگرە لەوەی هیچ ماوەو کەلێنێ هەبێ بۆ دیموکراسی یان ڕێز گرتن لە ڕای بەرامبەر یاخود پەنابردنە بەر ڕاوێژ و داوەری کردن بە ڕای گشتی و بنەمای زۆرینە و ئاڵوگۆڕ کردنی دەسەڵات بە شێوەیەکی ئاشتیانە.

---

(١) الحصين: دعوة الامام سلفية لا وهابية ١٨٠

ئەو پرسیارەی خۆی دەخاتەڕوو ئەوەیە کە: ئایا بەڕاستی ڕژێمی سعودی پابەندە بە وەهابیەتەوە؟... ئایا وازی لێ نەهێناوەو گورزی لێ نەداوە؟ ئایا ئەو وەهابیەتەی پێیەوە پابەندە کاڵ بووەتەوە بەبێ ئەوەی بگۆڕێ بۆ دیموکراسی؟ و ئایا هەر کەسێ بە ناو و ناسنامە وەهابی بوو ئەوا بە تەواوی پابەندی دروشم و تێڕوانینەکانی وەهابیەتە؟ ئایا شێوەو دانەیەکی لە بەرگراو (نسخ)ێکی وەهابیەت نییە کە ڕازی ببێ بە بوونی بەرامبەر و ڕێز لە مەزهەبەکانی تر بگرێ؟ ئایا چەند بزوتنەوەیەك (ی وەهابی) نین کە بڕوایان هەبێ بە ڕاوێژ و قبوڵی دیموکراسیەت بکات و لێرەو لەوێ تیایدا بەژدار ببێت؟

بە ڕاستی لە دڵڕەقی ڕاستی و توێژینەوەی زانستیە کە بەیەك چاو و بەشێوەیەکی چەق بەستوو و نەگۆڕ سەیری کۆمەڵێ مرۆڤ یان بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بکرێت. چونکە دەکرێ لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر بگۆڕێ و بە بارودۆخی جیاوازدا گوزەر بکات و ڕابەرایەتی مرۆڤی جیاواز بکات، ئەوا شوێنکەوتوو و ڕابەرەکانی دەکرێ گۆڕانیان بەسەردا بێ لە نێوان نێوارەو بەیانیەکەی دا و بەم پێیە دەکرێ تێڕوانین و فیکرو هەڵوێستیان بگۆڕێت و گەشە بکەن بەرەو باشتر یان خراپتر. بزوتنەوەی وەهابیەت دوور نییە لەو واقیعە و داخراویش نیە لە هەمبەر پێشکەوتن و گەشە کردندا. لێرەوە لە ناو ڕیزەکانی وەهابیەتدا بەتایبەتی لە ناو ڕیزی شوێنکەوتووەکانی

چەند پێداچوونەوەو گەشە هاتە کایە، تەنانەت هەڵوێستی تاکەکانی جیاوازی تێکەوت لە هەمبەر لایەنگیری سیاسی و پاشکۆیەتی تەواو و یاخی بوون و ڕەخنە و دەرچوون. هەر لە میانەی ئەمەدا شتێکی چاوەڕوانکراو بوو لە دایك بوونی چەند کەس یان سەرکردە یان بزوتنەوەیەك ببینین کە هەڵدەستێ بە پێداچوونەوەی بنەماکانی بزوتنەوەی وەهابیەت و هەوڵی ڕزگار بوون دەدا لە کەلەپوری سەلەفی توندڕەو، بەتایبەتی لە بابەتی تەکفیر و کوشتار و پشت بەستن بە بنەمای هێز تێکشکاندن لە سەپاندنی ڕاو بۆچوون و دانانی ڕژێمی سیاسی و پایەدار کردنی حوکمڕانی دیاریکراو. ئەمە بە کردار ڕوویدا لەلایەن هەندێ زانا و سیاسەتمەدارە پاشکۆکان و هەندێ لە ئۆپۆزیسیۆن ئەوانەی کە هەڵسان بە ڕەخنەگرتن لە فیکری سیاسی وەهابی و دان نان بە موسڵمانێتی ئوممەتی ئیسلامی بە هەموو پێڕو دەستەو تاقمەکانی، تەنانەت پشت بەستن بە ئاشتی و دادپەروەری و ڕاوێژ لە هەڵبژاردنی حوکمڕان و ڕژێمی سیاسی.

هەر ئەمەیە کە بەدی دەکەین لە بزوتنەوە چاکسازییەکە، کە هەندێ لە کەسانی پسپۆڕ و نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامەنووس و زانایانی زانکۆ و بازرگان و وەزیرەکانی پێشوو پێی هەڵسان، کە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠ز سکاڵا و یاداشتنامەیەکیان دایە دەست شا فەهد، داوایان لێکردبوو کە چاوبخشێنێتەوە لە بارودۆخی سیستەمی بنەڕەتی و چاکسازییەکی گشتگیر ئەنجام بدرێت، دەستورێکیش دابنرێت کە ماف و ئەرکەکانی هاوڵاتیانی سعودی دیاری بکات، ئەنجومەنێکی ڕاوێژ دابمەزرێنێ کە خاوەنی دەسەڵاتی فراوان بێت، یەکسانی پەیڕەو بکرێ لە نێوان هاوڵاتیان بەبێ جیاوازی نەژادی و دەستەیی. دوای دوو مانگ لە ڕێکەوتەکە یاداشتنامەیەکی تریان دا بە شا فەهد کە داوا کرابوو بە:

" پێویستی پەلە کردن لە دانانی سیستەمێ بۆ حوکم و دەستورێکی هەمیشەیی بۆ وڵات و بڵاوکردنەوەی بەسەر خەڵکی دا بۆ ئەوەی هەڵەگیری بۆ بکەن و ڕەزامەندی لەسەر دەربڕن لە ڕاپرسییەکی گشتی دا " و " پێویستی تەواو کردنی پرۆژەی ئەنجومەنێکی دامەزراوەی هەڵبژێردراو لە هەموو ناوچەکانی شانیشینەکە، بۆ ئەوەی ببێتە دەستەی یاسادانان و چاودێری بە جێگەیاندنی مادەکانی دەستور "[1].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پێگەیشتنی دیموکراسیانەی دەستەیەکی ڕۆشنبیر و سیاسی لە سعودیەدا و دوورکەوتنەوەی لە گیانی بزوتنەوەی وەهابیەتی دەمارگیری داخراو.

شتێکی چاکە و بەسوودە کە هەڵوێستە بکەین لەسەر سێ نمونە لە دیمەنی ڕۆشنیری و سیاسی و گەشە کردوو لە بزوتنەوەی وەهابیەت، کە بریتین لە د. موحەمەد مەسعەری و شێخ حەسەنی مالکی و شێخ عەبدوڕەحمان عەبدولخالق.

---

(١) هەندێ لە ئەمیرە سعودییەکان لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا داوایان کردبوو کە چاکسازی دیموکراسیانە بکرێت، تەنانەت ڕێکخراوی (ئەمیرە ئازادیخوازەکان)یان پێك هێنا بە سەرۆکایەتی ئەمیر طەلالی کوڕی عەبدولعەزیز، ئەوەی کە جیابووەوە لە براکەی شا سعود دواتر لە شا فەیصەڵ. بەردەوام کوڕەکەی وەلید لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر داوا دەکات بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد و دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاوێژی هەڵبژێردراو، هەروەك لە گفتوگۆیەکی دا لەگەڵ ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) لە بەرواری ٢٠٠١/١٢/١١ بانگەشەی کرد بۆ جێبەجێ کردنی بنەمای هەڵبژاردن لە سعودییەدا و گۆڕانی دیموکراسی بکرێت لە ڕژێمی پاشایەتی دا.

### ا_ مەسعەری... بەرپاکردنی شۆرش دژ بە وەهابییەت

دەکرێ د.موحەممەدی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای مەسعەری، دیارترین نمونە بێت لەسەر گەشە سەندنی دیموکراسی لەناو ڕیزەکانی وەهابیەت دا، بەشێوەیەك کە لە کتێبەکەیدا (مشروعیة محاسبة الحكام) تیۆرێکی تەواوی خستۆتەڕوو لەبارەی سیستەمی ڕاوێژ، کە لە بنچینەدا و بەشێوەیەکی گشتی جیاوازە لە فیکری سیاسی وەهابی چ دەسەڵاتدار چ دژە دەسەڵات، بەتێرو تەسەلی دەدوێت لەسەر مافی ئوممەت لە ئاست دەسەڵات و ئەرکی ئوممەت لە هەڵسان بە ڕاست کردن و لێپرسینەوەو چاودێری کردن و لە سەر کار لابردن و لەسەر کاردانانی دەسەڵاتدار، بەڕاستەوخۆ مەسعەری تیۆری حوکم کردن بە زۆرە ملێی و زاڵبوون و خۆسەپاندن ڕەتدەکاتەوە، داوا دەکات بە هەڵبژاردنی دەسڵاتدار و بوونی دیاردەی فرە حزبی و دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاوێژ.

### دووبارە پێناسە کردنەوەی چەمکی (ئوممەتی ئیسلامی)

دەکرێ لە گرنگترین ئەو شتانەی کە لە پێشنیارەکەی مەسعەریدا هاتووە و لەناوەڕۆك دا جیاوازی هەیە لەگەڵ وەهابیەتی سەرەتا، بریتیە لەوەی کە ڕەخنە دەگرێت لە دیاردەی تەکفیری موسڵمانان و ڕەخنە لەوانە دەگرێت بانگەشەی ئەوە دەکەن هەر ئەوان لەسەر حەقن و موسڵمانانی تر ناحەقن، لەو میانەیەدا مەسعەری هەڵسا بە فراوان کردنی چەمکی (ئوممەت) کە هەر

هەموو دەستەو تاقم و پێڕی ئیسلامی بگرێتەوە کە دەستیان گرتووە بە قورئانی پیرۆزو سوننەتەوە بەشێوەیەك کە جەعفەری و زەیدی و ئیباضیش بگرێتەوە، بە پێچەوانەی فیکری وەهابی کە ئوممەتی پێناسە دەکرد بەوەی بریتین لە وەهابیەکان "یەکتاناسان" و بەس.

مەسعەری لەوبارەوە دەڵێت: " سەرتاپایی موسڵمانان بریتین لە تێکڕای ئەو دەستەو تاقم و کۆمەڵانەی کە ماونەتەوە بەشێوەیەکی گشتی لە سەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەر _صلوات الله و سلامه علیه و علی آله و اصحابه _ و هەر تێکڕای ئەم دەستەو تاقمانەش کۆمەڵەی ڕزگاربوو (الفرقة الناجیة) پێك دێنن _ بەویستی خوا _ کە مەزهەبە فیقهیەکانیش لەخۆ دەگرێت وەك مەزهەبی حەنەفی و مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و ظاهری و زەیدی و جەعفەری و ئیباضی و مەزهەبە فیقهیەکانی تریش کە لە ناوچوونە وەکو مەزهەبی ئەوزاعی، مەزهەبی ئیمام ئیسحاق کوڕی ڕاهویە و جگەلەوانیش، بەهەمان شێوە قوتابخانە کەلامییە جیا جیاکانیش لەخۆ دەگرێت وەکو قوتابخانەی فەرموودەناسان، و قوتابخانەی ئیبن تەیمیە، و قوتابخانەی ئیمام ئیبن حەزم و ئەشعەرییەکان و ماتوریدیەکان و کەلابیەکان و زەیدی و ئیباضی و جگەلەو قوتابخانانەش خەڵکانی تری ئەهلی قیبلەش لەخۆی دەگرێت و هەروەك تەریقەت و ڕێبازەکانی سۆفیەکانیش لەخۆ دەگرێت وەکو تەریقەتی شازلی و تەریقەتی نەقشبەندی و قادری و جەشتی و سوهرەوەردی و حەساق و جگەلەوانەش[1] و دەڵێت: " دروست نییە بۆ هیچ کۆمەڵ و دەستەو تاقمێك

(١) المسعری، محمد: مشروعیة محایبة الحکام، فصل: شبهات حول الجماعات الاسلامیة و حکم الانتماء.

لەوانەی ناوبراو کە بانگەشەی ئەوە بکات کە هەر ئەو بریتیە لە "کۆمەڵی موسڵمانان" کە دەق (نص) لەسەر پێویستی پابەندبوون پێی هاتوون و ئەوەی لێشی لابدات پەیمانی سزای پێدراوە و دەستەو تاقمەکانی تریش بە سەرگەردان و لەناوچوو حیساب بکات... ئەگەر یەکێك هات و گومانی ئەوەی بەخۆی برد کە هەر ئەو "کۆمەڵەی موسڵمانان" پێك دێنێت و خەڵکانی تریش بێ بەشن لەو ناسنامەیە ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە ئاژاوەگێڕە و ئومەتی ئیسلام پارچە پارچەو پەرتەوازە دەکات، دەچێتە خانەی ئەوانەی ئوممەت پارچە پارچە دەکەن و کەسێکی سەرگەردانە، چونکە کەسێك کە دەڵێت من یان کۆمەڵەکەم ئوممەتی موسڵمانان پێك دێنێت ئەوا پێویست دەبێت لەسەری کە دژەڕاکانی بە بیدعەتچی دابنێت یان تەکفیریان بکات، یان تاقیکردنەوەی خەڵکی بە دیدو تێڕوانینی دەستەیەك یان کۆمەڵێك و تەکفیر کردن و بە بیدعەتچی دانانی ئەوەی پێچەوانەی ئەو تێڕوانین و بۆچوونانە هەڵسوکەوت بکات، ئەمە بەڕاستی دلێریی و چاونەترسییەکی گێلانەیە، هەڵچوونێکی هەڵە و بێ سەروبەرە، دەمارگیرییەکی نەفامانە و ناژیرانەیە "[1].

مەسعەری دەڵێت: " هەر یەکێك لەو کۆمەڵە هاوچەرخانە بانگەشەی ئەوەی کرد .... کە کۆمەڵەکەی ئەو بریتیە لە کۆمەڵەی موسڵمانان و بەس... چونکە تەنها کۆمەڵەکەی ئەو "کۆمەڵەی ڕزگاربوو: الفرقة الناجية" یان "کۆمەڵەی سەرکەوتوو: فرقة المنصورة"ە یان کۆمەڵەکەی ئەو خاوەنی "عەقیدەی ڕاست و دروستە" و ئەو عەقیدەی قۆرخ کردووە.. زۆر دوور

---

(١) المسعري، محمد، مشروعية محاسبة الحكام، فصل: مفهوم جماعة المسلمين.

کەوتۆتەوە لە ڕاستی، ڕێگەی لەناوچووە خەواریجەکانی و خەڵکانی زیاد ڕۆچووی گرتۆتەبەر... "[1].

ئەو هەنگاوەی د. موحەممەد مەسعەری پێی هەڵسا لە دووبارە پێناسە کردنەوەی (ئوممەتی ئیسلامی) ئەوا بە شتێکی زۆر گرنگن دادەنرێت لە کرداری بنیادنانی دیموکراسی ئیسلامی لە کۆمەڵگای سعودییەدا، چونکە ڕێگا دەکاتەوە تا جەماوەر بەشێوەیەکی فراوان و بەرچاو بەژدار بێت لە کرداری سیاسی و لەو ڕێگایەشەوە لەو دەسەڵاتە قۆرخ کارە دەدرێت و قەڵاکەی درزی تێدەکەوێت کە خانەوادەی دەسەڵاتدار و دامەزراوەی دینی وەهابیەت و پشتیوانانی دەستیان بەسەردا گرتووە، دووبارە جەماوەری دەستە و پێڕە ئیسلامیە جۆراو جۆرە کەنارگیرە پەراوێز خراوەکان دەگەڕێنەوە ناو ژیانی سیاسی لە دەوڵەتی سعودییەی عەرەبی. ئەمەش کەش و هەوای سروشتی دەڕەخسێنێت تا دەربچن لە سیستەمی داپڵۆساندن و هێزو خۆسەپاندن و بچنە ناو سیستەمی ڕاوێژ کە بنیاد دەنرێت لەسەر ڕێز لە وشەی ئوممەت و یست و خواستەکانی. بۆیە ئەو هەنگاوە شۆرشێکە لە فیکری وەهابیدا کە ڕێگا دەکاتەوە لە بەردەم بوونی پەیوەندی سیاسی سروشتی و ئاشتی لە کۆمەڵگادا.

---

(١) المسعري، محمد: مشروعية محاسبة الحكام، فصل: الشبهة الثالثة: البيعة لا تكون الا على الامامة العظمى.

#### تیۆری ڕاویژ

خاڵی دووەم کە زۆر گرنگ و پڕ بایەخە و د. موحەمەد مەسعەری تیایدا بۆچوونی جیاوازە لەگەڵ فیکری سیاسی وەهابی، بریتیە لەوەی کە د. موحەمەد مەسعەری بڕوای هەیە بە تیۆری شوڕا و مافی ئوممەت لە دەسەڵات، ئەمەش بەپێچەوانەی تیۆری هێز و زاڵ بوون و خۆسەپاندن کە فیکرەی وەهابی وەك پاشماوە لە ئیبن تەیمیە وەری گرتووە، دواتر مەسعەری بڕوای وایە: " ئوممەت مافی ئەوەی هەیە کە حوکمڕان دابنێتە سەر کار و لەسەری لاببات ، دروست نیە حوکمڕانی خاوەن دەسەڵات کە ڕەفتار بە دەسەڵاتەکانی دەکات بەبێ بەیعەتی ئوممەت، دەبێت لەو بەیعەتەشدا هەموو تاکێکی موسڵمان سەرپشك و سەربەست بێت، دەسەڵاتدان بەخەلیفە لەلایەن ئوممەتەوە مانای وا نییە ئوممەت بەبێ دەسەڵات بمێنێتەوە، بەڵکو ئوممەت دەسەڵاتی هەیە تا لێپرسینەوە لەگەڵ حوکمڕانان بکات و ڕاستە ڕێیان بکات و ڕێگریان لێ بکات لە سەرکەشییان تا ئەو ئەندازەیەی کە دەگاتە سەر لە کار لابردنی حوکمڕان "[1].

مەسعەری هەڵدەستێت بە دیاریکردنی کاری سەرەکی حوکمڕان، لەوبارەوە دەڵێت: " بریتیە لە پاراستن و چاودێری کردنی کارەکانی ئوممەت، چونکە تەنها بۆ ئەو کارە ڕاسپێردراوە". دواتر مەسعەری قسە دەکات لەسەر لێپرسینەوەی ئوومەت کە ئەگەر حوکمڕان بەچاکی هەڵنەسا بەو پاراستن و چاودێرییە ئەوا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، " چونکە مانەوەی ئوممەتی

---

(١) المسعري، محمد: مشروعية محاسبة الحكام، فصل: مشروعية محاسبة الحكام.

پێوە بەندە " دەپرسێت: ئوممەت چۆن دەبێت بە شایەت و گەواهیدەر لەسەر خەڵکی کاتێك حوکمڕانەکەی دادپەروەر نەبێت.

مەسعەری جیاوازی ناکات لە پێویست بوونی لێپرسینەوەی لەگەڵ حوکمڕان دا چ موسڵمانان دەسەڵاتیان پێدا بێت و ڕایان سپارد بێت یان دوژمنان هێنا بێتیانە سەر حوکم یان خۆی بەزۆری سەپاند بێت، مەسعەری دەڵێت لێپرسینەوەی حوکمڕان لە کارە سەرەکییەکانە، با حوکم و دەسەڵاتی بە تۆپزی وەرگرتبێت بەبێ ئەوەی موسڵمانان پێیان دابێت.

مەسعەری دوای ئەوەی بنەما دادەنێت بۆ تیۆری ڕاوێژ و ڕەوایی لێپرسینەوەی حوکمڕان لەلایەن ئوممەتەوە دەچێتە سەر باسێکی تر ئەویش بریتیە لەو ڕێگایانەی کە دەبنە هۆی دەستەبەر کردنی ئەوەی ئوممەت هەڵسێت بەو ئەرکانەی خۆی، دەڵێت ئەو ڕێگایانە بریتین لە: پێکهێنانی دەستەو کۆمەڵەی سیاسی و حزبی سیاسی کە لە سەر بنەمای عەقیدەی ئیسلامی دادەمەزرێن. و موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی. ئەنجومەنی ڕاوێژ، کە مافی لێپرسینەوەی هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی حوکمڕانی هەیە. دادگای ماف خوراویەکان (المحکمة المظالم)، کە مافی دەرکردنی حوکمی لەسەر کار لابردنی خەلیفەی هەیە ئەگەر کەم و کورتی و کرج و کاڵی خزاندە ناو شەرعەوە[1].

دەڵێت: " هەڵسانی موسڵمانان بە ئەنجامدانی لێپرسینەوە لەگەڵ حوکمڕان، بنەمایەکی سەرەکییە لە بنەماکانی دەسەڵاتی ئوممەت، تا حوکمڕان پابەند بێت بە شەرعەوە، چونکە حوکمڕان هەڵدەستێت بە پاراستن و

---

(١) المسعری، محمد: مشروعیة محاسبة الحکام، فصل: مراقبة الأمة للحکام و محاسبتهم.

چاودێری کردنی کارەکانی بە ئەحکام و یاسا شەرعییەکان. ئوممەت حەقی ڕەهای هەیە لە لێپرسینەوەی حوکمڕان جا بەهەر هۆیەك ئەو لێپرسینەوەیە بێتە کایە چ بە قسەی نهێنی یان ئاشکرا یاخود بەڕەخنە گرتن لە کارەکانی و ئاشکراکردنی لە سەر مینبەرەکان یان دەکرێت ئەو لێپرسینەوەیە بە ڕێککاری و ڕێخراویی بێت بەشێوەك کە لێپرسینەوەکە خۆی ببینێتەوە لە دەرکردنی ڕۆژنامەی سیاسی یان بە پێکهێنانی حزبی سیاسی کە کاری سەرەکی لێپرسینەوەی حوکمڕان بێت، لەناو خودی ئەنجومەنی هەڵبژێردراو، بەتایبەتی ئەنجومەنی ئوممەت واتە ئەنجومەنی ڕاوێژ، یان دەرەوەی ئەنجومەن وەك کۆبوونەوەی جەماوەری[1].

دواتر د. مەسعەری دەچێتە سەر دروشم و قسەیەکی تر لە دروشمەکانی فیکرەی وەهابی دەست و پێوەندی دەسەڵات، ئەویش بریتیە لە (ئامۆژگاری نهێنی) کە زانایانی دەوڵەتی سعودییە جەختی لەسەر دەکەنەوە بەپشت بەستن بە تاکە فەرموودەیەك کە ئیمامی ئەحمەد تەخریجی کردووە لە عیاضی کوری غەنم لە پێغەمبەری خواوە ~ کە فەرموویەتی: " هەر کەسێك ویستی کە ئامۆژگاری حوکمڕان بکات لەسەر کارێك، ئەوا با بەئاشکرا پێی ڕای نەگەیەنێت بەڵکو با دەستی بگرێت و لە شوێنێکی چۆڵ و تەنها دا ئامۆژگاری بکات جا ئەگەر حوکمڕان ئامۆژگارییەکەی لێ قبوڵ کرد، ئەوە تەواو، ئەگەر قبوڵی نەکرد، ئەوا ئەو ئەرکەی کە لەسەر شانیەتی بەجێی گەیاندووە "، مەسعەری ئەو قسەیە ڕەتدەکاتەوەو ئەو فەرموودەیە بە لاواز دادەنێت[2].

---

(١) المسعری، محمد: مشروعية محاسبة الحكام، فصل: مراقبة الأمة للحكام و محاسبتها لهم.

(٢) المسعری، محمد: مشروعية محاسبة الحكام، فصل: سرية النصيحة.

## ٢_ مالکی... تەکفیر ڕەتدەکاتەوە

شێخ حەسەنی کوڕی فەرحانی مالکی پشتگیری ئەو شۆڕشەی کرد کە کار بۆ ڕاست کردنەوە دەکات، ئەمەش لە میانەی ئەو ڕەخنانەدا کە لە کتێبەکانی دا ئاراستەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەکات بەوەی تێکڕایی موسڵمانان تەکفیر دەکات، مالکی داوای میانڕەوی دەکات.

حەسەنی کوڕی فەرحانی مالکی هەڵسا بە پێداچوونەوەیەکی فراوان بۆ خوێندنەوەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و تەئویلاتەکانی[1] بۆ زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و چەمکی شیرك و هاوبەشدانان و

---

(١) چەمك و واتای وشەی تەئویل:(وشەی تەئویل لە ئەصلی زمانی عەرەبی دا لە :(آل، یؤل، مآلاً، و تأولا) هاتووە، واتە:(رجع، یرجع، مَرْجعا) وشەی (مَرْجع) واتە: ئەو شوێنەی کە ئینسان بۆی دەگەڕێتەوە (مآل)یش هەر بەو مانایە دێت. وشەی تەئویل لەزمانی عەرەبی دا سێ واتا دەگەیەنێت: یەکەم: بە ئاکام و سەرەنجام (العقبة و المآل) پەروەردگار بەم واتایەی بەکارهێناوە ﴿ هل ينظرون الا تأويله... ﴾ الأعراف: ٥٢. واتە: ئایا کافرەکان چاوەڕێی چی دەکەن هەر چاوەڕێی ئەوە ناکەن کە ئاکام و سەرەنجامی ئەوەی قورئان دەفەرمووێ بێ!. دووەم: بەمانای لێکدانەوەو تەفسیر کردن دێت وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ﴿... وما يعلم تأويله الا الله ...﴾ آل عمران : ٧. واتە: تەفسیرو لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە تەنیا خوا دەیزانێ. سێیەم: واتای تەئویل بریتیەلە: لادانی وشەیەك لەمانای ڕواڵەتی یان حەقیقی خۆی بۆ مانایەکی پەنهان یاخود مەجازی لەبەر بەڵگەیەك کە ڕێگەمان نادات ئەو وشەیە بە مانای حەقیقییەکەی یاخود بەمانای ڕواڵەتیەکەی بەکاربێنین، وەك خوای کاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿... وما يعلم تأويله الا الله و الرّاسخون في العلم...﴾ آل عمران : ٧. دەگونجێ ووشەی تەئویل لێرەدا بەو مانایەی سێیەمیشیان بێت ). سەیری: ( ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا: م. عەلی باپیر، بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لەناو و سیفەت و پەرستراوێتی دا ١٥٥_١٦١) بکە. (وەرگێڕ).

یەکتاناسی و خوا بەیەکزانین، بەتایبەتی بابەتی زیاد ڕۆچوون لە پیاوچاکان و هاوار کردنیان و داوا کردنی شەفاعەت لێیان، ڕەتی کردۆتەوە کە شیرك بێت چ جای شیرکی گەورەی دەرخەر لە ئوممەتی ئیسلامی، لە کتێبەکەی خۆشیدا جیاوازی کردووە لە: (موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بانگخوازە و پێغەمبەر نییە) [1] لە نێوان بتپەرستی کە هاوبەشدانەران دەیکەن و زیاد ڕۆچوون لە پیاوچاکان دا کە دەکرێ هەندێ لە موسڵمانان تووشی ببن، ئەو بۆچوونەشی ڕەت کردۆتەوە کە شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب هەیبووە کە خوای پاك و بەرز پێغەمبەرەکانی ناردبێت بۆ گەلانێك کە زیاد ڕۆچووبن لە پیاوچاکان دا، دواتر تەکفیری موسڵمانانی ڕەت کردۆتەوە بەڕەهایی کەچی وەهابیەت لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە و مالکی وتویەتی: " زیاد ڕۆچوون و تەبەڕوك کردن بە پیاوچاکان دەکرێت بە زیادەڕەوی دابنرێت.... بەڵام ئەو جۆرە ڕەفتارانە و هاوێنەکانیان دەکرێت بە هەڵە یان بیدعەت دابنرێن نەوەك بە شیرك، ئەگەر گریمان بە دروستیشمان زانی بۆ ئەو جۆرە ڕەفتارانە چەمکی شیرك بەکار بهێنین ئەوا ئەو جۆرە ڕەفتارانە دەچنە خانەی شیرکی بچوك نەوەك شیرکی گەورەی دەرخەر لە ئوممەت ". و وتویەتی: " کە ئەو بیدعەت و خوڕافیاتانە یان ئەو شتە شیرکیانە بەناپەسەند دەزانم یان کە هەندێکیان بە ناپەسەند دەزانم ئەوا هانم نادات حوکمی شیرك و دەرچوون لە ئیسلام بدەم بەسەر بکەرەکەیدا جا بکەرەکەی چ نەزان یان زانا بێت، چونکە کەسی نەزان نەزانیەکەی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی تەکفیری بکەم و کەسی

---

(١) شایەنی ئاژە پێدانە کە هەڵساوم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە ئەستۆ گرت و ئێستاش کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران. (وەرگێڕ).

زاناش تەئویلەکەی دەبێتە ڕێگر لەوەی تەکفیری بکەین بەهەمان شێوە[1]. بەڵێ بەڵێ دەکرێ بووترێ فڵانە سەرگەردانە، فڵانە بیدعەتچییە، فیسارە لاسارو لەڕێگە دەرچووە... ئەو تۆمەتە ترسناکییەکەی کەمە، بەڵام بڵێین: فڵانە بێ باوەڕە بە کوفرێکی گەورە دەرخەر لە ئیسلام! ئەمە حوکمێکی گەورەیە لە شتە گەورەکان کە چەندین حوکم و ستەم و ماف خواردنی لەسەر کەڵەکە دەبن؛ دروست نییە یەکێك تۆمەتبار بکەین بە کوفر تەنها بە بەڵگەیەکی دیار نەبێت لەوەی کە خوای گەورە بەڵگەی لەسەر دابەزاند بێت؛ بەتایبەت شێخ موحەمەد کە وشەی کوفر بەبێ مەرج دەردەبڕێت مەبەستی کوفری گەورەی دەرخەرە لە ئوممەتی ئیسلام !".

شێخ حەسەنی کوڕی فەرحانی مالکی داوا لە وەهابییەکان دەکات بەڕێز گرتن لە بەڵگەو تەئویلاتەکانی دژەڕاکانیان ئەوانەی کە تەوەسول و داوای شەفاعەت و هاوار کردنی پیاوچاکان بە دروست دەزانن و بە دژو پێچەوانەی شایەتمان و یەکتاناسی نازانن و گومان نەبوون لە بەرامبەر نیەت و مەبەستی ئەوانی تر.

لەسەر ئەمە شێخ حەسەن مالکی داوا دەکات بۆ ئەوەی دووبارە پێناسەی (موسڵمان) و (خوا بەیەکزان و یەکتاناس) بکرێتەوە تا دوور بکەوینەوە لە تەسك کردنەوەی بازنەی ئیسلام و موسڵمانان تا بە تەنها کورت نەبێتەوە لە وەهابییەکان و بەس، دەڵێت: " بێگومان ئەگەر شێخ موحەمەدی ڕەحمەتی خوای لێبێت جەنگی نەکردبایە لەگەڵ موسڵمانان، تەنها هەڵسابایە پەیوەندی

---

(١) پێویستە ڕەچاوی ئەو بنەمایە بکرێت لەکاتی حوکم دان بەسەر کەسەکاندا (ثبوت الشروط و انتفاء الموانع) واتە: هاتنەجێی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان. (وەرگێڕ).

بەستبایە لەگەڵ زانایان دا و هانی دابان لەسەر بانگەوازی کردن بۆ لای خوا؛ ئەگەر ئەوەی بکردایە ئەوا لەوانەیە دوور کەوتبایینەوە لە کارەساتی تەکفیر هەر لەسەردەمی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابەوە تا ئەو چەرخی ئێستامان کە ئەوانەی هەڵدەستن بەتەکفیر پشت دەبەستن بە فەتواکانی شێخ و زانایانی بانگەوازی وەهابیەت لە تەکفیر کردنی موسڵمانان دا ". ئەو چەند قسەیەش زیاد دەکات: " ڕوونکردنەوەی هەڵەکانی شێخ موحەممەد لەو بوارەدا (بواری تەکفیر) سوودبەخش و پێویستە، چونکە کۆمەڵگەی سعودی بە زاناکانی و زانستخوازەکانی پێگەیشتوون لەسەر فەتواکانی شێخ و زانایانی بانگەوازی وەهابیەت ئەوانەی ویستیان لەسەر تەکفیر کردنی موسڵمانان بووە، شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەندێکیان بەو لایەنە کاریگەر دەبن، فەتوای هەندێك لەوانەمان بینی کە حوکمیان داوە بە هەڵگەڕانەوەی هەندێ لە خەڵکی، هەر کەسێك کتێبی (الدرر السنیة) بخوێنێتەوە چاك ئەمە دەزانێت، تەنانەت لەو کتابەدا دوو بەرگ هەن بەناونیشانی تێکۆشان (الجهاد)، کە هەردوو بەرگەکەی لەسەر جیهاد کردنە لەگەڵ موسڵمانان، تەنانەت یەك پیتیش لەو دوو بەرگەدا نیە لەبارەی جیهاد کردن لەگەڵ بێ باوەڕە ڕەسەنەکان کە بریتین لە جولەکە و مەسیحی، لەگەڵ ئەوەی وڵاتانی موسڵمانانی دراوسێ لە خەلیج و عێراق و شام بێ باوەڕی ڕەسەنی داگیر کەر هەبوون... لە نێوان خودی وەهابیەکان زانایان خۆبەخۆیان یەکتریان تەکفیر کرد کاتێك کوڕەکانی ئەمیر فەیصەڵی کوڕی تورکی ( عەبدوڵڵا و سعود ) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دژایەتی کەوتە نێوانیان، لەگەڵ هەر ئەمیرێکدا کۆمەڵێ زانا هەبوون کە کۆمەڵەکەی تریان تەکفیر دەکرد، ئەو (گەڕەلاوژێیە

تەکفیرییە) بریتیە لە دەرئەنجامی سروشتی بەرنامەو پەیڕەوی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ڕەحمەتی خوای لێبێت کە هەڵسا بە فراوان کردنی بازنەی تەکفیر؛ تا وای لێهات هەر کۆمەڵێك ئەوەی لە قسەکانی شێخدا بەدەستکەوت کە پشتگیری تێڕوانینەکەی خۆی پێ بکات. بەڵکو بزوتنەوەکەی (حەڕەم) و ئەوانەی تەقینەوەکەیان کرد لە (العلیا) ئەوانە گشتیان تەنها دەرئەنجامێکن بۆ پەیڕەوی شێخ لە تەکفیر".

شێخ حەسەن مالکی ڕەخنە لە بەرنامەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەگرێت لە تەکفیر دا و دەڵێت: " ئەوە لە قسەی شێخ موحەممەد بەدەر دەکەوێت کە ئەگەر ڕووداوێکی زانیبایە لە (حیجاز) یان (عەسیر) یان (سەدیر) ئەوا ڕاستەوخۆ ڕووداوەکەی دەگشتاند لەسەر خەڵکی تێکڕای شوێنەکە ئینجا خەڵکەکەی تەکفیر دەکرد و جەنگی لەگەڵ دەکردن. ئەگەر ئاگاداری ڕوودانی چەند شتێك بووبایە لەشوێنێك ئەوا تێکڕایی خەڵکەکەی بە هەڵگەڕاوە دەزانی و خوێن و سەرو ماڵی ئەوانی بە حەڵاڵ دەزانی، بەو بەڵگەیەی کە خەڵکی شوێنەکە دابەش بوون بۆ دوو بەش بێ دەنگ و هەڵگەڕاوە! تاوانکارەکە هەڵگەڕاوەیە و بێ دەنگ بووەکەش هەڵگەڕاوەیە! ئەمە تەواو جیایە لەوەی کە زانایان باسیان کردووە لەژێر ناونیشانی (حوکمی هەڵگەڕاوە)، چونکە زانایان بەهۆی ڕەفتاری چەند کەسێك حوکم بەسەر تێکڕایی خەڵکی دا نادرێت، بەڵکو هەندێ لەو زانایانە کە ئەوەش دەڵێن تەنها بۆ ترساندن و ئاگادارییە لە شتێك، بەڵام لەکاتی بوونی پاساو بەهۆی نەزانی و ئەوەی بۆ ڕوون بکرێتەوە کە ئەو نەزانینەی نەمێنێ و لابچێت.

شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب نەزانی لەبەرچاو نەگرتووە، چونکە نەزانینی شتێك ڕێگرە لەوەی کەسی نەزانەکە تەکفیر بکرێت، لەسەر بەرنامەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دروستە کە ئەو زانایانەی دژەڕای یەکترن تەکفیری یەکتری بکەن بەو بەڵگەیەی کە ئەوەی تر نکۆڵی دەکات لە بەشێك لەو پەیامەی پێغەمبەر ~ هێناویەتی! ئەمە وەك ئەوە وایە کە بەشێوەیەکی گشتی پێغەمبەر ~ بە درۆزن بزانێت! و بەوشێوەیە... کەچی ڕاستی لەمەدا نییە، چونکە هیچ یەکێك لەلایەنەکان دانانێت بەوەی کە ئەو نکۆڵی دەکات لە بەشێك لەو شتانەی پێغەمبەر ~ هێناویەتی، بەڵکو پێت دەڵێت: ئەوە لەلای من نەچەسپاوە یان دەڵێت: واتاکەی بەوشێوەیەیە یان فڵانە شتە دژیەتی... تاد ".

شێخ حەسەن مالکی لەو خاڵەدا ناوەستێت کە ڕەخنەگرتنە لە زیاد ڕۆچوونی وەهابیەت بەڵکو بە قوڵی ڕوودەچێت لە مێژوودا تا ڕەخنە بگرێت لە دیاردەی تەکفیرو بەبیدعەتچی دانان لەلایەن موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی و حەنبەلیەکان بەشێوەیەکی تایبەتی، لەوبارەوە دەڵێت: ئەوانەی ململانێی عەقیدەییان دەکرد بنەماکانی ئیسلامیان لە بیر کرد لەکاتی دەمەقاڵێ و تێکگیرانیان و ئەهلی سوننە کە خوی دەبینێتەوە لە حەنبەلی و ئەشعەری و جگەلەوانیش سەلامەت نەبوون لە خلیسکان لەبواری تەکفیرو بەبیدعەتچی دانان و هاووێنەکانیان تا کار گەیشتە ئەوەی تەکفیری گەورە پێشەواکان و شەرعزانەکانی سوننە کرا چ جای ئەوانی تر، وەك ئەوەی حەنبەلییەکان هەڵسان بەتەکفیر کردنی ئەبی حەنیفە و حەنەفیەت و سەرزەنشت کردنیان و بەبیدعەتچی دانانیان. دەڵێت: ئەو فیکرەی حەنبەلیە زیاد ڕۆچووەکان بوو کە

بووه هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەو دەستە و تەیارە تەبدیعیە ئاژاوەچیە هەراو هۆریا بنێتەوە و موسڵمان کەڕ بکات بە بیدعەت و سەرکەشی. حەنبەلییە زیاد ڕۆچووەکان زۆربەی دەستەو تاقمی موسڵمانانی تەکفیر کرد وەك موعتەزیلە و شیعە و قەدەری و موڕجیئە و جەهەمی و جگەلەوانیش.

مالکی ئەو کارەی ئەبی حەسەن بەربهاری ئیمامی حەنبەلیەکان لە سەردەمی خۆی (لە ساڵی ٣٢٩ك مردووە) بەناپەسەند زانی کە هەڵسا بە تەکفیر کردنی موسڵمانان، ئەو قسەیەشی بەناپەسەند زانی کە وتبوی: (بزانن ئیسلام سوننەیە و سوننەش ئیسلامە) چونکە ئەم قسەیە ئەوە پێویست دەکات کە هەر کەسێك سوننی نەبێت موسڵمان نیە!! و بەهەمان شێوە ئەو کارەی ئیبن تەیمیەشی بەناپەسند داناوە کە زۆر جیاوازی کردووە لەنێوان خوا بەیەکزانین لە پەروەردگارێتی دا و خوا بەیەکزانین لە پەرستندا، ئەو قسەیەی ئیبن تەیمیە کە دەڵێت:(خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردووە تەنها لە پێناو خوا بەیەکزانین بووە لە پەرستندا بەڵام بێ باوەڕان دانیانناوە بە خوا بەیەکزانین لە پەروەردگارێتی دا ) و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بوێری دا بە شوێنکەوتووانی کە تەکفیری موسڵمانان بکەن و ئەو شوێنکەوتووانە هەڵەیان کەوتە ناو عەقیدەکەیان. بەهۆی ئەو جۆرە دابەش کردنە لەبواری عەقیدەدا چەندین زانا بەهەڵەداچوون و پێیان خلیسکا هەڵسان بە تەکفیری موسڵمانان بەهۆی چەند هەڵەیەکی عەقیدەیی و هەڵسان بە بەراورد کردنی موسڵمانان بە بێ باوەڕان و ئەو شایەتمانە (أن لا اله الا الله و أن محمدا رسول الله: هیچ خوایەك نییە بەحەق شایەنی پەرستن بێت و

پێغەمبەر موحەممەد نێردراوی خوایە) کە موسڵمان دەیهێنێت دادی نەدا و نەبووە هۆی پاراستنی لەلای ئەو جۆرە زانایانە.

دواتر مالکی هەڵوەستە لەسەر ئیبن قەیم لەسەر ئەوەی کە (موعەطلە)کان تەکفیر دەکات ئەوانەی سیفاتی خوای پاك و بەرز تەئویل دەکەن، کە بریتین لە زۆربەی موسڵمانان وەك موعتەزیلە و ئەشعەری و شیعە و سۆفی جگەلە حەنبەلییەکان، لە کۆتاییدا مالکی دەدوێت لەسەر ئەو خۆبەخۆ تەکفیری یەکتر کردنەی کە لەناو بزوتنەوەی سەلەفیەتدا هەیە[1].

ئەگەرچی تا ئێستا شێخ حەسەن مالکی نەدوابێت لەسەر ڕاوێژ و دیموکراسی، ئەوا ڕەتکردنەوەی دیاردەی تەکفیر و داوای گۆڕانکاریی کردن و فرێدانی فیکرەی وەهابیەت لەناو سعودییە ئەوە خۆی لەخۆیدا بنەمای سەرەکی پێك دێنێت بۆ بنیادنانی پەیوەندییەکی سەلامەت لە نێوان حوکمڕان و خەڵك و چەسپاندنی بنەماکانی ڕاوێژ لە کۆمەڵگادا.

---

(١) المالكي، حسن، قراءة في كتب العقائد، المذهب الحنبلي نموذجا، فصل، التكفير والتبديع في كتب الحنابلة. لە پێگەی مالکی وەرم گرتووە بەو ناونیشانەی خوارەوە:
http://www.almalky.net/graa_fi_al3gaid.htm

### ٣_ شێخ عەبدولڕەحمان عەبدولخالق بڕوای بە ڕاوێژ هەیە

ناوبراو سەرکردەی (بزوتنەوەی سەلەفیە لە کومیت) لەلایەن شێخ (عبدالعزیز بن باز)ی خوێندووە لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی منەوەرە. بەڵام سەرباری ئەمە گەشەیەکی زۆر بەشێخ عەبدولخالقەوە دیارە بەئاراستەی ڕاوێژدا، ئەمەش دوای ئەوەی خۆی ڕزگار کرد لە کۆت و بەندی دروشمە سەرەکیەکانی وەهابیەت (وەك تەکفیر و کۆچ کردن و تێکۆشان و جیهاد) ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ڕێبدات بە بزوتنەوەی سەلەفیەت بەژداربێت لە پرۆسەی دیموکراسی لە کومیت.

شێخ عەبدولخاق ڕایگەیاند کە بڕوایەکی پتەوی هەیە بە بنەمای ڕوایژی ئیسلامی ڕەسەن و وتی: " ڕاوێژ بریتیە لە تاکە سیستەمی ئیسلامی کە تەنها لەو ڕێگەیەوە ئیمام یان حوکمڕان یان ئەمیر یان خەلیفە یان هەر ناوێك کە حەزمان لێیەتی لێی بنێن دادەنرێت و دەسەڵاتی ڕادەست دەکرێت. جگەلە ڕاوێژ هیج ڕێگەیکی تری سەلامەت نییە بۆ گەیشتن بەو پلەو پایە ترسناکە گەورەیە، کە ئیمامەتی گشتی موسڵمانانە. بنەمای سەرەکی لە بارودۆخی ئاسایی دا بۆ دیاریکردنی حوکمڕان بریتیە لە ڕاوێژ و هیج ڕێگەیەکی تر نییە "[1]. و شێخ عەبولڕەحمان عەبدولخالق کە دەیڕوانیە ڕەوایی چوونە ناو ژیانی دیموکراسی و ئەنجومەنی یاسادانان پشتی بەست بە فەتوایەکی شێخ (عبدالزیز بن باز)، کە تیایدا دەڵێت: "گوناە لەومدا نییە کە هەوڵبدرێت بۆ گەیشتن بە

(١)عبدالرحمن عبدالخالق، الشوری في ظل نظام الحکم الاسلامي ٢٣ _ ٢٤.

ئەنجومەنی جەماوەر(پەرلەمان[1]) ئەگەر مەبەست لەوەدا پشتیوانی ڕاستی و حەق بێت و ڕەتکردنەوەی باتیل و ناحەق، چونکە ئەمە سەرخستنی حەقە، چونە پاڵ بانگخوازانە بۆ لای خوا. هەروەك گوناه لە بەکارهێنانی ئەو پسولەو بلیتانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ دەنگدان و هەڵبژاردنی بانگخوازانی پیاوچاك و پشتگیری کردنی حەق و حەق بێژان، تەنها خوای گەورە سەرخەرە "[2].

شێوازی بەهێز خۆسەپاندن و دەسەڵات وەك ڕێگا بۆ گەیشتن بە کورسی دەسەڵات ڕەت کردەوەو وتویەتی زانایانی سیاسی لە موسڵمانان کە ئەو شێوازەیان قبوڵ کردووە بەدرێژایی مێژوو مانای وا نییە دانیان بەو شێوازەدا ناوە وەك بنەما بەڵکو خۆبەدەستەوەدان بووە بۆ بارودۆخی ڕیزپەڕو تایبەت لە میانەی (هەڵبژاردنی سوکترین زەرەر) نەوەك بەدەرچوون دژبە حوکمڕانی خۆسەپێن تووشی زەرەر و زیان ببن زیاتر لەو زیانەی کە پێیان دەکەوێت لەکاتی تەسلیم بوون بەبارودۆخەکە. و جەختی کردەوە خۆسەپاندن و خۆزاڵ کردن بەهۆی هێزو تواناوە بەشەرع ڕەتکراوەیە. و دروست نییە باردۆخی مێژوویی بکرێتە بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر ڕەوایی حوکمەتی زاڵبوو و خۆسەپێن[3].

وتویەتی: ئیمام لە ئیسلامدا بەرپرسە لە بەرامبەر خوای گەورەو ئوممەتدا، حوکمڕانی ڕەها نییە کە پرسیار کردن لە کارەکانی قەدەغە بێت، بەڵکو پرسیاری لێ دەکرێت و پێداچوونەوەو گفتوگۆی[4] لەگەڵ دەکرێت و

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ١٧.

(٣) عبدالرحمن عبدالخالق، الشورى في ظل نظام الحكم الاسلامي ٢٣ _ ٢٤.

(٤) عبدالرحمن عبدالخالق، الشورى في ظل نظام الحكم الاسلامي ٢٢.

تەنانەت گرنگترین کاری داناوە بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژ ئەویش چاودێری حوکمڕانە.

سەرکردەی بزوتنەوەی سەلەفی لە کومیت ئاماژەی داوە بۆ بابەتێکی زۆر گرنگ ئەویش بریتیە لەوەی کە حوکمڕان جێگری ئوممەتە لە جێبەجێ کردنی حوکمی خوای گەورە نەوەك جێگری خوای گەورە بێت، ئوممەت هەڵی دەبژێرێت و لاشی دەبات، ئوممەت ڕاستی دەکاتەوە ئەگەر تووند بوو، کە هەڵەی کرد بۆی ڕاست دەکاتەوە[1].

شێخ عەبدولڕەحمان عەبدولخالق ڕەخنەی گرت لە گەورەترین لادانی سیاسی کە لە مێژووی موسڵماناندا ڕوویدا کە بووە هۆی ئەوەی مافی ئوممەت لە ڕاوێژدا وەدەرنرا، ئەویش بریتیە لەوەی کە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان هەڵسا بە دانانی کوڕەکەی یەزید وەك خەلیفە لەدوای خۆی. و وتویەتی: "مەسەلەی ڕاوێژ لە ئیسلامدا لە ترسناکترین و گەورەترینی مەسەلەکانە، چونکە گرنگترین هۆکارە لە ئاسان کردنی کاروباری موسڵمانان و وێنە کردنی سیاسەتەکانیان و یەکەم بنەما بوو کە لە سیستەمی حوکمی ئیسلامی دابڕا و لادرا هەروەك حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لیبێت) وتویەتی: " دوو کەس ئەو ئوممەتەی خراپ و گەندەڵ کرد: یەکەم: عەمری کوڕی عاص کاتێك پێشنیاری کرد بۆ موعاویە کە قورئانی پیرۆز بەرزبکاتەوە، دووەم: موغەیرەی کوڕی شوعبە کاتێك پێشنیاری کرد بۆ موعاویە بەیعەت بە یەزید بدات، ئەگەر ئەمە نەبووایە ئەوا سیستەمی ڕاوێژ بەردەوام دەبوو تا دوارۆژ "(تأريخ الخلفاء للسيوطي ٧٩)، بۆیە حوکمی ڕاوێژ بە لەکارکەوتووی مایەوە لە سایەی سیستەمە ئیسلامیە یەك بەدوای یەك هاتووەکان مەگەر تەنها چەند

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، الشورى في ظل نظام الحكم الاسلامي ٣٤ _ ٣٥.

تروسکاییەکی زۆر کەم نەبێت لە ڕاوێژ جێبەجێ دەکرا بەڵام بەشێوەکی لاوەکی و بێ بایەخ. بەوهۆیەشەوە بوو کە سیستەمی حوکم گەندەڵ بوون و بەپێی ئارەزوو و خۆسەپاندنە بەڕێوەچوو تا وای لێهات موسڵمانان لەگەڵ ئەو گەندەڵی و خۆسەپاندنە ڕاهاتن، بەپێی تێپەڕبوونی کات وا گومانیان برد کە ئەو ئارەزووبازی و خۆسەپاندن بەشێکە لە خودی سیستەمی ئیسلامی و شەریعەتی پەروەدگاری جیهانیان "[1].

سەرباری ئەوەی کە عەبدولخالق دیموکراسی بە سیستەمێکی ڕۆژئاوایی سەپێنراو لەلایەن داگیرکارەکان بەسەر موسڵمانان دەزانێ[2]. هەروەها بەسیستەمێکی نا ئیسلامی و بە دژو پێچەوانەی ئیسلامی دەزانێت لە تایبەتترین تایبەتمەندییەکانی، لە گەورەترین بنچینەکانی ئەویش بریتیە لە دەسەڵاتداریی، چونکە دیموکراسی حوکم دەداتە دەست جەماوەرو گەل و گەل دەکاتە سەرچاوەی تێکڕایی دەسەڵاتەکان[3]. ئەمەش بەتەواوی پێچەوانەی سیستەمی ئیسلامییە کە دەسەڵاتداریی و حوکم تەنها بۆ خوای پاك و بەرز دەزانێ[4] و تێکەڵ کردنی ئیسلام و دیموکراسی بەجۆرێك لە جۆرەکان شیرك و هاوبەشدانان دادەنرێت[5]. بەڵام شێخ عەبدولڕەحمان عەبدولخالق بەدروستی زانیوە کە پۆست و پلەی یاسادانان و جێبەجێ کردن وەربگیرێت لە سایەی سیستەمی دیموکراسی و خۆدوور گرتنی لەو پۆستانە ڕەت کردۆتەوە" بە هیوای گۆڕینی سیستەمی گەندەڵ و خراپە لە ناوەوەو گۆڕینی و کەم

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، الشورى في ظل نظام الحكم الاسلامي ١.

(٢) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ١.

(٣) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ٣.

(٤) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ٢.

(٥) عبدالرحمن عبدالخالق، الحد الفاصل بين الاسلام والكفر ٣١.

کردنەوەی خراپ و ناشرینەکانی و لادانی ئەوانەی بێ دینن و ئارەزوو و هەواو هەوەس پەرستن و پۆستەکان داگیر دەکەن و کاری موسڵمانان دەگرنە دەست... چۆڵ نەکردنی گۆڕەپانەکە بۆیان تا بەکەیفی خۆیان ویستی ئوممەت لە ئاراستەی خۆ لا نەدەن، تا ئەوجۆرە کەسانە نەگەن بە سوکانەی حوکم و دەست بەسەر تواناکانی ئوممەت دانەگرن و خوێن و شەرەف و دین و ڕێزیان بۆ خۆیان حەڵاڵ نەکەن "[1].

پێویست بوو لەسەر شێخ عەبدولخالق لەکاتێکدا لە کومیت نقومی ژیانی دیموکراسی بووە ئەو بنەمایە ڕەت بکاتەوە کە لە بنەمای زیاد ڕۆچووەکانە _ هەروەك دەڵێت _ کە بریتیە لە تەکفیر کردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و تێکڕای حوکمڕانەکانی و بە حەڕام زانینی پۆستە گشتیەکان یاسادانان و جێبەجێ کردن و جگەلەوانە[2].

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ٣٣.

(٢) دەڵێت: " ئەوەی بەڵگەیە لەسەر خراپی ئەو بۆچوونەی کە پۆستە گشتیەکان (وەزارەت و ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانان و هاوێنەکانی) بە حەڕام دەزانێت لە سایەی سیستەمە هەنوکەییەکان بەڕاستی ئەم بۆچوونە بۆچوونی کەسانی زیاد ڕۆچوو و ئەو کۆمەڵەیە کە تەکفیری کۆمەڵگا دەکات و ئەو بۆچوونە هەر لەسەرەتاوە بیسترا و بڵاوبووەوە و چەند کەسێك پێی هەڵخەڵتان و پێی لەخۆبایی بوون، بەپێی ئەوەی من دەزانم کۆمەڵەکەی شوکری موستەفا یەکەم کۆمەڵە بوو کە هەڵسا بە دەرکردنی حوکمی ئەوەی کە دروست نییە هیچ پۆستێکی گشتی یان تایبەتی لە حوکمەتە هاوچەرخەکان وەربگیرێت و لەم فەتوایەشیاندا پشتیان بەستووە بە عەقیدەکەیان کە کۆمەڵگا و حوکمڕانەکان بە تێکڕایی تەکفیر دەکات، جا پۆست لەلای ئەو کۆمەڵەیە جیاوازی نیە چ پۆستی وەزارەت بێت یان ئیمامەتی نوێژ یان جگەلەمە. یەکێکیان دەڵێت (هەموو کارەکان بە حەڵاڵ و حەڕامیەوە لەو کۆمەڵگا نەفامەدا لە کۆتاییدا دەڕژێنە یەك جێگا کە بریتیە لە خزمەت و بنایدنانی ئەو کۆمەڵگا بێ باوەڕو کافرە). (ماهر بكري. الهجرة ١٠، لە کتێبی: الغلو في الدين لعبدالرحمن اللويحق ٥٢٥). بەڵکو موستەفا شوکری زیادەڕەوی کرد دوای ئەوەی ناوی چەند کارێکی هێنا:(هەموو ئەمانە.... گشتیان دەچنە ناو چوارچێوەی دەسەڵات و

خۆی بەناچار بینی کە ڕووبەڕووی فیکری وەهابی کۆن ببێتەوە کە تەنها " یەکتاناسانی " بە " کۆمەڵەی موسڵمانان "ی دادەنا، کە ئەو فیکرە کۆنە بەرجەستە بووە لە چەند بزوتنەوەیەکی هاوچەرخ، لەوبارەوە وتی: " ئاشوبی تەکفیر زۆر گەرم بووەو بڵاوەی کردووە و ئەو ووتەیەش زۆر بڵاوبووەتەوە کە تیایدا هاتووە تێکڕایی کۆمەڵگاکان کافرو بێ باوەڕن، هەر کۆمەڵێکیش وا گومانی برد کە تەنها ئەوان کۆمەڵەی موسڵمانان پێك دێنن و غەیری خۆیان و کۆمەڵەکەیان یان بێ باوەڕن یان بێ ناسنامە و دینن، ئەگەرچی بشبینن کە نوێژو ڕۆژوو دەگرن و شایەتمان دێنن و (لا اله الا الله) دەردەبڕن و بانگەوازی بۆ ئیسلام دەکەن و جیهاد لە پێناو خوا سەرباری ئەو کارانە هەر موسڵمان نین مادەم عەقیدەی کۆمەڵەی ناوبراویان نەبێت و بەیعەت نەدەن بە ئەمیرەکەیان، گومانی ئەوەیان برد کە حەقیقەتی ئیسلام فەرامۆش کراوە هەر لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان تا ئەو ڕۆژەی ئەوان دەرکەوتوون و هەر خۆیان توانیویانە لە ئیسلام بگەن و ئەوە جێبەجێ بکەن کە پێشینەکانی ئەو ئوممەتە تێی نەگەیشتووە، وتویانە: ڕۆژگار دووبارە گەڕاوەتەوە وەك ئەو ڕۆژەی لێهاتووە کە پێغەمبەر موحەمەد ~ تیایدا وەك مژدەدەری ئەو دینە نێردرا، هەروەك چۆن لە ناو گەلانێکی بێ باوەڕ نێردرا کە بانگەشەیان دەکرد بۆ ڕێنمایی کردنی

---

تایبەتمەندی و پێکهاتەی تاغوت، ئەوەی بچێتە ناو ئەو چوارچێوەیە ئەوا بەندە و دەست و پێوەندی تاغوتن و خزمەتکاری مینبەری تاغوتن، تەنانەت یەك گەردیلە لەو شتانەی کە بەفەرمانی شارەوانی لەسەر ڕێگا لادەبرێت لە شاری تاغوت دا ئەوا دەچێتە ناو پێکهاتەی تاغوتەوە). (شكري مصطفى الخلافة ٦/ ١٣ و الغلو في الدين لعبدالرحمن اللويحق ٥٢٦ لە سەرچاوەی یەکەمی وەرگرتووە) ئەو زیاد ڕۆچووانە یەکدەنگ بوون لەگەڵ هەندێ لە برا سەلەفیەکانمان. بەداخەوە ئەو برا سەلەفیانە هەمان ئەو بەڵگانە دەهێننەوە کە زیاد ڕۆچووان دەیانهێناوە ".
عبدالرحمن عبدالخالق، مشورعية الدخول الى المجالس التشريعية ٢٠.

خەڵکی لە دیندا کەچی واش نەبوون. وەك هەندێ لەو کەسە بێ باوەڕانەی بانگەشە دەکەن بۆ ئیسلام کەچی موسڵمانیش نین "[1].

وتویەتی: " ئەو ڕاستیەی کە هیچ مشتومڕێکی لەسەر نییە ئەومیە کە بریتیە لەوەی کە دەبێت حوکم بدرێت بەسەر خەڵکی سادەدا بەوەی موسڵمانن، مادام هیچ یەکێك لەو موسڵمانانە بە زانین و خۆبەزلگرییەوە هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوانی ئیمانی ئەنجام نەدابێت، پێویستە هەڵسوکەوتی موسڵمانانەی ئیماندارانەیان لەگەڵ بکرێت و حەقیقەتی ئیمان و سنورەکانی ئیسلام بزانن. هیچ تاکێکی موسڵمان لە حەقیقەتی ئیسلام و ئیمان ڕووت نەکرێتەوە مەگەر بە ئەنجامدانی هەڵوەشێنەرەوەیەکی ئیمان بێت و بەڵگەشی لەسەر بەرپا ببێت "[2].

داوای کردووە کە ئەو هەڵمەتەی تەکفیر کردنی موسڵمانان سارد بکرێتەوە، پەلە نەکرێت لە تەکفیر کردنی موسڵمانان بە هۆی کوفرێکەوە کە لە فەتوایەك یان لە چەند بۆچوونێکدا دەرکەوتووە کە وا دیادەکەوێت پێچەوانەی فەرمایشتی خوای پاك و بەرزە، پێویستە بەتەواوی مەبەستی زانا موتەکەلیمەکان بزانرێت و بچەسپێت[3]. و وتویەتی: " دروست نییە هیچ یەکێك لە موسڵمانان تەکفیر بکەین کە دەبینین یەکێك لە کوفرەکان ئەنجام دەدات تەنها بەو مەرجانە نەبێت:

أ _ زانا بێت نەوەك کەسێکی نەزان، چونکە ئەگەر کەسێکی نەزان بوو و حوکمی ئەو کارەی نەزانی کە ئەنجامی دەدات ئەوا تەکفیر ناکرێت تا نەزانێت

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، الحد الفاصل بين الاسلام والكفر ص ٣.

(٢)عبدالرحمن عبدالخالق، الحد الفاصل بين الاسلام والكفر ٣٧.

(٣) عبدالرحمن عبدالخالق، الحد الفاصل بين الاسلام والكفر ٣٧.

و بەڵگەی لەسەر بەرپا نەبێت.

ب _ کەسێکی تەئویلکار نەبێت یان بزانێت ئەو کارەی خۆی بە پێچەوانەی شەریعەتە بەڵام کە دەیکات لەبەر ئەوەیە کە بەرژەوەندییەکی گەورەتر دەستەبەر دەکات و خراپەیەکی گەورەتر لادەدات، هەروەك پێغەمبەر ~ هەندێ حەدی جێبەجێ نەکردن لە پێناو ڕێگری کردن لە خراپەیەکی گەورەتر، هاوێنەی ئەو شتانە.

پ _ کەسێکی ناچار نەبێت.

بەپێی ئەو مەرجانەی ناوبراو حوکم دەدرێت لەسەر کەسێکی دیاریکراو کە بێ باوەڕە، بەڵام تەنها گرنگی دان بە قسەکە بەبێ ڕەچاوکردنی حەقیقەتی حاڵ و بارودۆخیان، بەڵام ئەوەی بوێری بەخۆی دەدات بەبێ ڕەچاوکردنی مەرجە ناوبراوەکان تەکفیری موسڵمانان بکات ئەوا بەڕاستی کەسێکی سادەی تێنەگەیشتووە لەدین و پارێزگارو لەخواترس نییە[1].

ئاگاداری داوەو و وتویەتی: " لە گەورەترینی ئاشوب و فیتنەکان ئەوەیە کە موسڵمانان وەڵامی دەدەنەوە لە ڕۆژگاری ئێستادا ئەویش فیتنە و ئاشوبی تەکفیرە، مەبەستم لێی ئەو عەقیدە و بۆچوونەیە کە زۆربەی تاکەکانی ئوممەتی ئیسلامی هەیەتی کە بریتیە لەوەی کۆمەڵگای هاوچەرخ کۆمەڵگایەکی بێ باوەڕە (بەوشێوە وشەکە بەڕەهایی دەردەبڕن) و تەکفیر کردنی هەر کەسێك کە کوفرێك بکات بەبێ ڕەچاوکردنی مەرجەکانی و پەرچەکانی تەکفیر، مەبەستم لە مەرجەکان ئەوانەن کە پێویستە لەو کەسەدا بێنەجێ تا بە ئەنجامدانی کوفرەکە حوکمی کافر و بێ باوەڕی بەسەردا

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ٢/٣٦.

بدرێت، پەرچەکانیش ئەو ڕێگرانەن کە ئەگەر هەبوون ناکرێت ئەو کەسەی کوفرەکە ئەنجام دەدات تەکفیر بکرێت.

لە شوێنەوارەکانی ئەوەی ڕەچاوی بارودۆخی قسەکە ناکرێت ئەوەیە کە هەندێ لەو کەسانەی کە زانست و زانیاریان لەلا نیە وڵاتی هاوچەرخی ئیسلامیان دابەش کرد بۆ وڵاتی جەنگ کە خوێن و ئافرەت تیایدا حەڵاڵە! و نوێژی هەینی بەکۆمەڵی تێدا دروست نییە، هیچ ڕێزێکی تێدا نیە تەنها ئەوانە نەبن کە ئەو عەقیدەیەی هەبێت بە دەر و دەروون (ظاهر و باطن) دەری ببڕن... یەکێ لە شوێنەوارەکانی تر بریتیە لەوەی کە ئەوەی ئەو عەقیدەیەی هەیە پێی وابوو کە تەنها خۆی یان ئەوەی وەك ئەو بیر دەکاتەوە ئیماندار و موسڵمانن بۆیە ناوی لەخۆی نا " کۆمەڵی موسڵمانان " ئەگەر تەنیا یەك کەسیش بێت یان زیاتر بن، تەنها خۆیان بە کۆمەڵی موسڵمانان دادەنێن غەیری خۆیان لەو بازنەیە بەدەر دەنێن، بۆیە بەیعەتیان دا بەیەکێکیان و ئەو مافانەیان پێدا کە دەدرێتە ئیمام و ڕابەری گشتی چ فەرمانبەرداری یان ئامۆژگاری، بۆچوونیان وابوو کە هەر کەسێك دەربچێت لە بەیعەتی ئەمیرەکەیان ئەوا دەرچووە لە ئیسلام و خوێن و ماڵ و شەرەفی حەڵاڵە ئەگەر توانا هەبوو بۆ حەد لێ دەرکردنی "[1].

ئەوەشی وتووە: " لە شوێنەوارەکانی ئەو عەقیدە زیاد ڕۆچووە بریتیە لەوەی کە بابەتی حاڵەتی ناچار (اضطرار)یان فرێدا دەرەوەی بازنەی شەریعەت و نەزان و زانایان وەك یەك ئەرکدار کرد و حوکمی کەسی زانای تەئویل کار وەك ئەو کەسەیان دانا کە نکۆڵی دەکات و مل ناداتە بەر حەق، بەرژەوەندی شەرعی بە ورد و درشتیەوە وەلانرا، شەریعەت مایەوە بەبێ حیکمەت و

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ١/١.

عەقڵ.... لە شوێنەوارەکانی دەرکردنی حوکمی کوفر بەرەهایی بریتیەلە حەرام کردنی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کۆمەڵگەدا و پێویست کردنی کەنارگرتن و خۆ دوور گرتن لێی، دووبارە دەست پێکردنەوەی کاری بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام هەروەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەگەڵ خەڵکی نەفامی سەرەتا دەستی پێکرد، تەنانەت لە شوێنەوارەکانی ئەو فیتنە و ئاشوبە عەقیدەییانە بریتی بوو لە دەرکەوتنی ئاشوبی خوێناوی کە خوێنی زۆربەی موسڵمانە بێ ئاگاکانی تێدا حەڵاڵ دەکرێت "[1].

شێخ عەبدولڕەحمان عەبدولخالق جەختی لەسەر هەڵوێستە تایبەت و جیاوازەکەی خۆی کردەوە، بەوەی کە وتویەتی: " ئێمە بڕوامان وایە کە وڵاتانی ئیسلامی و دانیشتوانەکەی هێشتان هەر موسڵمانن، تا ئێستاش زۆربەی موسڵمانان دەیانەوێت شەرعی خوا حوکم بکات، بەڵام لەو ناوبەینەدا چەند دزێکی زاڵبوو و حوکمڕانی دووڕوو کە خۆیان بە موسڵمان پیشان دەدەن بوونەتە ڕێگر و پشتیوانی دوژمنانی خوا دەکەن لەوەی حوکم بکرێت بە غەیری پەیامی خوای گەورە.... ئێمە بڕوامان وا نییە کە کۆمەڵگا و دانیشتووانی موسڵمان بێ باوەڕن و بۆچوونمان وانیە کە دەبێت جیهاد لە سفرەوە دەست پێ بکرێت تا ڕیزەکانی توێژی موسڵمان لەگەڵ کۆمەڵگای بێ باوەڕدا جیاواز بێت وەك بۆچوونی هەندێ لە بانگخوازان. پوچی ئەو بۆچوونەمان لە زۆر جێگای جیاواز ڕوون کردۆتەوە "[2].

شتێکی زانراوە کە هەندێ بزوتنەوەی ئیسلامی بەتایبەتی لە میسر هەر لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە ئاراستەی وایە کە

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ٢/١.

(٢) عبدالرحمن عبدالخالق، مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ٥.

تەكفیری كۆمەڵگا و خەڵك و حكومەتە ئیسلامیەكان دەكات، چونكە یاسا ئیسلامیەكانی گۆڕیوەتەوە بە یاسا دەست كردەكان. خوێن و ماڵ و ناموسی كۆمەڵگا ناوبراوەكەی حەڵاڵ كردووە و كۆچ كردن و كەنار گرتنی خۆی و جیهادی لە دژی ڕاگەیاند و وڵاتی موسڵمانانی بە وڵاتی جەنگ حیساب كرد[1].
بەڵام شێخ عەبدولخالق گشت ئەم بۆچوونانەی ڕەتكردەوە و وتی: " بێگومان ئەو قسەیە زۆر خراپە كە ووتراوە وڵات و نیشتمانی ئیسلامی وڵاتی جەنگە، چونكە هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەم بۆچوون و قسەیە نە لە قورئانی پیرۆز و نە لە سوننەت و نە لە فیقه و نەلە عەقڵ دا "[2] " گومان لەوەدا كە وڵات و نیشتمانی موسڵمانان وڵاتی ئیسلامە مادام خەڵكەكەی موسڵمان بن، ئەگەرچی هەندێ سیستەمی بێ باوەڕ بەسەریاندا زاڵ بێت، كەچی موسڵمانان هەر داوایان لێ كراوە بەوەی تەنها فەرمانبەری حەق بن و بەس، فەرمانیان پێكراوە كە ملكەچی سیستەم و یاسایی كوفری و بێ باوەڕی نەبن، چونكە گوێڕایەڵی بۆ كەسێك نیە كە خۆی تاوانكار بێت "[3] " پێكهێنانی حیزب یان ڕێكخراو یان كۆمەڵە لە هەر سیستەمێكی " دیموكراسی " دا كە ڕێگا بدات بەبوونی بۆچوون و ئاراستەی جیاواز مانای وانیە كە دژەڕاكان ئیعتراف دەكەن بە بۆچوونەكانی بەرامبەر و ڕازین بەو شتە پووچانەی كە لەسەری دەڕۆن "[4].

دوای ئەوەی شێخ عەبدولخالق تەكفیر كردنی كۆمەڵگای موسڵمان و ڕاگەیاندنی جەنگ لەدژی ڕەت كردەوە، ئەوەی ڕاگەیاند كە خۆی پابەندە بە

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ٢/٣٢ - ٣٤.

(٢) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ٢/٣٧.

(٣) عبدالرحمن عبدالخالق، فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله ٢/٣٨.

(٤) عبدالرحمن عبدالخالق، المسلمون و العمل السياسي ١٤.

بەرنامەو پەیڕەوی ئاشتی لە بانگەواز و چاکسازی دا، دەڵێت " بنچینەی بانگەواز کردن بۆ لای خوای _ پاك و بەرز _ بریتیە لە ئاشتی، ڕێگای ئاشتی بۆ بانگەواز بنچینەی سەرەکییە، ئەگەر هاتبایە بێ باوەڕان جەنگیان نەکردبایە لەگەڵ پێغەمبەردا ~ ئەوا پێغەمبەر جەنگی لەگەڵ نەدەکردن و ئەگەر ڕێگر نەبووبانە لەبەردەم گەیشتنی بانگەوازی ئیسلام ئەوا جەنگی لەدژیان دەوەستاند... لەگەڵ بێ باوەڕان وابووە، جا چۆن دەبێت لەگەڵ موسڵمانان دا؟! "[1].

ئا بەوشێوەیە سەرکردەی بزوتنەوەی سەلەفی کومیتی نزیکبووە لە سیستەمی دیموکراسی تا لەگەڵی ئاوێتە بوو و وتی: " ئەو سیستەمەی ڕێگە دەدات کە دژەڕا ڕابگەیەنرێت و ڕێگە دەدات بە موسڵمانان حیزب پێك بهێنن تا لەمیانەیدا بانگەواز بکەن یان کۆمەڵەیەك پێك بێنن بۆ دەستەبەر کردنی هەندێ ئامانجی دینیان وەك بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و دروست کردنی زانکۆ و قوتابخانە و پەیمانگە و یارمەتی دانی هەژار و بێ باوکان .... تاد. دەڵێم: ئەو سیستەمەی ڕێگە بەو کارانەی ناوبراو دەدات پێویستە دەستی پێوە بگیرێت و پێداگیری لەسەر بوونی بکرێت، چونکە جێگرەوەی ئەو سیستەمە بریتیە لە حوکمی تاکرەوی و خۆسەپێنەر چ سەربازی یان غەیری سەربازی کە لەمیانەیدا موسڵمانان ناچار دەکرێن بۆ ئەوەی بانگەوازی بەنهێنی بکەن و ئەمەش زۆر سەخت و گرانە "[2].

---

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، المسلمون و العمل السياسي ١٤.

(٢) عبدالرحمن عبدالخالق، المسلمون و العمل السياسي ١٥. شێخ عەبدوڕەحمان عەبدولخالق کە دەیڕوانیە ڕەوایی چوونە ناو ژیانی دیموکراسی و ئەنجومەنی یاسادنان پشتی بەست بە فەتوایەکی شێخ (عبدالعزیز بن باز)، کە تیایدا دەڵێت: "گوناه لەوەدا نییە کە هەوڵبدرێت بۆ گەیشتن بە

وتويەتی: " بێگومان حیزبی سیاسی و کۆمەڵەی خێرخوازی و کۆمەڵە و سەندیکا و یەکێتی کە سیستەمی ئازاد (دیموکراسی) ڕێگەی پێدەدات پێویستە لەسەر موسڵمانان دەست پێشخەری بکەن و بیکەن بەڕێگە و هۆکارێك بۆ بڵاوکردنەوەی دینەکەیان و دامەزراندنی عەقیدەیان و کۆك و تۆکمە کردنی هێزو توانایان و پەروەردە و پێگەیاندنی تاکەکانیان، بەڵکو لەسەر موسڵمانان پێویستە تێ بکۆشن بۆ بوونی ئەم جۆرە یاسایە کە ڕێگە دەدات بەو شتانە ئەگەرچی سیستەمی جێگیر ڕێگەی پێنەدات، چونکە ئەمە مافێکە تەنانەت ئەرکێکە لە ئەرکەکانی موسڵمانان کە یارمەتی یەکتری بدەن لەسەر خێرو چاکە، کۆمەڵە و ڕێکخراو و حیزب پێك بێنن کە بانگەوازی بۆ لای خوا بکەن و دینی خوا بڵاو بکەنەوە و وشەی خوای بەرز ڕابگرن و بەرز ببێتەوە "[1].

---

ئەنجومەنی جەماوەر(پەرلەمان) ئەگەر مەبەست لەوەدا پشتیوانی ڕاستی و حەق بێت و ڕەتکردنەوەی باتیل و ناحەق، چونکە ئەمە سەرخستنی حەقە، چونە پاڵ بانگخوازانە بۆ لای خوا. هەروەك گوناه لە بەکارهێنانی ئەو پسولەو بلیتانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ دەنگدان و هەڵبژاردنی بانگخوازانی پیاوچاك و پشتگیری کردنی حەق و حەق بێژان، تەنها خوای گەورە سەرخەرە ". (مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية ١٧).

(١) عبدالرحمن عبدالخالق، المسلمون و العمل السياسي ١٦.

# کۆتایی

## تەکفیر قەیرانی فیکری سیاسی وەهابییە

هەروەك سەرنجی ئەوەمان دا لە بەشەکانی ڕابردوو، کە بێگومان قەیرانی فیکرەی سیاسی وەهابی و ڕەگ و ڕیشاڵەکانی خۆسەپاندن، خۆی لەخۆیدا شاراوەتەوە لەناو تەکفیر کردنی تێکڕایی موسڵمانان، لەهەمان کاتدا دانانی چەندین مەرجی گران و سەخت بۆ هاتنەجێی ئیمان و بچوك کردنەوەی یەکتاناسی و دەستپێشخەری کردن لە دانانی نیشانەی گومان لەسەر ئیسلام بوونی خەڵکی و تاوانبار کردنی موسڵمانان بەوەی بنەماکانی ئیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە. ئەم کێشەیە بووە هۆی لە دایکبوونی تێکگیرانی بەردەوام لەگەڵ جەماوەری موسڵمان و دژایەتی کردن و نەکرانەوە بەڕووی تێکڕای دەستە و تاقم و حیزب و کۆمەڵە ئیسلامیە جیا جیاکان تەنانەت دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵیان لەسەر بنەمای سەرکەوتن و داگیر کردن و توند و تیژی و زاڵبوون و خۆسەپاندن.

لێکدانەوەو تەفسیری نوێی وەهابیەت بۆ خوا بەیەکزانین و یەکتاناسی ڕێگەی دا بە بزوتنەوەی وەهابیەت کە دووبارە چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامی دیاری بکاتەوە، کە وای لێهات ئەو کەسانە لە چوارچێوەی ئوممەت دەرچوون کە شایەتمانیان دەهێنا و ئوممەت تەنها لەوانە پێکهێنرا کە هەڵگری تیۆری وەهابییە بۆ خوا بەیەکزانین و پاڵپشتی دەوڵەتەکەشی دەکات.

بە وەلانانی ئەو شتانەی کە هاتنە کایە بەهۆی ئەو هەڵوێستەی وەهابیەکان کە بووە هۆی دروستبوونی کاردانەوەی لەلایەن تێکڕایی موسڵمانان لە دژی بزوتنەوەی وەهابیەت، ئەوا دەبینین کە کێشەی تەکفیر لەناو خودی نەوەکانی بزوتنەوەی وەهابیەت ڕەنگی دایەوە، بەشێوەیەك کە دەزگا سیاسیەکان بە تەنها لادان و دژەڕا بوونێك حوکمی دەرکرد لەسەر شوێنکەوتووانێکی زۆری بزوتنەوەی وەهابی بەوەی هەڵگەڕاونەتەوە و کوفریان کردووە، هەروەك هەندێ لە دەستەکانی ناو بزوتنەوەی وەهابی هەندێ دەسەڵاتدارو حوکمڕان و دەستە و تاقمیان تۆمەتبار کرد بەوەی کوفریان کردووە و بێ بڕوا بوونە لەبەر ئەوەی چەند مەرجێك لەو مەرجە توندانەیان بە کەم و کورتیەوە جێبەجێ کردووە، هەروەك خۆشویستنی دەوڵەتی عوسمانی "بێ باوەڕ" بەپێی مەنتیق و تێڕوانینی وەهابی.

بنەمای تەکفیر کە بووە پێوەرو حوکمدەر لەسەر پەیوەندی وەهابیەکان لەگەڵ تێکڕایی موسڵمانەکان جۆرێك لە دڵەڕاوکێی بەردەوامی دروست کرد، بەهۆی بنەمای جیهاد کە وەهابیەکان پێوە پابەند بوون وەك ڕێگایەك بۆ بانگەواز کردن و ناچار کردنی " بێ باوەڕان و موشریك و هاوبەشدانەر و هەڵگەڕاوەکان " تا دووبارە سەر لەنوێ بێنەوە ناو ئیسلام و دەست بگرن بە

تیۆری (یەکتاناسی) کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب هێناویەتی، ئینجا لەبەر ئەوەی تێکڕایی موسڵمانان لێکدانەوەو تەفسیرە تەسکەکەی وەهابیان بۆ یەکتاناسی ڕەت کردەوە، چونکە ئەو تیۆرەی وەهابی پەیوەندی لەگەڵ موسڵمانان دادەمەزراند لەسەر بنەمای توندڕەوی و هێز و ترس و تۆقاندن و هەر هەڵ و فورسەتێکیش لەناو دەبات و ناهێڵێت کە دەبێتە هۆی دروست کردنی پەیوەندی نێوان وەهابیەکان موسڵمانان لەسەر بنچینە و بنەمای ڕاوێژ و ئاشتی.

بینیمان کە بانگەوازی وەهابیەت کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی دوازدەهەمی کۆچی دامەزرا چۆن هەڵسا بە داگیرساندنی زنجیرەیەك لە جەنگ و شەڕ لە ناوچەی (عارض) کە دەکەوێتە نەجد، ئەم زنجیرە جەنگە بەردەوام بوو بۆ ماوەی چڵ ساڵ، دواتر جەنگەکە گوازرایەوە بۆ ناوچەکانی دەوروبەر وەك (ئەحساء) و عێراق و حیجاز ئەمە بووە هۆی هاتنە کایەی قەسابخانەی تۆقێنەر بۆ ئەو دانیشتووانە ئارام و هێمنەی موسڵمانان کە بزوتنەوەی وەهابی وەك بێ باوەڕ و موشریك سەیری ئەو موسڵمانانەی دەکرد، لەبەر ئەمە بە توندترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو موسڵمانانە دەکرد و ڕەحمی نەبە بچوك و نەبە گەورە کرد، دەکرێ قەسابخانە بەناوبانگەکەی شاری (کەربەلا) ناونیشان و نمونەیەکی دیاربێت لەسەر سیاسەتە توندڕەوەکەی وەهابیەت.

سەرباری بنەمای تەکفیر کە بزوتنەوەی وەهابی جەختی لەسەر دەکردەوەو پشتی پێدەبەست، ئەوا نەیتوانی سیستەمێك بێنێتە کایە لەسەر بنچینەی ڕاوێژ و هەڵبژاردن و ڕەزامەندی موسڵمانان و بەیعەتدان بە حوکمڕان دابمەزرێت، بەڵکو بەدوای سیستەمی میراتی و جێنیشینایەتی کەوت

کە سێبەرەکەی بڵاوەی کردبوو بەسەر بیابانی (نەجد) هەروەك چۆن ئەو سیستەمە باڵی کێشابوو بەسەر تێکڕای جیهانی ئیسلامی لە چەرخە پاشکەوتوو و دواکەوتووەکان. وەهابیەت هەڵسا بە زیاد کردنی ڕەهەندێکی تری تیۆری کە هەر لە تیۆرە فیکرییە سیاسیە دواکەوتووەکانی وەرگرتووە کە حوکمەتی خۆسەپێنەر و زاڵ بوو بە دروست دەزانێت بەبێ ئەوەی ڕاوێژ یان ڕەزامەندی ئوممەت یان هەڵبژاردن لەبەرچاو بگرێت، بەهۆی چەند فەرمایشتێك کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەری گەورە (صلى الله عليه و سلم) کە فەرمان دەکات بە گوێڕایەڵی حوکمڕانەکان ئەگەرچی ستەم و دەستدرێژی ئەنجام بدات، بەبێ ئەوەی بزتنەوەی وەهابی سەلەفی ڕێگە بەخۆی بدات کە پێداچووەی ئەو فەرموودانە بکات و جەخت بکاتەوە کە تا چەند ڕاستن یان ئەو فەرموودانە بەراوورد بکات بە بنەما گەورەکانی ئیسلام کە بانگەشە دەکەن بۆ ڕەحمەت و دادپەروەری و یەکسانی.

بەهۆی نەبوونی ڕاوێژ لە فیکری سیاسی وەهابی دا و قەبوڵ کردنی حوکمی زاڵبووی خۆسەپێن بووە هۆی کرانەوەی دەرگایەکی فراوان بۆ ململانێی ناوەخۆیی و هەڵگەڕانەوەی سەربازی و پەنهان کوژی، کە شێخ موحەمەد یەکەم کەس بوو لە وەهابیەکان دەستی پێکرد کاتێك فەرمانی کرد بە کوشتنی فەرماندی هێزی وەهابیەکان ئەمیری گەورەی نەجد ئەمیری عەیینە عوسمانی کوڕی مەعمەڕ. ململانێ دوای کۆچی دوایی ئەمیر سعود کە شێخ بەیعەتی بەو بە باوکی عەبدولعەزیز دابوو دەستی پێکرد، عەبدوڵڵا وەك ئیمام دانرا کەچی مام و براکەی ململانێیان لەگەڵ دەکرد لەسەر دەسەڵات.

سەرباری ئەوەی بزوتنەوەی وەهابی، پاش داڕوخانی دەوڵەتی سعودیەی یەکەم دەیگوزەراند لە حاڵەتی بەرگری بۆ دەستگرتن بەسەر میسری عوسمانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی سەلامەت نەبوو لە ململانێ لەسەر دەسەڵات، مشاری کوڕی مەعمەڕ خۆی وەك سەرکردەی وەهابی ناساند لە ساڵی ١٢٣٤ك، بەڵام لەبەرامبەردا ئەمیر مشاری کوڕی سعود بەوە ڕازی نەبوو و هەوڵی سەندنەوەی دەسەڵاتی دا کە دواتر بووە هۆی کوژرانی خۆی. دواتر ئەمیرێکی تری سعودی کە تورکی کوڕی عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی سعودە لە ساڵی ١٢٣٦ك هەڵسا بە سەندنەوەی تۆڵەی مشاری کوڕی سعود لە مشاری کوڕی مەعمەڕ، هەر لەسەر ڕێگەی خۆشی ئەمیری (ضرما)ی کوشت کە ناوی ناصری سەیاری بوو، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر ڕیاز و بەیعەت وەرگرتن لە خەڵکەکەی بە زەبری هێز. بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ڕێگری لە کوژرانی لە ساڵی ١٢٤٩ك بەدەستی کوڕە خوشکی (مشاری کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی مشاری کوڕی سعود) کە خۆی بۆ حەشاردابوو لەلای دەرگای مزگەوت و بە غەدر و ستەم کوشتی دوای هاتنەدەرەوەی لە نوێژی هەینی، بە زۆری دەستی گرت بەسەر دەسەڵاتدا. چەند مانگێکی پێنەچوو تا فەیصەڵی کوڕی تورکی تۆڵەی باوکی سەندەوە و کوڕە مامەکەی کوشت کە ناوی مشاری بوو، فەیصەڵ خۆی جڵەوی حوکمی گرتە دەست.

ململانێ لەسەر دەسەڵات لە نێوان ئال سعود بووە هۆی ئەوەی کە باڵی کوڕەکانی سعودی کوڕی عەبدولعەزیز یارمەتی وەربگرن لە هێزەکانی میسری بۆ ئەوەی یەکێکیان دابنێت وەك ئەمیری نەجد و بەهێز زاڵی بکات کە ئەویش بریتیەلە (خالدی کوڕی سعود) ئەمە لە ساڵی ١٢٥٣ك بوو.

دواتر ململانێ لەسەر دەسەڵات بووە هۆی کێشە دروست بوون لە نێوان کوڕەکانی ئەمیر فەیصەڵ کە گەڕایەوە بۆ سەر تەختی حوکمڕانی، تا وای لێهات یەکتریان کوشت و یارمەتیان وەرگرت لە هێزی عوسمانییەکان و ئینگلیزەکان لە دژی یەکتردا تا بەدوایی حوکم و دەسەڵاتیان بەتەواوی لەناوچوو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمی کۆچی.

لەکاتێکدا بزوتنەوەی وەهابی یارمەتی وەرگرتن و پەیوەندی هەبوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی "بێ باوەڕ" بە هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمانی دادەنا، ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم پەیمانبەستنی یەکێك لەسەرکردەکانی کە شا عەبدولعەزیزی کوڕی عبدولرەحمانی کوڕی سعودە لەگەڵ داگیرکەری بەریتانی کە دەستی گرتبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا لە جەنگی جیهانی یەکەم، ئەم پەیمان بەستنەش دژبە دەوڵەتی عوسمانی کە پێشتر نەجد لەژێر دەستەڵاتی ئەودا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بزوتنەوەی وەهابی نوێ ڕێگر نەبوو لە یارمەتی دانی و کارکردن لەگەڵی لەناو سەربازەکانی و لەژێر دروشمی تەکفیری دەوڵەتی عوسمانی و نەتەوە عەرەبەکانی دەورووبەر، تەنانەت بوون بە ئامرازێکی دەستەمۆکراو لە دەستی ئیبن سعود دا ئەمەش بۆ داگیر کردنی خاك و وڵات و خەڵکی زیاتر. وە زۆر نەمابوو کە ئیبن سعود تەواوی ئەو ئامانجانەی دەستبخات کە نەخشەی بۆ کێشابوو لەناکاو پێکدادان ڕوویدا لەنێوان ئیبن سعود و هێزی (ئیخوان)ی وەهابی و ئیبن سعود پشتی بە ئینگلیز بەست بۆ سەرکوت و کپ کردنی ئەو هێزە. تەنانەت ئیبن سعود پشتی بەست بە پیاوانی دینی وەهابی بۆ ئەوەی یارمەتی دەربن لە گشتاندنی سەرکوت کردنەکە و تۆمەتبار کردنی ئیخوان بە دەرچوون دژ بە ئیمام.

لە کاتێکدا ئیبن سعود هێشتا تەواو دەستی بەسەر وەهابیەتدا نەگرتبوو پاش ئەو لێدانە، ئەوا ئیبن سعود چیتر پابەند نەبوو بە دروشم و بەرنامە سەربازییەکەی وەهابیەت، ئەو سنورەی پاراست کە ئینگلیز بۆی دیاری کرد لە پەیماننانەی (دارین) ١٩١٥ و پەیماننامەی (جدة) ١٩٢٧، ئیبن سعود توانی وەهابیەت کوت هەڵبێنێت و ڕێکی بخات لە ناو دامەزراوەیەکی (ئایینی فەرمی) کە پاشکۆی خۆی بێت و ببێتە هۆی ئەوەی بە ئەندازەیەکی زۆر فراوان لەلایەنی ڕۆشنبیری و سیاسی دەست بگرێت بەسەر دەوڵەتی نوێی سعودییە کە لە (نەجد) و (ئەحساء) و (حیجاز) و شوێنەکانی تر دایمەزراندووە. لەگەڵ ئەوەی ئیبن سعود لایدا لە گوتاری فەرمی وەهابی کە بریتیەلە تەکفیری تێکڕایی موسڵمانان، ئەم لادانە بووەهۆی ئەوەی کە ڕێگە خۆش بکات لەمەودوا کاربکات لە چواچێوەی کۆنگرەی ئیسلامی و ڕێکخراوی یەکێتی(رابطة)ی جیهانی ئیسلامی و هاوشێوەی ئەو ڕێکخراوانە، بەڵام سەرباری ئەمەش ئاوازی تەکفیر بەردەوام دەگوترایەوە لەسەر زمانی هەندێ گەورە زانایانی وەهابی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بەتایبەتی دژ بە دەستەی شیعەکان، کە بووە هۆی ئەوەی شیعەکان نەتوانن ومارەسەی مافە مرۆیی و سیاسیەکانی خۆیان بکەن لە دەوڵەتی سعودییەدا بووە هۆی ئەوەی دوور بخرێنەوە لەوەی بەشداری بکەن لە دەسەڵات یان داواکردنی هاتنە کایەی سیستەمی ڕاوێژ.

سەرباری ئەوەی سیستەمی ڕاوێژ داواکارییەکی جەماوەری بوو لە سعودییە بەتایبەتی لە حیجاز کە ئیبن سعود خستیە سەر ناوچەی نەجد لە ساڵی ١٩٢٥ لەسەر بنەمای ئەوەی پەیمانی پێدان بەوەی مافی ڕاوێژیان دەبێت و خۆیان کارەکانی خۆیان دەگرنە دەست، بەڵام سیستەمی سعودی لەسەر بنەمای

زاڵبوون و خۆسەپاندن و شمشێر دامەزراوە بۆیە وشەی (ڕاوێژ) ناخۆشترین شت بوو کە گوێچکەکانی سیستەمی سعودی دەیبیست.

لەگەڵ داخستنی دەرگای ڕاوێژ ئەوا دەرگاکانی چاکسازی و گۆڕانی ئاشتیانەش داخران لە ناو سیستەمی سعودی دا، تەنانەت وەهابیەکانیش مافی ئەوەیان نەما کە دژی بڕیارێك بووەستن یان داوابکەن بە بەژداربوون لە بڕیاری سیاسی یان بەڕیوەبردنی دەوڵەت و کۆمەڵگە، بۆیە لەبەردەمیاندا هیچ ڕێگەیەك نەما تەنها گۆڕین نەبێت ئەویش گۆڕینی سەربازی و جیهادی چەکدار دژ بەدەوڵەتی سعودی کە هەندێکیان وایان دەزانی دەرچووە لە ئیسلام و ڕێگەی ڕاستی بزر کردووە، بزوتنەوەی (جوهەیمان) لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی لە حەرەمی حەڕام یەکێك بوو لەو نمونانە، کە لەمیانەی دا (جوهەیمانی عوتەیبی) هاوڕێکەی (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای قەطانی) وەك مەهدی چاوەڕوان کراو و دڵسۆزێکی ناساند کە دەیەوێت بنچینەی دەوڵەتێکی ئیسلامی سەر لەنوێ بنیاد بنێت.

لەگەڵ ئەوەی سیستەمی سعودی دوورکەوتەوە لە دروشمەکان و ئامانجەکانی بزوتنەوەی وەهابی، بەتایبەتی ئەو کاتەی هێزەکانی ئەمریکی بەکارهێنا و پشتی پێبەست بۆ بەرگری کردن لە دەوڵەتی سعودییە و بەکارهێنانی دژ بەدەوڵەتی عێراق کە کویتی داگیر کرد ساڵی ۱۹۹۰، پێویست بوو لەسەر وەهابیەت یان ببێتە پاشکۆ و پشتیوانی سیستەمی سعودی بکات، هەروەك دامەزراوەی دینی فەرمی ئەوەی کرد یان ناڕازی بوونی بەبێ دەنگ و پێشکەش کردنی یاداشتنامەی ئامۆژگاری کە هیچ سوودیان نیە یاخود دەرچوونی چەکدارانە و تەکفیر کردنی سیستەم وەك ڕێ خۆشکردنێك بۆ

جیابوونەوە لێی، فیکرەی سیاسی وەهابی چارەسەرێکی میانڕەوی دەست نەکەوت کە خۆی ببینێتەوە لە داواکردنی هاتنە کایەی سیستەمی ڕاوێژ و ئەنجامدانی هەڵبژاردن و بانگەوازی کردن بۆ گۆڕینی سیستەمەکە بە ئاشتیانە، چونکە وەهابیەت تا ئێستاش دەگوزەرێنێ لەناو قەیرانی گومان هەبوون لە موسڵمان بوون و بڕوادار بوونی زۆربەی دانیشتووانی سعودی کە تێکڕایی دەستە و تاقمەکان جگەلە وەهابیەت لەخۆی دەگرێت، هەروەك تا ئێستا دیموکراسی و هەڵبژاردن بە جۆرێك لە داهێنراوەکانی ڕۆژئاوا دەزانێت کە پێچەوانەی دین و عەقیدەی یەکتاناسیی و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری گەورەیە کە فەرمان دەکات بە گوێڕایەڵی کردن بۆ حوکمڕان و دژ نەوەستانی و ڕەخنە لێنەگرتنی بە ئاشکرا یان دیاری نەکردنی ماوەی حوکمڕانییەکەی ج جای لابردن و گۆڕینی.

ئەگەر بزوتنەوەی وەهابی شۆڕشگێری نوێ ناچار بێت بۆ تەکفیر کردنی سیستەمی سعودی و دامەزراوە دینیە وەهابیەکانی پاشکۆی سیستەمەکە لە پێناو ئەوەی ڕێگە بەخۆی بدات دژ بەسیستەمەکە هەڵبگەڕێتەوە و کاربکات لەپێناو ڕووخانی، دەکرێ بە فیکر و تەسەوڕی ئێمە ئەو بزوتنەوەیە چۆن لەگەڵ تێکڕایی سعودییەکان بە هەموو تەیارو دەستە جیا جیاکان هەڵسوکەوت دەکات؟ چۆن دەجوڵێتەوە لەگەڵیان؟ و چۆن مافی سیاسیان پێدەبەخشێت؟ ئایا ڕازی دەبێت بە بەژداری کردنیان لە دەسەڵات؟ بێگومان وەڵامی گشت ئەو پرسیارانە بە نەرێ دەبێت. شتێکی گومان هەڵنەگرە کە ئەگەر بزوتنەوەی وەهابی شۆڕشگێڕی نوێ سەربکەوێت ئەوا سیستەمێکی نوێی سیاسی دادەمەزرێنێت کە لەسەر بنەمای میراتگری دەسەڵات دەبێت و ئەمەش ملکەچی حوکم و هاوکێشەکانی هێزە هەرێمی و نێو دەوڵەتیەکان دەبێت،

دووباره مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆی حوکم بدات، بەشێوەیەك کە دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی بزوتنەوەی وەهابی جیا دەبێتەوە یان لەدژی هەڵدەگەڕێتەوە، هەندێکیان هەندێکی تر تەکفیر دەکەن و بەهەمووشیان تێکڕایی ئوممەت تەکفیر دەکەن و هەڵوێستێکی نەرێنی (سلبي)ان دەبێت لە دژی ئوممەت.

هەموو ئەو شتانەش لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە بزوتنەوەی وەهابی لەناخیدا بەشێوەیەکی هەتا هەتایی دژ بە دیموکراسی و ڕاوێژە، بەهۆی ئەوەی کە ئیعتراف ناکات بە موسڵمانێتی ئوممەت لەسەر بنەمای شایەتمان، پێداگیری وەهابیەت لەسەر ئەوەی کە دەبێت لە دید و تێڕوانینە تەسکەکەی شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهابەوە تەماشای ئیمان و ئیسلام بکرێت[1]، ئەمە وای کردووە کە (وەهابیەت) بەردەوام کەمینە بن لە کۆمەڵگەدا کە پەنا دەبەنە بەر توند و تیژی و ناچار دەبن بە پەیمان بەستن لەگەڵ هێزی سەربازی و پشت دەبەستێت بە جیهاد کردن دژ بەتێکڕایی موسڵمانانی تر و سیستەمێك دادەمەزرێنێت لەسەر بنەمای زاڵ بوون و خۆسەپاندن.

---

(١) لە کاتی گفتوگۆیەکمدا لە پێگەی (من موسڵمانم) وەهابی، لە مانگی موحەڕەم ١٤٢٢ك کەسێك خۆی ناسان کە ناوی لەخۆ نابوو (عەبدوڵڵا سەلەفی) سەرسامی خۆی دەربڕی سەبارەت بە گفتوگۆو کتێبەکانی من، هەڵەکەی قۆستەوە بۆ ئەوەی بانگم بکات بۆ چوونە ناو (دینی ئیسلام)، منیش لەوە تێنەدەگەیشتم کەچی دەڵێت و بەسەرسامیەوە پێم وت و جەختیشم لەسەر ئەوە کردەوە: کە من لەسەر فیترەت لەدایك بووم، لە دایك وباوکێکی موسڵمان لە ناو کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا. بەڵام دواتر لێی تێگەیشتم کە ئەو ئیعتراف ناکات بە موسڵمانێتی من و بڕوای نیە بەبوونی موسڵمانان لە دەرەوەی چوارچێوەی (بانگەوازی وەهابیەت) یان دەرەوەی بانگەوازی یەکتاناسی یان دەرەوەی ئەو ئیسلامە پاك و پوختەی کە موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب هێناویەتی، گومانی هەیە لە موسڵمان بوونی تێکڕایی موسڵمانانی تر.

بزوتنەوەی وەهابی ناتوانێت لەو قەیرانە سەخت و جێگیرە دەربچێت مەگەر بە ئەنجامدانی شۆڕشێکی ڕۆشنبیری کە لەمیانەی دا چاوبخشێنێتەوە بە تێڕوانین و تەصەوڕی وەهابی بۆ ئیسلام و ئیمان کە شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب پێشکەشی کرد، سیاسەتی تەکفیری تێکڕایی موسڵمانان فڕێبدات. سەرباری ئەوەی دووبارە چاوبخشێنێتەوە بە فیکری سیاسی ئیبن تەیمیە و ئەوەی کە حکومەتی زاڵبوو و خۆسەپێنەر بە دروست دەزانێت. بەشێوەیەکی تر بزوتنەوەی وەهابی ناتوانێت بەڕێگای ڕاوێژ یان دیموکراسی گوزەر بکات تەنها بە فڕێدانی فیکرەی وەهابیەت نەبێت. هەر ئەمەش کە ژمارەیەکی کەم لە نەوەکانی بزوتنەوەی سەلەفی پێی هەڵدەستن ئەوانەی کە دووبارە دەستیان کردووە بە چاوخشاندنەوە بە مەرجە توندڕەوەکانی ئیمان و بە گوفتاری دیموکراسی. داندەنێن بە چوارچێوەی فراوانی ئوممەتی ئیسلامی، لەوانەیە ڕەتکردنەوەی ووشەی (وەهابی) لەلایەن سیستەمی دەوڵەتی سعودییە هەوڵێك بێت بۆ خۆ ڕزگار کردن لە پاشماوەی فیکری وەهابی توندڕەو، دووبارە گەڕانەوە بۆ باوەشی فراوانی ئیسلام، وەزیری ئەوقافی سعودی عەبدولوەهابی کوڕی ئەحمەدی عەبدولواسع، لە بەرواری ١٤٠٩/٥/١٢ ڕێنماییەکانی خۆی دەرکرد بۆ وتار خوێنەکان بۆ زیاد کردنی خۆشەویستی و برایەتی لەنێوان موسڵمانان و ڕاوێژکردن لە نێوانیان کە دەبێتە هۆی چاکتر کردنی بارودۆخی دین و دونیایان، ئەنجام نەدانی نزا و دوعای لەناوچوون بەسەر جولەکە و مەسیحی و کۆمەڵەکانی تر.

أحمد الكاتب

لەندەن ١٠ ذی الحجة ١٤٢٣ك/ ١١ شوباتی ٢٠٠٣

## سەرچاوەکان


** کتێبەکانی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب

١_ الاتوحيد.

٢_ الأصول الثلاثة.

٣_ كشف الشبهات.

٤_ رسالة في معنى لا اله الا الله.

٥_ رسالة في الرد على الرافضة.

٦_ الرسالة الثالثة في نواقض الاسلام.

٧_ تطهير الاعتقاد.

٨_ ١٢٨ مسألة من مسائل الجاهلية.

٩_ الرسالة المفيدة.

** کتێبەکانی تر:

١_ تأريخ نجد، الشيخ حسين بن غنام.

٢_ عنوان المجد في تأريخ النجد، عثمان بن عبدالله بن بشر، تحقيق عبد الرحمن بن عبد اللطيف آل الشيخ.

٣_ من أخبار الحجاز ونجد في تأريخ الجبرتي، محمد أديب غالب.

٤_ تأريخ الكويت، عبد العزيز الرشيد.

٥_ تأريخ آل السعود، جون فيليبي.

٦_ الجزيرة العرب في القرن العشرين، حافظ وهبة.

٧_ الوثائق البريطانية، المجلد ٢١٤٠ و المجلد .٢٤٧٩

٨_ معجزة فوق الرمال، أمين الريحاني.

٩_ الكويت و جاراتها، هارولد ديكسون.

١٠_ دعوة الامام محمد بن عبد الوهاب سلفية لا وهابية، الدكتور أحمد الحصين.

١١_ رسائل أئمة الدعوة الوهابية، فيصل بن مشعل آل السعود.

١٢_ الرسالة التدميرية، لابن تيمية.
١٢_ اقتضاء الصراط المستقيم، ابن تيمية.
١٣_ مجموع الفتاوى، ابن تيمية.
١٥_ الدرر السنية في الأجوبة النجدية، عبدالرحمن بن محمد بن قاسم.
١٦_ مجموع الرسائل و المسائل النجدية، عبدالله بن عبدالرحمن بو بطين.
١٧_ تأريخ المملكة العربية السعودية، عبدالله بن عثيمين.
١٨_ النظرية السياسية عند ابن تيمية، حسن كونا كاتا.
١٩_ دعاوى المناوئين لدعوة الشيخ محمد بن عبد الوهاب، عبد العزيز عبد الطيف، دار الوطن، الرياض .١٤١٢
٢٠_ مجموع فتاوى و مقالات ابن باز، الجزء السابع.
٢١_ القول المفيد، محمد بن صالح بن عثيمين.
٢٢_ فصل الخطاب في الرد على محمد بن عبد الوهاب، سليمان بن عبد الوهاب.
٢٣_ الدرر السنية في الرد على الوهابية، أحمد بن زيني دحلان.
٢٤_ الفتنة الوهابية، أحمد بن زيني دحلان.
٢٥_ صيانة الانسان عن وسوسة الشيخ دحلان، محمد بشير السهسواني الهندي.
٢٦_ مناج أهل الحق و الاتباع في مخالفة أهل الجهل و الابتداع، سليمان بن سمحمان.
٢٧_ لسراة الليل هتف الصباح، عبد العزيز التويجري.
٢٨_ النظام السياسي و الدستوري للمملكة العربية السعودية، أحمند عبد الله بن باز.
٢٩_ السعوديون و الحل الاسلامي، محمد بن جلال كشك.
٣٠_ الدولة السعودية الأولى، عبد الرحيم عبد الرحمن.
٣١_ قيام الدولة السعودية العربية، عبد الكريم الغرايبة.
٣٢_ شبه الجزيرة العربية، الزركلي.
٣٣_ الشورى لا الديموقراطية، عدنان علي الرضا النحوي، دار النحوي، الرياض، الطبعة الرابعة .١٩٩٢
٣٤_ الشورى في ظل نظام الحكم الاسلامي، عبد الرحمن عبد الخالق.

٣٥_ مشروعية الدخول الى المجالس التشريعية، عبد الرحمن عبد الخالق.
٣٦_ الحد الفاصل بين الايمان و الكفر، عبد الرحمن عبد الخالق.
٣٧_ فصول من السياسة الشرعية في الدعوة الى الله، عبد الرحمن عبد الخالق.
٣٨_ المسلمون و العمل السياسي، عبد الرحمن عبد الخالق.
٣٩_ الديموقراطية دين، ابو محمد عاصم المقدسي.
٤٠_ الكواشف الجلية في كفر الدولة السعودية، ابو البراء مرشد بن عبد الزيز بن سليمان النجدي.
٤١_ مذكرة النصيحة.
٤٢_ مشروعية محاسبة الحكام، محمد مسعري.
٤٣_ هويات متغيرة، مي يماني.
٤٤_ صراع الأجنحة في العائلة السعودية، فهد القطاني.
٤٥_ قيام العرش السعودي، ناصر الفرج.
٤٦_ العلماء و العرش، الدكتور أنور عبدالله.
٤٧_ الدين و الدولة في السعودية، أيمن الياسيني.
٤٨_ گۆڤارى: اقرأ، ژمارە: ٧٧٩.
٤٩_ ڕۆژنامەى: الشرق الأوسط، ژمارە: .٦١٤٦
٥٠_ گۆڤارى: الدعوة، بەروارى: ١٩/ ١٢/ .١٤١٥
٥١_ گۆڤارى: البحوث الاسلامية، ژمارە: يەك لە بەرگى دووەم.
كتێبەكانى شێخ موحەمەدى كوڕى عەبدولوەهاب:
http://www.khayma.com/kshf/R/Kshf-A.htm
http://www.e-kotob.com/books/adv_search_results.asp?auth_id=887
http://www.khayma.com/iman/kitabutawheed.html
http://www.najran.net/arabik/books/islamic/tawheed/
http://www.aaraa.jeeran.com/islamic/kotob/ageedah-dia_el-wah-hab.htm
http://www.geocities.com/only2books/islamic/ageedah-128-eahab.htm
http://www.geocities.com/only2books/bks_islamic.htm

http://www.assiraj.biziand.com/library/shahadah2.htm

کتێبی: الدرر السنية في الأجوبة النجدية

http://www.dorar.net/htmls/mbooks.asp

مجموع فتاوى الشيخ بن باز

http://www.ibnbaz.org.sa/last_resault.asp?hID=1317

ووتاری: ئوسامة بن لادن

http://www.khayma.com/rafidha/ematah.htm

کتێب و دانراوەکانی: ئەبو موحەمەد مەقدەسی

http://www.almagdese.com/

کتێبەکانی: عبدالرحمن عبدالخالق

http://www.salafi.net/list.html

کتێبەکانی شێخ حەسەن مالکی

http://www.almalky.net./graa_fi_al3gaid.htm

# ناوەڕۆک